

# گیانی ژیان

باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن

**نووسینی**
عەلی باپیر

**بڵاوكردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن

**نەخشەسازی ناوەوە**
نەوزاد شەهلاوانی

**خەت**
نەوزاد كۆیی

**بەرگ**
ترایزۆن

**قەبارەی كتێب**
١٧×٢٤- ( ٢٨٩ ) لاپەڕە

**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەكەم ١٤٣٦ ك - ٢٠١٥ ز

**تیراژ**
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی ( ٥٠١ ) ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پاڵاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿...وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفۡسِهِۦۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ١٨﴾

فاطر: ١٨

# پێشکەش بێ

به هەر مسوڵمانێك كه هەردەم وریای خۆیەتی و، بەردەوام لە هەوڵی زیاتر خۆ پاك و چاككردنی دایە، بەهۆی: بەپێی ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەڕێوەچوون و، تەنیا خوا پێ مەبەست بوون، لە هەموو نیازو مەبەست و، قسەو وتارو، كردەوەو ڕەفتارێكی دا.

# پێشەكی

إنَّ الحَمْدَلِلّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُه وَنَسْتَغْفِره، وَنَعوذُ بِاللهِ مِن شُرورِ أَنْفُسِنا، وَمِن سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلا مُضلَّ له وَمَن يُضلِل فَلا هادِيَ لَه، وَأَشهَدُ أَن لا إِلهَ إلاّ الله، وَحْدهُ لا شَريكَ لَه، وَأَشْهدُ أنَّ مُحمَّداً عَبْدهُ ورَسولُه.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾
آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾
النساء.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾
الأحزاب.

أَمَا بَعد: فَإِنّ أَصْدقَ الحديث كَلامُ الله وَخَيرَ الهَدْي هَديُ مُحمَّد صَلَّى اللَّه عَليهِ وَسلَم وَشَرّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلّ ضَلالةٍ فِي النّار.

## خوێنەری سەنگین و شیرین!

خوای كاربەجێ سبحانە و تعالی كە مرۆڤی لە ئەندازەیەك قوڕی خاك و، ڕووحێكی خوایی پاك دروست كردوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾ ص

واتە: یاد بكەوە كاتێك! پەروەردگارت بە فریشتەكانی فەرمووـ: من جەستەی بەشەرێك لە قوڕێ دروست دەكەم، ئنجا هەر كات جەستەكەیم ڕێك خست و لە ڕووحی تایبەت بەخۆم فووم بەبەردا كرد، بۆی بە كڕنووشدا بكەون.

بەڵێ خوای كاربەجێ كە مرۆڤی بەو جۆرە پێكهاتە هەڵخستوە، ویستی وا بووە كە توانای هەڵكشان و داكشان (عروج و هبوط)ی هەبێ و، وەك دروستكراوەكانی دیكە كە لە هەموو ڕوویەكەوە مەحكوومی غەریزەكانیان، یان یاسا فیزیكیی و بیۆلۆژییەكانن، هەمیشە بە یەك حاڵەت و لەیەك ئاست دا نەمێنێتەوە، بگرە توانای هەبێ هێندە هەڵكشێ و بەرز بێتەوە، بەهۆی پاكیی و چاكیی یەوە، بە پەیژەی ئیمان و تەقوادا، هەتا دەگاتە ئاستێك وەك ئادەمی بابی علیە السلام: شایستەی سەجدە بۆ بردنی فریشتان دەبێ:

﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ .. ﴿٥٠﴾ ﴾ الكهف.

هەروەها بە پێچەوانەشەوە: توانای هەبێ هێندە نزم بێتەوەو بە تەلانی گوناهو خراپەدا شۆڕبێتەوە، هەتا موستەهەقی ئەوە دەبێ خواو فریشتەكان و هەرچی نەفرین كەرە، نەفرینی لێبكەن:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٌ أُوْلَـٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١٦١﴾ ﴾ البقرة.

ئنجا بێگومان بابەتی: چۆنیەتی چاك خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن (الإحسان وتزكية النفس) هەتا بڵێی گرنگ و بایەخدارەو هەرگیز ناگونجێ قسەی كۆتایی لە بارەوە بكرێ، هەر بۆیەش بەندە، هەرچەندە لە مێژ ساڵە لەوبارەوە كتێبی (ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون)م نووسیوە، كە هەتا ئێستا پێنج جاران چاپ كراوەتەوەو، بۆ زمانەكانی عەرەبی و فارسییش وەرگێڕراوە، بەڵام ئەو بابەتە دێرینە هەمیشە تەڕو تازەیەو، حەوجێی بەباس و خواسی نوێ و گەرم هەیە، بۆیە ئەم بەرهەمەشمان لەو بارەوە خستە ڕوو.

دیارە ئەم بەرهەمەش كۆی سی (٣٠) ئاڵقەیە كە لەژێر ناوو نیشانی: (گیانی ژیان)دا لە مانگی ڕەمەزانی (١٤٣٥ك) لە كەناڵی ئاسمانیی پەیامەوە پێشكەش كران و، پاش نووسرانەوەو ڕێكخرانیان لەلایەن برایەكی دڵسۆزەوە[1]، پاشان چاو پێدا گێڕانەوەو سووكە دەستكارییەكی خۆم، بوون بەم كتێبە، كە هیوادارم كەلێنێكی باش لەو بوارە گرنگ و هەستیارەدا پڕ بكاتەوە، بە تایبەت لەم ڕۆژگارەدا كە ڕەوتی ماددیگەریی و ئارەزوو خوازیی، یەكجار زۆر پەرەی ستاندەوەو، كەسێك زۆر لەخۆی وریا نەبێ و لەڕووی ڕووحییەوە بەهێزو دامەزراو نەبێ، لافاوی دنیا پەرستیی و ئارەزوو خوازیی ڕایدەماڵێ و، سەرەنجام تووشی عەیبداریی دنیاو گوناهباریی دواڕۆژ دەبێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

٢١ رجب ١٤٣٦ك
١٠ مایس ٢٠١٥ز
هەولێر

(١) كە برای بەڕێزم كاك (قاسم سەلام)ە خوا پاداشتی بداتەوە، چونكە هەر خۆی ئەركی نووسینەوەو تایپ كردن و (تخريج)ی فەرموودەكانیشی كێشاوە.



# ڕێخـۆشـکـردن

## بـــەرێــزان !

ئەمە بابەتێکی گرنگە لەژێر ناوو نیشانی: گیانی ژیان (روح الحیاة) یان (باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن)، (الإحسان والتزكية)دا، وە ئەم باسەی یەکەممان وەك ڕێ خۆشکردنێك وایە بۆ سەرجەم باسەکانی دیکە.

سەرەتا دەڵێین: هەر لەو کاتەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیدایەتی خوای میهرەبانی پێگەیشت، دەستی کرد بە تێگەیاندن و پێگەیاندنی هاوەڵانی بەڕێزی خوا لێیان ڕازی بێ، بە پیاوان و ئافرەتان بەوردو درشتەوە، ئنجا دوای ئەوەی کە جیلی هاوەڵانی بەڕێز کۆتایی پێهات و، جیلی شوێنکەوتووان و، پاشان شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان، هاتن، وردە وردە زانایان دەستیان کرد بە دانانی چەند زانستێك لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، وەك: (زانیاریی تەفسیر، زانیاریی فەرموودەناسیی، زانیاریی (فقه)و زانیاریی (أصول الفقه)، وە زانیاریی (أصول الدين) کە دوایی (علم الكلام)یشی پێ گوترا، وە زانیاری مێژوو، هەروەها زانستەکانی زمانی عەرەبی، وەك: (نحو، صرف، بلاغة).... هتد).

ئنجا لە ڕیزی ئەو زانستانەدا زانستێکی دیکەشیان داهێنا، کە چەند جۆرە ناوێکیان لێناون: (علم التزكية) یان (علم الإحسان)، وە دواییش نازناوی (تصوف)ی وەرگرت، هەندێکیشیان ناویان نا: (علم السير والسلوك)، دیارە وشەی (تزكية) وشەیەکی قورئانییە، کە وەك دوایی باسی دەکەین، خوا سبحانه

و تعالى لە چوار ئایەت لە قورئاندا، ئەركەكانی پێغەمبەری خاتەمی (صلى الله عليه وسلم) بۆ چوار ئەرك دابەش كردوون، وەك دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴿١٦٤﴾﴾

آل عمران.

وشەی تەزكیە لێرە وەرگیراوەو یەكێك لەچوار ئەركە سەرەكییەكەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كە لەنێو خەڵكدا ئەنجامی داون، بریتیی بووە لە: تەزكیە كردنیان، وە وشەی (الإحسان)یش لە فەرماییشتەكەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەرگیراوە، كە لە (صحیح مسلم)دا هاتوە، كە جوبریل علیه السلام لەسەر شێوەی پیاوێكی نەناسراو -وەك دوایی فەرموودەكە دەهێنین- لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی ئیسلام و دەربارەی ئیمان و دوایی دەربارەی ئیحسان دەپرسێ؟ پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە پێناسەی ئیحساندا دەفەرموێ:

( أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ ).

واتە: ئیحسان ئەوەیە بەشێوەیەك خوا بپەرستی كە تۆ خوا دەبینی، یاخود پێت وابێ كە ئەو تۆ دەبینێ، ئەوە واتایەكی، واتایەكی دیكەی ئەو فەرماییشتە ئەوەیە كە: بەجۆرێك خوا بپەرستی كە تۆ خوا دەبینی، وە بێگومان ئەگەر تۆش خوا نەبینی، ئەو تۆ دەبینێ.

ئەو زانستە، واتە: ئەو زانستەی دەربارەی تەزكیەی نەفس، یاخود پایەی ئیحسان، یان (تصوف)، یان (السیر والسلوك) دەدوێ، تایبەتە بە دیوی پەنهان و شێرراوەی خواپەرستیی، چونكە خوا پەرستیی دوو دیوی هەن، دیوێكی ڕواڵەت و ئاشكرای هەیە، وەدیوێكی پەنهان و شێردراوەی هەیە، ئنجا ئیحسان باسی دیوی پەنهان و شێردراوەی خواپەرستیی دەكات، لەسۆنگەی ئەوەوە كە خوا پەرستیی بە پلەی یەكەم، پەیوەندیی بە ڕووحی ئینسانەوە هەیە، پەیوەندیی بەنێوەوە (باطن) و دیوی پەنهانی ئینسانەوە هەیە، پەیوەندیی بە دەروون و دڵی

ئینسانەوە هەیە، بەر لەوەی پەیوەندیی بە ڕواڵەت و قالب و دیوی بەرهەستییەوە هەبێ.

ئنجا ئێمە خوا پشتیوان بێ لەم زنجیرە باسەدا، باسی ئەو بابەتە گرنگە دەكەین، كە بەڕاستیی بابەتێكی زۆر گرنگەو لایەنێكی زۆر گرنگە، چونكە بەبێ دیوە پەنهانەكە، دیوە ڕواڵەتییەكەش قبووڵ نابێ، واتە: ئەگەر ئینسان زۆریش نوێژو ڕۆژوو بكات، زەكات و حەجیشی هەبێ، زۆریش پابەندیی بەشەریعەتەوە لەڕواڵەتدا هەبێ و كردەوە باشەكانی هەبن، بۆ وێنە: جەنگ و جیهادی هەبێ، ماڵ بەخشینی هەبێ، چاكەكاریی هەبێ و ...هتد، بەڵام ئەگەر لە دەروونیەوە بەخواوە پەیوەست نەبێ، وە ئەو كارانە بۆ خوا ئەنجام نەدا، وە ئیخلاصیان تێدا نەبێ، وە مەبەستی ئەوەنەبێ بەو كردەوانە لەخوا نزیك بێتەوەو، خوای پەروەردگار لەخۆی ڕازی بكات و، بەهەشتی خوا بۆخۆی دەستەبەرو مسۆگەر بكات، ئەوە ئەو كردەوە ڕواڵەتییانەی لێ وەرناگیرێن، بەڵێ، لەڕووی ڕواڵەت و بەحوكمی شەرع بەتەواو دادەنرێن، بەڵام بە حیسابی لای خوای پەروەردگار، ئەوانە خاوەنەكەیان دەبێتە سەپانی پووشێ و هیچی پێ نابڕێ، بۆچی؟!

چونكە ڕووحەكەیان تێدا نیە، (إبن عطاء الله السكندري) لەو بارەوە قسەیەكی زۆر جوانی هەیە دەڵێ: (الأَعْمال أَشْباحٌ، أَرواحُها وجودُ سِرِّ الإِخْلاصِ فيِها)، واتە: كردەوەكان وەك چەند تارماییەكن، چەند شتێكی ڕووكەش و ڕواڵەتیین، ڕووحەكەیان، بریتیە لە بوونی نهێنیی ئیخلاص و خوا پێ مەبەست بوون، تێیاندا، واتە: ئەگەر بەو كردەوانەت ڕازی بوونی خوات پێ مەبەست نەبوو، وە مەبەستت ئەوە نەبوو پێیان لەخوا نزیك ببیتەوە، مانای وایە هەر تارماییەك و ڕووكەشێك و كەلەشێكی بێ ڕووحن، بۆیە پێویستە ئێمەی مسوڵمان زۆرباش لەخۆمان ورد بینەوە، لەكارو كردەوەكانمان ورد بینەوەو، لەو لایەنە پەنهانە ورد بینەوە.

ئنجا وەك چۆن زانایانێك كە لەبارەی قورئانەوە قسەیان كردوە، عیلمێكیان داناوە بۆ ئەو مەبەستە: بەناوی (علم التفسير)، هەروەها ئەو زانایانەی لەبارەی

سوننەتی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) قسەیان كردوە، زانستێكیان داناوە بەناوی: (علم الحديث)، وە تۆ دەبێ بۆ تێگەیشتن لە فەرماییشتی خوا، وە بۆ تێگەیشتن لە سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بگەڕێیەوە بۆ زانایانی توێژەرەوە لە قورئان، وە زانایانی توێژەرەوە لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها هەڵهێنجانی بنچینە شەرعییەكان لە قورئان و سوننەت دا، دەبێ بگەڕێیەوە لای زانایانی (أصول الفقه)، وە بۆ زانینی حوكمە شەرعییەكان، دەبێ بگەڕێیەوە بۆ زانایانی (فقه)، وە بۆ تێگەیشتن لە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی و بۆ تێگەیشتن لە بنچینەكانی دین، دەبێ بگەڕێیەوە بۆ زانایانی (أصول الدين) كە (علماء الكلام)یشیان پێ گوتراوە، هەروەها بۆ شارەزایی لە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، دەبێ بگەڕێیەوە بۆ زانایانی مێژوو و (سيرة)، وە بۆ تێگەیشتن لە زمانی عەرەبی، دەبێ بگەڕێیەوە لای پسپۆڕان و زانایانی زمانی عەرەبی لە: (نحو، صرف، بلاغة)...هتد.

بەهەمان شێوەش بۆ تێگەیشتن لەو لایەنە پەنهان و شێرراوەی دینداریی، دەبێ بگەڕێیەوە بۆ لای ئەو زانایانەی كە لەو بارەوە پسپۆڕ بوون شارەزابوون و، وەك گوتم، پێیان گوتراوە: (علماء التزكية) یان (علماء التصوف) یان (علماء السير والسلوك).

وەلەو بارەوە كۆمەڵێك كتێب هەن، كۆمەڵێك زانا وەك پسپۆڕو شارەزا لەو بارەوە، هەندێ كتێبیان بۆ بەرهەم هێناوین، كە دەتوانم ئاماژە بە هەندێكیان بكەم، كە ڕەنگە گرنگترینیان بن، ئەگەرنا لەو بارەوەو كتێب و سەرچاوە زۆر زۆرن.

## هەندێ لە بەرهەمە گرنگەكانی زانایانی كۆن لە بواری تەزكیەدا:

١- (الرعاية)ي (المحاسبي).

٢- (إحياء علوم الدين)ي (أبو حامد الغزالي).

٣- (كیمیای سەعادت)ی (أبو حامد الغزالي) بەزمانی فارسی نووسیویەتی و زۆر دەشوبهێتە (إحياء علوم الدين).

٤- (قوت القلوب)ی (أبو طالب المكي) كە غەزالیی زۆر سوودی لەو كتێبەو كتێبی (الرعاية)ی موحاسیبی بینیوە، بۆ دانانی كتێبی (إحياء علوم الدين).

٥- (الرسالة)ی (قشيري).

٦- (عوارج المعاف)ی (سهروردي).

٧- (الفتح الرباني)و (فتوح الغيب)ی عەبدولقادری گەیلانیی.

٨- (الحكم العطائية)ی (إبن عطاءالله)ی سكەندەریی.

٩- (إيقاظ الهمم في شرح الحكم)ی (إبن عجيبة) كە شەرحی كتێبی (الحكم العطائية)ی كردوە.

١٠- (المباحث الأصلية)ی (إبن البنا السرقسطي).

١١- (الفتوحات الإلهية في شرح المباحث الأصلية)ی (إبن عجيبة).

١٢- (مثنوي)ی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمیی.

١٣- هەردوو بەرگی (١٠و١١)ی (مجموع الفتاوى)ی (إبن تيمية) هی یەكەمیان بە ناوونیشانی: (علم السلوك)ەو ئەوی دیكەشیان بەناوی: (التصوف)ە.

١٤- (مدارج السالكين)ی (إبن قيم الجوزي) كە (منازل السائرين)ی شێخی ئەنصاڕیی پێ شەرح كردوە.

١٥- (المكتوبات)ی ئیمامی ڕەببانیی واتە: سەید ئەحمەدی سەرهەندیی.

## لە زانایانی هاوچەرخیش ئەوەی کە من دەستم پێی گەیبێ:

١ و ٢ و ٣ - سێ کتێبی (سعيد حوّى)ن، بەناوەکانی: (تربيتنا الروحية) و (المستخلص في تزكية الأنفس) و (مذكرات في منازل الصديقين و الربانيين من خلال النصوص وحكم إبن عطاء السكندری).

٤- (رسائل النور)ی مامۆستا سەعیدی نوڕسیی کە (١٣٠) نامیلکەیەو زۆر جەخت دەخاتە سەر دیوی پەنهان و شێرراوەی ئینسان و تەزکیەی نەفس.

دیارە منیش کتێبی: (ڕێگای صالَح بوون و بەرەو خوا چوون)م هەیە لەو بوارەدا تەرجەمەش کراوەتە سەر زمانی عەرەبی بەناوو نیشانی: (طريق الصلاح والسير إلى الله)، هەروەها تەرجەمەی فارسیش کراوە.

## ڕوون کردنەوەی سێ مەسەلەی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئەو کتێبانەی کە ئاماژەم پێدان، بێگومان چەند نموونەیەکن، لە دەریای فراوانی بواری: تەزکیەو ئیحسان و تەصەووف و، زانایان و شارەزایان زۆر قسەیان لەو بارەوە کردوە، وە ئەوانە تەنیا چەند مستێکن لە خەرمانێك، بەڵام ئەو کتێبانە بۆیە ناوم هێنان، چونکە زۆربەیانم خوێندۆتەوەو موتاڵام کردوون، وە کەمترین تێبینیم لەسەریان هەیە، ئەگەرنا لەو بارەوە کتێبی دیکە زۆرن، چ بەعەرەبیی، چ بەفارسیی، چ بەتورکیی، چ بەزمانەکانی دیکە، بۆ وێنە: (الفتوحات المكية)و (فصوص الحكم)ی (إبن عربي) کە من تێبینی زۆرم لەسەر ئەو دوو کتێبە هەیە، هەرچەندە زۆر لە شارەزایانی بواری تەصەووف (إبن عربي) بە شێخی گەورەتر (الشيخ الأكبر) ناو دەبەن، بەڵام بێگومان ئەو دوو کتێبەی ناوبراو، کە سەرچاوەی زۆر ناودارن لەبواری تەصەووفی فەلسەفەیی دا، هەندێ شتیان تێدایە، بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ قورئان و سوننەت دا

ناگونجێ، وە من پێم وایە ئەو شتانە تەئویل كردنیشیان زۆر زەحمەتە، جا ئێمە لەخۆوە حوكم بەسەر كەسدا نادەین، بەڵام حوكم بەسەر قسەكاندا دەدەین، كە شتی وایان تێدایە لەگەڵ قورئان و سوننەت و خوا بەیەكگرتن (التوحید)دا دژ دەوەستێ، دەشگونجێ ئەو شتانە خزێنرابنە نێو كتێبەكانی ئیبنو عەرەبییەوە، وە دەشگونجێ قسەی خۆی بن و لە حاڵەتێكی نائاساییدا كردبنی، بە هەرحاڵ ئەگەر قسەكانی لەسەر حیساب بكەین، حوكمەكەی زۆر قورس دەبێ، كە من لێرەدا نامەوێ بچمە نێو ئەو وردەكارییانەوە.

**مەسەلەی دووەم:** هیچ زانا و پێشەوایەكی موعتەبەری ئەهلی ئیسلام، لە حاڵەتی تەزكیەی نەفس و ئەو حاڵەتە ڕووحانییەی كە ئەو زانستە قسەی لێدەكات، خاڵیی نەبووە، بێگومان هەموو زانایان پشك و بەشیان لەوەدا هەبووە، بەڵام هەندێ لە زانایان لەو بوارەدا پسپۆڕ بوون و زیاتر ڕۆچوون و زیاتر قووڵ بوونەتەوە، كە من ئاماژەم بەبەرهەمی هەندێ لەو زانایانە كرد.

دەمەوێ ئاماژە بەوەش بكەم كە بابەتی تەزكیەی نەفس تەنیا ئەوەندە نیە كەلەو سەرچاوانەدایە كە تایبەتن بەو بوارەوە، بەڵكو لە تەفسیرەكانداو لەو كتێبانەدا كە شەرحی فەرموودەكانی پێغەمبەری خوایان (صلى الله علیه وسلم) كردوە، وەك: (فتح الباري) شەرحی صەحیحی بوخاریی كە هی (إبن حجر العسقلاني)یە، وەشەرحی صەحیحی موسلیم كە هی (النووي)ە، هەروەها كتێبەكانی دیكە كە شەرحی (سنن)یان كردوە، بەڵكو هەندێ جار لەو كتێبانەدا كە لەبارەی (فیقه)وە هەن، وەك: (مجموع فتاوى)ی (إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوا لە هەموو زانایان بێ، وە ئەو كتێبانەش كە باسی عەقیدەو ئیمان و خوا بەیەكگرتن دەكەن، لەو كتێبانەشدا زانایان كەم و زۆر چوونەتە نێو باسی تەزكیەی نەفسەوە.

**مەسەلەی سێیەم:** هەڵەی زۆرێك لە پەیڕەوانی ئەهلی تەصەووف بەتایبەت لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، ئەوەبووە كە بواری تەزكیەی نەفسیان، وەك ڕێبازێكی سەربەخۆ، یان وەك جۆرە ئیسلامێكی سەربەخۆ ناساندوە، وە خۆشیان وەك كۆمەڵێكی جیاواز داناوە واتە: جیاواز لەكۆمەڵی مسوڵمانان بەگشتی،

لەحاڵێكدا كە تەزكیەی نەفس و تەصەووف لایەنێكی ئیسلامەتییە، وە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، هەموو مسوڵمانان دەبێ بەشیان هەبێ لە تەزكیەی نەفس دا، وە بەشیان هەبێ لەو دیوە پەنهان و شێرراوەیەی خوا پەرستییدا، ئەگەرنا وەك گوتم: دەبێتە سەپانی پووشێ، وە تەنیا بە كردەوە ڕواڵەتییەكان هیچی پێ نابڕێ، وەئەوەش ڕاست وەك سەلەفیی بوون وایە، (سەلەفیی بوون، بەو مانایە كە دەبێ بەدوای پێشینی چاك بكەوین، كە پێشەوای پێشینی چاك، پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیە وسلم) پاشان هاوەڵە بەڕێزەكاننی و لە نێویاندا چوار خەلیفە بەڕێزەكان خوا لێیان ڕازی بێ، وە دوایی ئەوانەی وەك وان، بەدوای پێشینی چاك كەوتوون و پابەند بوون بە ڕێبازیانەوە، لە شێوەی تێگەیشتن و دینداریيدا) وەك چۆن سەلەفیی بوون وەك نێوەڕۆك و بەمانای شوێنكەوتنی پێشینی چاك، نەك بە ناو لەخۆنان، خاڵی هاوبەشی هەموو مسوڵمانانە، بەهەمان شێوە پشك هەبوون لە تەزكیەی نەفسیشدا خاڵی هاوبەشی سەرجەم مسوڵمانانە، بەڵام ئەگەر كۆمەڵێك ئەو ناوە لەخۆیان بنێن، وە خۆیان بە كۆمەڵێكی جیاواز لە مسوڵمانان دابنێن، ئەوە هەڵەیە، چونكە بەناو لەخۆنان (سەلەفیی) ئەگەر نێوەڕۆكت نەبێ، هیچت پێ نابڕێ، هەروەك بەناو لەخۆنەنانیش، ئەگەر نێوەڕۆكت هەبێ، هیچ زیانت پێ ناگا، بابەتی تەزكیەی نەفس و تەصەووفیش، بەهەمان شێوە هەموو مسوڵمانێك دەبێ هەوڵبدا نەفسی موزەككا بێ، وە خاوەنی ئەو حەقیقەتانە بێ، كە كردەوەكان بەڵگەو شاهێد، یان نیشانەن بۆیان.



# ٢ ئیسلام وێڕای لایەنی ڕواڵەت و ئاشکرا، لایەنی دەروونیی و پەنهانیشی هەیە

ئێمە لە باسی پێشووشدا ئاماژەمان پێدا کە دینداریی و مسوڵمانەتیی، وێڕای ئەو کردەوە ڕواڵەتیی و بەرچاوانەی کە دەبینرێن، دیوێکی پەنهان و شێرراوەشی هەیە، وە ئەو کردەوە ڕواڵەتیی و بەرچاوانە، دیوێکی پەنهانیان هەیە، کە بەبێ ئەو دیوە پەنهان و شێرراوانە، خاوەنەکانیان نەك هەر لێیان بەهرەمەند نابێ، بەڵکو لەسەریشیان قەرزدار دەبێتەوە! ئنجا ئایا بەڵگەمان بۆ ئەوە چییە کە مسوڵمانەتیی و دینداریی دیوی پەنهانیشی هەیە؟! دەتوانین لەو بارەوە زۆر بەڵگان بهێنینەوە، بۆ نموونە:

## بەڵگەی یەکەم:

خوای پەروەردگار دەربارەی عەرەبە خێڵەکییەکان، کە بەڕواڵەت مسوڵمان بووبوون، بەڵام بەشیان لە ئیمان و دیوی پەنهان و شێرراوەی دینداریيدا نەبوو، فەرموویەتی:

﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَٰلِكُمْ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾﴾ الحجرات.

واتە: عەرەبە خێڵەکییەکان گوتیان: ئیمانمان هێنا، بڵێ: ئیمانتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن: مسوڵمان بووین (و بە ڕواڵەت ملکەچین)، وە جارێ ئیمان نەچۆتە نێو

دڵ و دەروونتانەوە، بەڵام ئەگەر فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەكەی بكەن، ئەوە هیچ كام لە كردەوەكانتان لێ بەزایە نادات (و پاداشتی هیچ كام لە كردەوەكانتان لێ كەم ناكاتەوە)، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەییە، بەدڵنیایی بڕواداران تەنها ئەو كەسانەن كە بڕوایان بەخواو بەپێغەمبەرەكەی هێناوە، وەهیچ دوودڵییەكیان نیە، وە لەپێناوی خواو لەڕێی خوادا بەسامان و گیانیان تێدەكۆشن، ئا ئەوانە ڕاست دەكەن.

لێرەدا دەبینین خوا سبحانە و تعالی كۆمەڵێك لەو عەرەبە خێڵەكیی و دەشتەكییانەی كە بەڕواڵەت دەهاتنە نێو ئیسلامەوە، بەڵام پشك و بەشیان نەبوو لە ئیمان و لەدیوی پەنهان و شێرراوەی دینداریيدا، زۆر بە ڕاشكاویی دەعوای ئیمانیان لێ هەڵ دەوەشێنێتەوە، دەفەرموێ: بڵێن تەنها بەڕواڵەت ملكەچ بووین و هاتووینەتە نێو ئیسلامەوە، بەڵام جارێ ئیمان نەچۆتە نێو دڵتانەوە، دوایی باسی ئیماندارانی ڕاستەقینە دەكات، كە ئەوانەن ئیمانیان بەخواو پێغەمبەرەكەی هێناوە، وەهیچ دوودڵیی و گومانێكیان نیە، وە بەسەرو ماڵیشیان لەپێناوی خوادا تێدەكۆشن، ئا ئەوانە ڕاست دەكەن، كە دەڵێن: ئیمانمان هێناوە.

## بەڵگەی دووەم:

خوا سبحانە و تعالی لەسەرەتای سووڕەتی (المؤمنون)دا پێناسەی ئیمانداران دەكات، دەفەرموێ:

﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: بێگومان ئیمانداران سەرفرازن، ئەوانەی كە لەنوێژەكانیاندا ملكەچن، (خشوع) بریتیە لە ملكەچ بوونی دڵی ئینسان، هەروەك (خضوع) بریتیە لە ملكەچ بوونی ڕواڵەتی ئینسان، (خضع): واتە: جەستەی ئەو ئینسانە ڕواڵەت و قالبی ئەو ئینسانە ملكەچیی پێوە بینرا، لەبەرانبەر خوادا، بەڵام (خشع): واتە دڵی ئەو ئینسانە، پەنهانی ئەو ئینسانە لەبەرانبەر خوادا، ملكەچە، وەك دەبینین خوا سبحانە و تعالی باسی نوێژ دەكات، دوایی باسی (خشوع) لەنوێژدا دەكات،

وە دەفەرمویٚ: ئەو ئیماندارانە سەرفرازن کە لەنویٚژەکانیاندا خشووعیان هەیە، کەواتە: دەگونجیٚ نویٚژ هەبیٚ، کە خواپەرستییەکی ڕواڵەتییە، بەڵام خشووعی تیٚدا نەبیٚ، کە ڕووحەکەیەتی.

## بەڵگەی سێیەم:

خوا سبحانه و تعالی باسی (إبراهیم)مان علیه السلام بۆ دەکات:

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ۖ ﴿٢٦٠﴾ ﴾ البقرة.

واتە: یاد بکەوە کاتێك ئیبراهیم گوتی: ئەی پەروەردگارم! پیٚشانم بدە چۆن مردووان زیندوو دەکەیەوە؟ خوا فەرمووی: ئایا ئیمانت نەهیٚناوە؟ گوتی: با، بەڵام دەمەویٚ دڵم ئارام بگریٚ.

کەواتە: ئیمان هەیە و دڵ ئارامگرتنیش لە ئیماندا هەیە، ئیبراهیم ئیمانی هەبوو، بەڵام ویستی دڵ ئارامییشی بۆ پەیدا بیٚ، وەك زانایان دەڵێن: (علم الیقین)ی هەبوو، بەڵام ویستی (عین الیقین)یشی بۆ پەیدا بیٚ، ئەوەش پلەیەکی دیکەیە لە پلەکانی ئیمان.

## بەڵگەی چوارەم:

خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ:

﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَـٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ ﴿٣٧﴾ ﴾ الحج.

واتە: ئەو (قوربانیی)انەی سەریان دەبڕن، نە گۆشتەکەیان و نەخویٚنەکەیان ناگاتە خوا، بەڵکو ئەوەی دەگاتە خوا، تەقوای ئیٚوەیە، کەواتە: تەقوا ئەو دیوە پەنهان و شیٚردراوەیە لە قوربانیی سەربڕییندا، کە لەلای خوای پەروەردگار جیٚی ئیعتیبارە، ئەمما خویٚن و گۆشتەکە، ئەگەر ئەو تەقوایەی تیٚدا نەبیٚ و، خوا پیٚ

مەبەست بوونی تێدا نەبێ، خوێن و گۆشتی ئاژەڵ و وە گۆشت بەخشینەوەی ئاژەڵ بەسەر هەژاراندا، هیچ سوودێك بە خاوەنەكەی ناگەیەنێ، ئەوە ناگاتە خوا، ئەوەی دەگاتە خوا، ئەو پاڵنەرو هاندەرەیە كە تۆ وا لێدەكات ئەو ئاژەڵە سەرببڕی، وە وات لێدەكات هەر كردەوەیەكی باشی دیكە ئەنجام بدەی، كە ئەوە پێی دەگوترێ تەقوا.

هەروەها بەبارە سەلبییەكەشیدا هەروایە، وەك چۆن دینداریی ڕاست و ساغ دەبێ كردەوەكان -واتە: كردەوە ڕواڵەت و بەرچاوەكان- دیوێكی پەنهان و ڕووحێكیان تێدابێ، ئەوجار لەلای خوای پەروەردگار جێی ئیعتیبارن، بەنیسبەت گوناهەكانیشەوە، گوناهی ئاشكرا هەیەو گوناهی پەنهانیش هەیە، وەك چۆن گوێڕایەڵیی پەنهان و ئاشكرا هەیە، وەك خوای زاناو توانا لەسووڕەتی (الأنعام) دا دەفەرموێ:

﴿وَذَرُواْ ظَاهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ﴿١٢٠﴾﴾ الأنعام.

واتە: دەست هەڵبگرن لە گوناهە ڕواڵەتییەكان و گوناهە پەنهانەكان، بۆ نموونە: هەركام لە (كینە، ڕق، خۆ بەزلگریی، حەسەد) گوناهی پەنهانن، وەك چۆن: (غەیبەت و بوختان و قسەهێنان و بردن و، ڕێز شكاندن و، قەتڵ و، زینا) گوناهی ئاشكران، كەواتە: دیسان بەباری خۆپاراستن لە گوناهیشدا، دەبێ هەم خۆت لەگوناهە دیارو ئاشكراكان بپارێزی، هەم خۆت لە گوناهە ون و پەنهان و شێرراوەكانیش بپارێزی.

## بەڵگەی پێنجەم:

بەڵگەی پێنجەممان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە، كە عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، لێی دەگێڕێتەوە، كە من پێشێ دەقی فەرموودەكە دەهێنم، لەبەر ئەوەی وشەی (إحسان) كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەك ناوونیشانی دینداریی پەنهان هێناویەتی، لەم فەرمایشتەدا پێناسە كراوە:

( عن عُمَرَ ابْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ذَاتَ يَوْمٍ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ وَلاَ يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ، حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم، فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلاَمِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم: (الإِسْلاَمُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ وَتَصُومَ رَمَضَانَ وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً) قَالَ: صَدَقْتَ، قَالَ: فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ؟ قَالَ: (أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ). قَالَ: صَدَقْتَ، قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ؟ قَالَ: (أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ). قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ؟ قَالَ:(مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ)، قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَتِهَا؟ قَالَ: (أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ). قَالَ: ثُمَّ انْطَلَقَ فَلَبِثْتُ مَلِيًّا ثُمَّ قَالَ لِي: (يَا عُمَرُ أَتَدْرِي مَنِ السَّائِلُ؟). قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ:(فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ) ). رواه مسلم برقم (١).

عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕۆژێكیان كاتێك ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دانیشتبووین، پیاوێكمان لێ وەژوور كەوت، بەرگێكی زۆر سپی لەبەردا بوو، مووەكانی زۆر ڕەش بوون، شوێنەواری سەفەرو ڕێ و بان بڕینی پێوە دیار نەبوو، هیچ كام لە ئێمە نەماندەناسی، هەتا هات دانیشت ئەژنۆی بە ئەژنۆی پێغەمبەرەوە نووساند، وە دوو دەستەكانی خۆی خستنە سەر ئەژنۆكانی خۆی، (واتە: زۆر بە ئەدەبەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) دانیشت)، وە گوتی: ئەی مەحەممەد! هەواڵم پێبدە دەربارەی ئیسلام؟ پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئیسلام: بریتییە لەوە كە شایەتمان بێنی: كە جگە لەخوا هیچ پەرستراوێكی دیكە نیەو، موحەممەد ڕەوانەكراوی خوایە، وە

نوێژ بەرپا بکەی و، زەکات بدەی و، ڕۆژووی ڕەمەزان بگری، وە ئەگەر توانیت حەجی ماڵی خوا بکەی)، گوتی: ڕاست دەکەی، ئێمەش پێمان سەیر بوو پرسیاریشی لێ دەکردو دواییش دەیگوت: ڕاست دەکەی، دوایی گوتی: هەواڵم پێبدە دەربارەی ئیمان؟ ئەویش فەرمووی: ئەوەیە کە: { ئیمان بێنی بەخواو، بەفریشتەکانی و، بەپێغەمبەرانی و بە کتێبەکانی و، بە ڕۆژی دوایی، وە ئیمان بەقەدەر بێنی کە خۆش و ناخۆشی (یان چاك و خراپی) لە خواوەیە}، گوتی: ڕاست دەکەی، دوایی گوتی: هەواڵم پێبدە دەربارەی ئیحسان؟ فەرمووی: {ئیحسان: ئەوەیە کە بەجۆرێك خوا بپەرستی کە دەیبینی، یاخود ئەو تۆ دەبینێ وە ئەگەر تۆش ئەو نەبینی، ئەو تۆ دەبینێ، بێگومان} دوایی گوتی: هەواڵم پێبدە دەربارەی هاتنی کاتی تێکچوونی دنیاو ئەو کاتەی کە دنیای تێدا بەکۆتا دێ، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) فەرموی: (پرسیار لێکراو لە پرسیارکەر پێی زاناتر نیە)، گوتی: دەباشە هەواڵم پێبدە دەربارەی نیشانەکانی؟ فەرمووی: ئەوەیە کە: (کەنیزەك گەورەی خۆی، ببێ، (واتە: ئافرەت کەنیزەك بێ، دوایی کچێکی ببێ کچەکە ببێتە گەورەی ئەو)، وە ئەوەیە کە خەڵکی پێخواس و ڕووت و نەدارو حوشتر لەوەڕێن، ببینی کە پێشبڕکە دەکەن لە بەرز کردنەوەی کۆشکەکانیاندا) عومەر خوا لێی ڕازیبێ دەڵێ: ماوەیەك مامەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەی عومەر! دەزانی ئەو پرسیارکەرە کێ بوو؟)، گوتم: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: (ئەوە جیبریل بوو هاتبوو دینەکەتان تێبگەیەنێ).

لێرەدا دەبینین کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وێڕای ئیسلام و ئیمان، باسی ئیحسانیش دەکا، بەڵام کە پێناسەی ئیحسانمان بۆ دەکات، شتێکی زیاتر لە ئیسلام و ئیمان {واتە: لە پێنج پایەکانی ئیسلام و شەش پایەکانی ئیمان}، ناخاتە ڕوو، بەڵکو جۆرو چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ پایەکانی ئیسلام و ئیماندا دەخاتە ڕوو، کە ئەویش بریتیە لەوە: بەجۆرێك بەندایەتیی بۆ خوای پەروەردگار بکەی، کە دەیبینی، بەچاوی عەقڵ و دڵ دەیبینی، یان بەلای کەمەوە پێت وابێ کە ئەو تۆ دەبینێ، کەواتە: ئیسلامەتیی و مسوڵمانەتیی و

دینداریی، وێڕای لایەنی ڕواڵەت و ئاشكرای -كە لە پێنج پایەكانی ئیسلام و شەش پایەكانی ئیمان دا بەرجەستە دەبێ- بەهەمان شێوە دیوی پەنهان و نەبینراویشی هەیە.

## بەڵگەی شەشەم:

دەتوانین ئەوەش بەبەڵگە بهێنینەوە كە زانایان زاراوەی (علم الظاهر) وە (علم الباطن)یان بەكار هێناوە، یان (علم الفقه) وە (علم التقوى)، (علم الظاهر) واتە: ئەوەی كەباسی ڕواڵەتی دینداریی دەكات، وە (علم الباطن)یش ئەوەیە كە باسی دیوی پەنهانی دینداریی دەكات، هەڵبەتە (علم الباطن)ێك كە لەقوڕئان و سوننەت هەڵدەهێنجرێ، نەك ئەوەی (باطینیەكان (الباطنية) گوتوویانە، وە (علم الفقه) ئەوەیە كە باسی یاسا دیارو ئاشكراكانی دینداریی دەكات، هەروەك (علم التقوى)ش باسی دیوی پەنهان و شێرراوەی پابەندیی بە شەریعەتەوە دەكات.

## بەڵگەی حەوتەم:

كەسێك كە ڕیاباز بێ واتە: حەج دەكات، نوێژ دەكات، ڕۆژوو دەگرێ، كردەوەی باشی هەبێ، بەڵام مادام ئیخلاصی نەبێ، هیچی بۆ حیساب نیە، كەواتە: ئیخلاص دیوی پەنهان و شێرراوەی ئەو كردەوانەیەو دەبێ هەبێ، ئەگەرنا بابای نوێژكەرو ڕۆژووگر، بەهرەمەند نابێ لە تاعەت و عیبادەتەكەی.

## بەڵگەی هەشتەم:

هەندێ لەزانایانی تەزكیە دەڵێن: ڕۆژوو گرتن سێ جۆرە: ڕۆژووی عەوام، ڕۆژووی خەواص، ڕۆژووی خەواصی خەواص، ڕۆژووی عەوام ئەوەیە كە مرۆڤەكان تەنیا دەم و داوێنیان بەڕۆژوویە، ڕۆژووی تایبەتان (خواص) ئەوەیە كە وێڕای گەدەو داوێن، ئەندامە ڕواڵەتییەكانیشیان بەڕۆژوویە، زمانیان،

چاویان، گوێیان، بەڕۆژوویە واتە: گوناهان ناكەن، ڕۆژووی تایبەتانی تایبەت (خواص الخواص) ئەوەیە كە ئەندامە پەنهانەكانیشیان بەڕۆژوویە، واتە: بەدڵ و بەغایەلەش، هەوڵ دەدەن كە غایەلەو شتی خراپ بەسەر دڵ و دەروونیان دانەیەت.

ئەوانە چەند بەڵگەیەك بوون لەسەر ئەوە كە: ئیسلام و مسوڵمانەتیی، وێڕای دیوی ڕواڵەت و بەرچاو، دیوی پەنهان و شێرراوەشی هەیە، دیارە وەك لە باسی یەكەمی ئەو زنجیرە باسەشدا گوتمان: ئێمە خوا پشتیوان بێ لە درێژەی ئەو زنجیرە باسەدا دەمانەوێ باسی ئەو دیوە پەنهان و شێرراوەی مسوڵمانەتیی و دیندارییە بكەین، كە زانایان وشەكانی: (تزكیە النفس)[١] یان (السیر والسلوك)[٢] یان (تصوف)[٣]یان كردۆتە ناوو نیشانی.



.............................................

(١) واتە: خۆ پاك و چاك كردن.

(٢) واتە: بەرەو خوا چوون و ئاكار جوان بوون.

(٣) واتە: خۆ ساف و ساغ كردنەوە.




# پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك

## خوێنەرانی خۆشەویست !

ئێمە لە زنجیرە باسی چاك خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن، گەیشتینە باسی سێیەم، ناوو نیشانی ئەم باسەمان بریتیە لە: (پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك)، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا: شارەزایان و پسپۆڕانی بواری تەزكیەی نەفس و، مەقامی ئیحسان و، تەصەووف، چەند وشەو زاراوەیەكیان بەكار هێناون بۆ ئەو بابەتە، كە لەم باسەدا تیشكیان دەخەینە سەر:

### ١) تەزكیە (التزكية):

وشەی تەزكیە وشەیەكی قورئانییەو لە چەندان ئایەت لە قورئان دا هاتوە، وە وەك پێشتریش باسم كرد: لەچوار ئایەتدا، لە ئایەتی (١٢٩)و (١٥١)ی (البقرة)، وە لە ئایەتی (١٦٤)ی (آل عمران) وە لە ئایەتی (٢)ی (الجمعة) دا، خوای كاربەجێ وشەی (تزكية)ی بەكار هێناوە، وەك یەكێك لەچوار ئەركە سەرەكییەكەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

## ئنجا ئایا وشەی تەزكیە یانی چی؟

لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (زكا الشَّيءُ يَزكو زَكاءً وَزَكاةً، نَما وَزادَ، وَزَكا فُلانٌ صَلَحَ، وَزَكّى الشَّيءَ أَزْكاهُ: أَصْلَحَهُ وَطَهَّرَهُ، وَزَكّى نَفْسَه: مَدَحها)[١]، واتە: (زكا الشيَّءُ يَزكو زَكاءً وَزَكاةً) یانی: (نَما وَزادَ) گەشەی كردو زیادی كرد، هەروەها (زَكا فُلانٌ) یانی: فلانكەس چاك بوو، (وَزَكّى الشَّيءَ أَزْكاهُ) یانی شتەكەی چاك كردو پاكی كرد، وە دەگوترێ: (زَكّى نَفْسَه) واتە: ستایشی خۆی كرد، كەواتە: وشەی تەزكیە سێ واتای هەن: ١-(گەشەكردن و زیاد بوون). ٢-(پاك بوون). ٣-(چاك بوون)، واتە: تەزكیە كردنی خۆت یانی: تۆ ڕووحی خۆت پەروەردە بكەی و لەڕووی تەقواوە گەشەی پێ بدەی، وەلە گوناهكارییی (فجور)و لەو خەسڵەتە خراپانەی كە تێیدان، پاكی بكەیەوەو بژاری بكەی، وە سەرەنجام چاكی بكەی، واتە: پاكی بكەی و، چاكی بكەی و، گەشەی پێ بدەی.

## ٢) ئیحسان (الإحسان):

دەڵێ: (أَحْسَنْتَ: فَعَلْتَ الحَسَنَ، كَما قِيل: أَجادَ، أَيْ فَعَلَ الجَيِّدَ وَأَحْسَنْتُ الشَّيءَ: عَرَفتُه وَأَتْقَنته)[٢]، واتە: (أَحْسَنْتَ) یانی: شتێكی باشت كرد، وەك چۆن دەڵێ: (أجاد) یانی: كردەوەیەكی باشت ئەنجامدا، وە (أَحْسَنْتُ الشَّيءَ) یانی: ئەو شتەم ناسی، یاخود بە شێوەیەكی باش لێی شارەزا بووم، یاخود بەشێوەیەكی باش ئەنجامم دا. (الجرجاني) دەڵێ: (الإحسانُ لغةً: فِعلُ ما يَنبَغي أن يُفْعَلَ منَ الخَيْر)[٣] واتە: ئیحسان بریتیە لەوە كە كردەوەیەكی باش كە پێویستە ئەنجام بدرێ، ئەنجام بدرێ.

(١) المعجم الوسيط ٣٩٦، المصباح المنير، للفيومي ١٠٣.

(٢) المصباح المنير، ص٧٤.

(٣) التعريفات، ص٢٠.

ئنجا (الجرجاني) دوایی لەڕووی زاراوەییەوە پێناسەی ئیحسان دەكات و دەڵێ: (الإحسان: هو تَحَقُّقٌ في العبوديةِ على مَشاهِدِ حضرةِ الربوبيَّةِ بنور البَصيرة)[١]، ئیحسان: بریتییە لە لەخۆدا هێنانەدی بەندایەتیی بۆ خوا، بەشێوەیەك كەتۆ پەروەردگار دەبینی بەنووری بەصیرەت و دڵ، واتە: بەشێوەیەك بەندایەتیی بۆ پەروەردگار بكەی كە تۆ چاوت لە پەروەردگارە، بەڵام چاوی بەصیرەت و پەنهان.

دیارە پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) هەر ئاوا پێناسەی ئیحسانی كردوە، وەك دەفەرموێ:

(أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ) رواه مسلم

١، كە پێشتر فەرموودەكەمان بە تەواویی هێنا.

## ٣) تەصەووف (التصوف):

(التَصَوُّفُ طَرِيقَةٌ سُلُوكيةٌ قِوامُها التَّقَشُّفُ والتَّحلِّي بِالفَضائِلِ لِتَزكُو النَّفْسَ وتَسمُوّ الرُّوح، والصُّوفِيُّ: مَن يَتَّبِع طَرِيقَةَ التَّصوفِ، والعارِفُ بالتّصوفِ، وَأَشْهَرُ الآراءِ فِي تَسمِيَتِهِ، أَنَّهُ سُمِّيَ بِذلِكَ لأَنَّهُ يُفَضِّلُ لَبْسَ الصُّوفِ تَقَشُّفاً)[٢]، تەصەووف: بریتیە لەڕێبازێكی ڕەوشت و ئاكاریی، كە بنچینەكەی (بەپێی قسەی ئەو)، بریتیە لە دنیا بەكەم گرتن و، سەختگیریی لەژیان و گوزەراندا، وە خۆڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزەكان، تاكو نەفس پاك بێ، وە ڕووح بەرز بێتەوە، وەصۆفیی بەكەسێك دەگوترێ، كە بەدوای ڕێبازی تەصەووف دەكەوێ، وە شارەزایە لەو بوارەدا، وە ناوبانگترین بۆچوونیش لەبارەی هۆكاری ناونرانی ئەو بوارەی تەزكیەوە، بە تەصەووف، ئەوەیە كە ڕێبوارانی ئەو ڕێیە وایان بەباشتر زانیوە: بەرگی خوری (صوف) لەبەر بكەن، لەبەر ئەوەی خاكیی بوون و كەم مەسرەفیی زیاتری تێدایە.

.......................................

(١) التعريفات، هەمان لاپەڕە.

(٢) المعجم الوسيط ص٥٢٩.

(إبن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەبارەی ئەوەوە کە ئایا وشەی (تصوف) یان (صوفية) لەچییەوە هاتوە؟ لە (مجموع فتاوى)کەی خۆیدا دەڵێ:

(أَمَّا لَفْظُ الصُّوفِيَّةِ فَإِنَّهُ لَمْ يَكُنْ مَشْهُورًا فِي الْقُرُونِ الثَّلَاثَةِ، وَإِنَّمَا اُشْتُهِرَ التَّكَلُّمُ بِهِ بَعْدَ ذَلِكَ، فَقِيلَ: إنَّهُ نِسْبَةٌ إلَى أَهْلِ الصُّفَّةِ وَهُوَ غَلَطٌ، لِأَنَّهُ لَوْ كَانَ كَذَلِكَ لَقِيلَ: صُفِّي، وَقِيلَ نِسْبَةٌ إلَى الصَّفِّ الْمُقَدَّمِ بَيْنَ يَدَيْ اللَّهِ، وَهُوَ أَيْضًا غَلَطٌ، فَإِنَّهُ لَوْ كَانَ كَذَلِكَ لَقِيلَ: صَفِّي، وَقِيلَ نِسْبَةٌ إلَى الصَّفْوَةِ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ، وَهُوَ غَلَطٌ لِأَنَّهُ لَوْ كَانَ كَذَلِكَ لَقِيلَ: صَفَوِي، وَقِيلَ: وَهُوَ الْمَعْرُوفُ إنَّهُ نِسْبَةٌ إلَى لُبْسِ الصُّوفِ)[1].

واتە: وشەی (صوفية) لە سێ سەدەکانی پێشوو (دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) نەناسراوەو بەکارنەهاتوە، بەڵکو دوایی ئەو وشەیە بەکارهاتوە، ئنجا هەندێکیان گوتوویانە: ئەوە پاڵدەدرێتە لای (صوففە)، {صوففە شوێنێك بووە کە ژمارەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە زگورتیی و بێ ژن و ماڵ بوون لە مزگەوتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئەوێ شوێنی نیشتەجێبوونیان بووە} بەڵام ئەوە هەڵەیە، چونکە ئەگەر وابووایە، دەبووایە بگوترێ: (صوففیی)، وە هەندێکیان گوتوویانە: وشەی (صوفی) یان (صوفییە) پاڵدراوەتە لای صەف کە لەبەر دەستی خوادا، یاخود لە خزمەتی خوادا بەندایەتیی دەکەن، (یان جیهاد دەکەن، یان تاعەت دەکەن بەگشتی)، بەڵام ئەوەش هەڵەیە، چونکە ئەگەر وابووایە، دەبوو بگوترێ: (صەففیی)، هەندێکیش گوتوویانە: پاڵدراوەتە لای (الصفوة، الصفوه من خلق الله)، واتە: ئەوانەی کە هەڵبژاردەی درووستکراوانی خوان، بەڵام ئەوەش هەڵەیە، چونکە ئەگەر وابووایە، دەبوو بگوترێ: (صەفەویی)، هەندێکیش گوتوویانە: پاڵ دەدرێتە لای (صوف)، واتە: لەبەر کردنی بەرگی خوریی، کە ئەوە دیارە زیاتر ناسراوە.

---

(١) بەرگی (١١) لاپەڕە (٧).

(أبو الفتح البستي) کە ئەویش یەکێکە لە زانایانی بواری تەزکییەو عیرفان و تەصەووف لەوبارەوە شیعرێکی گوتوە دەڵێ:

تَخالَفَ النّاسُ في الصُوفيِّ واخْتَلَفوا   جَهْلاً وَظَنُّوا أنَّهُ مُشتَقٌ مِنَ الصُّوفِ

ولَسْتُ أَمْنَحُ هذا الإِسْمَ إِلاّ فَتَى   صافِي فصُفوفي حتّى سُمِّيَ الصُوفيِّ.[1]

واتە: خەڵك لەبارەی صوفییەوە ڕاجیایی و مشت و مڕیان هەبووە، (کە ئایا لەچیەوە هاتوە؟) بەنەزانیی، وە گومانیان وابووە کە: لە وشەی (صوف) کە خورییە، وەرگیراوە، بەڵام من ئەو ناوە تەنیا بەکەسێك ڕەوا دەبینم کە خۆی صاف کردۆتەوەو صاف بۆتەوە، تاکو ناونراوە بە صۆفیی، کەواتە: بەپێی قسەی ئەو بێ لە (صفا و)ەوە هاتوە.

بەڵام لەڕاستییدا ئەوەی کە سەرجەم زانایان تەبەننیان کردوەو بەڕاستیان زانیوە، ئەوەیە کە لە وشەی (صوف)ەوە هاتوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەوکاتە ئەوانەی کە زیاتر جەختیان کردۆتەوە لەسەر خواپەرستیی و دنیا بەکەم گرتن، بەرگی خورییان پۆشیوە.

## ٤) ڕۆیشتن و ڕەفتارو ئاکار (السير والسلوك):

چۆنیەتی بەرەو خوا چوون و مامەڵە لەگەڵ خوا کردن، وە چۆنیەتی ڕەفتارو هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکدا، کە دەبێ بەشێوەیەك بێ شەریعەت دیاریی کردوە.

ئنجا ئەگەر تەماشا بکەین دەبینین دینداریی بەگشتی لە دوو شتدا بەرجەستە دەبێ، کە دەتوانین بڵێین: (التقوى، والإحسان) یان (التقوى، وإصلاح ذات البين) یان (إسلام الوجه لله، والإحسان) یان (عبادة الله، وفعل الخير)ن، کە هەر چواریان لە ئایەتەکانی قورئاندا هاتوون:

١- ئەمما وشەی تەقواو ئیحسان لەچەند شوێنێك لە قوڕاندا بەیەکەوە هاتوون، بۆ وێنە: لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ:

(١) إيقاظ الهمم في شرح الحكم/ بەرگی ١ لا٦٧.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨ ﴾

واتە: بێگومان خوا لەگەڵ ئەو كەسانەیە كە پارێزیان كردوە، وەلەگەڵ ئەو كەسانەدایە كە چاكەكارن، یانی لەنێوان خۆیان و خوادا، پارێزكارن، وە لەنێوان خۆیان و خەڵكدا، چاكەكارن.

٢- هەروەها لە سوورەتی (الأنفال)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ ١ ﴾

واتە: پارێز لەخوا بكەن و پەیوەندیی نێوانتان چاك بكەن، كەواتە: ئەوەش دیسان بریتیە لەخواپەرستیی و خەڵك دۆستیی، یان پارێزكاریی و چاكەكاریی.

٣- وە لەسوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ ١٢٥ ﴾

دەفەرموێ: دینداریی كێ باشترە لەهی كەسێك كە ڕووی خۆی بەخوا سپاردوەو بۆ خوا ملكەچە، بەڕواڵەت و پەنهان بۆخوا ملكەچە، وە لەگەڵ خەڵكیشدا چاكەكارە؟.

٤- لە سوورەتی (الحج)یشدا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٧٧ ﴾

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕكووع بەرن و سەجدە بەرن و، پەروەردگارتان بپەرستن، وە چاكە بكەن، بەڵكو سەرفراز بن، واتە: خواپەرستیی و خەڵك دۆستیی بكەن، بۆیە من ئەو تەعبیرەم بەكارهێناوە كە: ئیسلام لە دوو وشەدا كورت دەبێتەوە: (خواپەرستیی و خەڵك دۆستیی)، وە (عبدالقادر)ی گەیلانیی ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: ئیسلام لە دوو وشەدا خوڵاصە دەبێتەوە: (صِدقٌ مَعَ الحَقْ، خُلُقٌ مَعَ الخَلْق) ڕاستیی لەگەڵ حەقدا (لەگەڵ خوادا)و چاكیی و

ڕەوشت بەرزیی لەگەڵ خەڵكدا، بەندەیەكی ڕاست و چاك بە بۆ خوا، وە ڕەوشت و ئاكارت بەرزو پەسندو جوان بێ لەگەڵ خەڵكی خوادا.

ئنجا یەكێ بۆی هەیە بڵێ: ئنجا ئایا چۆن بەرەو خوا دەچین؟ كە دیارە من یەكێ لە كتێبەكانی خۆم ناوناوە (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خواچوون)، (طريق الصلاح والسير إلى الله).

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەوە تەعبیرێكی ڕەمزییەو لە قورئانیشدا هاتوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ... ﴿٥٠﴾ ﴾ الذاريات.

واتە: مەبەست ئەوە نیە كە خوای پەروەردگار شوێنێكی دیاریی كراوی هەبێ و، ئێمەش بۆی بچین! هەڵبەتە خوای پەروەردگار لەسەر عەڕشی خۆیەتی بەو شێوەیە كە بۆخوا شایستەیە، لە سەرووی دروستكراوەكانی خۆیەتی، وەك فەرموویەتی:

﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٤﴾ ﴾ السجدة.

بەڵام گرنگ ئەوەیە خەڵك ناتوانن بچن بۆ خزمەت خوای پەروەردگار لەم ژیانی دنیاییەدا، ئەدی مەبەست چییە لە وشەی بەرەو خوا چوون؟ واتە: بەرەو ئەوە بچی كە خوا پێی خۆشە، ئەو كارو كردەوانە بكەی كە خوا پێیان ڕازییە، واتە: بەرەو ڕەزامەندیی خوا بچی، وەك لە قورئاندا هاتوە:

﴿ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ﴿٨﴾ ﴾ الحشر.

واتە: بەخششی خواو ڕەزامەندیی خوا داوادەكەن، ئنجا ئایا لە قورئاندا زاراوەی بەرەو خوا چوون بەكار هاتوە؟ بەڵێ، لە سووڕەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ:

﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ إِنِّى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ ﴾

واتە: بۆلای خوا ڕابكەن، بێگومان من لەلای ئەوەوە، بۆئێوە، ترسێنەرێكی دیارو ئاشكرام، هەروەها لەسووڕەتی (الصافات)دا خوای بێ وێنە لەسەر زمانی پێغەمبەر ئیبراهیم عليه السلام دەفەرموێ:

﴿ وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ ﴾

واتە: من بەرەو پەروەردگارم دەچم، وەخوا ڕێنماییم دەكات، ئیبراهیم كاتێ لە عێراق تەنگی پێ هەڵچنرا، نەمروودو دارو دەستەكەی ئاگریان بۆ كردەوەو خستیانە نێو ئاگری سوورەوە، بەڵام خوای باڵادەست دەربازی كرد، دوایی ئیبراهیم علیە السلام بەفەرمانی خوا چوو بۆشام و لەوێ ئەوەی فەرموو، كەواتە: ئیبراهیم وشەی بەرەو خواچوونی بەكارهێناوە، من بەرەو پەروەردگارم دەچم واتە: بەرەو ئەو شوێنە دەچم كە دەتوانم خواپەرستیی باشتری لێبكەم و هیچ بەربەرچ و ئاستەنگێك لە بەردەممدا نابێ و، دەتوانم بەو شێوەیە دینداریی بكەم كە خوا فەرمانیی پێ كردووم.

## ٥) التخلية من الرذائل، والتحلية بالفضائل:

واتە: بژاركران لە سیفەت و خوو خدە پەست و نزم و خراپەكان، وەڕازێندرانەوە بە سیفەتە بەرزو پەسندەكان، ئنجا لە ڕاستییدا هەموو دینداریش نەك هەر لایەنی تەزكیەو ئیحسان بگرە هەموو دینداریی و مسوڵمانەتیی لەو دوو لایەنەدا كورت هەڵدێ، كە ئینسان خۆی لە سیفەتە خراپەكان بژار بكات و پاك بكاتەوە، كە خراپترین سیفەت بریتیە لە شیرك، وەك پەیوەندیی نێوان خۆمان و خوا، وە خراپترین سدفەتیش بریتیە لە زوڵم، وەك پەیوەندیی لە نێوان خۆمان و خەڵكدا.

وە خۆ جوانكردن و ڕازاندنەوە بە سیفەت و ئاكارە بەرزو پەسندەكان، كە باشترین سیفەتیش بریتیە لە خوا بەیەكگرتن، (توحید)و تەنیا خوا پەرستن، وەك پەیوەندیی نێوان خۆمان و خوا، وە باشترین سیفەتیش لەنێوانی خۆمان و خەڵكدا، بریتیە لە دادگەریی، كەواتە: دینداریی بە گشتی بریتیە لە خۆ بژاركردن لە سیفەتە خراپەكان، وە خۆڕازاندنەوە بە سیفەتە باشەكان.

### ٦) التخلّي من كل خُلُقٍ دَنيٍّ، والتحلّي بكل خُلُقٍ سَنيٍّ:

واتە تەصەووف، یان مەقامی ئیحسان، بریتیە لە خۆدەرباز كردن لە هەموو ئاكارێكی نزم و پەست، وە خۆڕازاندنەوەی بە هەموو ئاكارێكی بەرزو جوان.

ئەمانە چەند وشەو تەعبیرێك بوون، كە زانایان وەك زاراوە بەكاریان هێناون بۆ ناساندن و پێناسەكردنی ئەوەی كە ئێمە ناومان لێناوە: (چاك خوا پەرستن و، خۆپاك و چاك كردن)، یان (گیانی ژیان)، دەمێنێتەوە بڵێم: كە بەناو لەخۆنان و، شیعار بەرز كردنەوەی بێ نێوەڕۆك و كردار، ئینسان هیچی پێ نابڕێ، ئنجا چ لەبواری تەزكییەی نەفس دا، چ لەبواری شوێن كەوتنی پێشینی چاكدا، چ لە بواری كاری ئیسلامییدا، چ لەبواری ئەنجامدانی نوێژو تاعەتدا، لە هەموو بوارەكاندا، مرۆڤ بە ناوو نیشان، هیچی دەستگیر نابێ، بەڵكو دەبێ جەخت بكاتەوە لەسەر ئەوەی كە ئەو ناوونیشانە، نێوەڕۆكی هەبێ و، ئەو شیعارە كرداری لەگەڵدا بێ، وە ئەو ڕواڵەتە دیوە، پەنهانەكەی لەگەڵدا بێ، هەربۆیەش خوا سبحانە و تعالى لە سوورەتی (الماعون)دا دەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ
ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾
ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ
ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾ ﴾

كە ئەو سوورەتە كورتە پێویستە زۆر چاك سەرنجی بدەین، خوا دەفەرموێ: بەناوی خوای بەبەزەیی و بەخشندە، ئایا دەزانی كێ بڕوای بەدین نیە؟ (دین واتە: ئیسلام، یاخود سزاو پاداشت)، ئەو كەسە بڕوای بەدین نیە، كە پاڵ بە هەتیوەوە دەنێت و تێی دەخوڕێ (لەجیاتی ئەوەی هاوكاریی بكاو دەستی بەسەردا بێنێ)، وە هانی خەڵك نادات بۆ ناندان بەهەژارو نەداران، سزای سەخت

بۆ ئەو نوێژكەرانەی كە لەنوێژەكانیان بێئاگان، (نوێژەكەیان وایان لێناكات بەزەییان هەبێ بەرانبەر بەهەژارو نەدارو لێقەوماوان)، ئەوانەی كە ڕیابازیی دەكەن (واتە: ئەو نوێژەی كە دەیكەن، مادام ڕەحم و بەزەییان تێدا پەیدا نەكات و مادام نێوەڕۆكی لەگەڵدا نەبێ، ئەوە دیارە هەر بۆ ڕیابازییە) وە ئەوانە كە هاوكاریی لە خەڵك دەگرنەوە. كەواتە: نوێژ دەبێ ئینسان چاك بكات، وە دەبێ ڕواڵەت، دیوە پەنهانەكەی لەگەڵدا بێ، كەئەو دیوە پەنهانە بەچی دەزانین هەیە؟ بەڕەفتارو ئاكارەكانی ئینسان و بەمامەڵەی پەسندو جوانی ئینسان لەگەڵ خوای پەروەردگارو لەگەڵ خەڵكدا، لەوەدا بەرجەستە دەبێ[1].



(١) لە كتێبی (ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامیی)دا، لە هەرسێك بازنەی مامەڵە لەگەڵ (خۆ) و(خوا)و (خەڵك)دا، سەدو پەنجاو پێنج (١٥٥) ڕەوشت و ئاكاری بەرزو پەسندمان خستۆتە ڕوو، كە ئێستا كاری لەسەر دەكرێت بۆ چاپكردن.



# پەیوەندیی نێوان ئیسلام و تەزکیەی نەفس

لەم دەرسەماندا مەسەلەیەك ڕوون دەكەمەوە، كەبەبێ لێ حاڵی بوونی، ئینسان دووچاری هەڵەو لادان دەبێ: ئایا تەزكیەی نەفس و ئیسلام پەیوەندییان چۆنە؟! وە ئایا تەزكیەی نەفس، یان ئیحسان، یا دیوی پەنهانی خواپەرستیی، پێگەی لە ئیسلام دا چییە؟ دەتوانین لە سێ خاڵدا تەعبیر بكەین لە پەیوەندیی نێوان ئیسلام و تەزكییەی نەفس، یاخود پێگەی تەزكیەی نەفس لە ئیسلامدا:

**یــەك:** ئیسلام بریتیە لە (هەموو - كلّ -)، بەڵام تەزكیەی نەفس بریتیە لە (بەش - جزء- ) بەڵێ: ئیسلام (كل)ەو تەزكیەی نەفس (جزء)ە، كەواتە: بەكاركردن بەتەزكیەی نەفس، مانای وانیە ئیسلامەمان هەموو دەستگیر بووە، چونكە ئیسلام (هەموو)ە و، تەزكیەی نەفس (بەشێك)ە لەو (هەموو)ە، كە ئیسلامە.

**دوو:** ئیسلام پەیوەندیی بە تاك و خێزان و، كۆمەڵگاو دەوڵەت و، دەرو دەروون و، مزگەوت و بازاڕو، هەموو لایەن و ڕەهەندەكانی ژیانی ئینسانەوە هەیە، بەڵام تەزكیەی نەفس زیاتر پەیوەستە بە ڕووحەوە، پەیوەستە بەدەروون و لایەنی پەنهانی ئینسانەوە.

**سـێ:** بەبێ وەرگرتنی ئیسلام {واتە: ئیسلام (هەموو)ی} وە بەبێ ئیمان هێنان بە ئیسلام و بەبێ قەبووڵ كردنی ئیسلام، ئینسان نابێتە مسوڵمان، بەڵام بەبێ تەزكیەی نەفس ئینسان هەر مسوڵمانە، بەڵام نابێتە مسوڵمانێكی باش،

بەڵام دەبێ وریا بین! بەبێ تەزكیەی نەفس، بەو واتایە نا، كە ئینسان هیچ پشك و بەشی نەبێ لە دیوی پەنهان و شێرراوەی دینداریيدا، نەخێر بەو مانایە نا، چونكە ئینسان ئەگەر هیچ پشك و بەشی لەو دیوە پەنهانەی خواپەرستییدا نەبێ، مانای وایە ئەوە حاڵەتی وەك حاڵەتی نیفاقە، وە وەك حاڵەتی عەرەبە دەشتەكییەكانە، كە خوای كاربەجێ نەفی ئیمانی لێكردن، وەك خوای زانا فەرمویەتی:

﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ۖ ﴿١٤﴾﴾ الحجرات.

وە بەبێ ئیمانیش ئینسان سەرفراز نابێ، وە ناچێتە بەهەشتیش.

بەڵكو لێرەدا مەبەستم لە تەزكیەی نەفس ئەوەیە كە ئینسان كاری زۆر لەسەر نەفس و دەروون و دیوی پەنهانی خۆی بكا، وە چاو لەسەر كردەوەكانی و، خوا پەرستییەكانی و، هەڵس و كەوتەكانی ورد بكاتەوە، كە هەموویان پەیوەست بن بە ڕەزامەندیی خواوەو، ئیخلاصی تەواویان تێدابێ، بەڵێ، بەو واتایەیان، ئینسان بەبێ تەزكیەی نەفس، نابێتە مسوڵمانێكی تێرو تەواو، كەواتە: وەك چۆن زانیاری تەفسیر بۆ چاك تێگەیشتنی قورئانە، وە زانیاری تەجوید بۆ چاك خوێندنی قورئانە، وە زانیاری فیقهو ئوصووڵی فیقە، بۆ چاك تێگەیشتنی حوكمەكانی قورئان و سوننەتە، وە وەك چۆن زانیاری عەقیدە بۆ تێگەیشتن لە ئیمان و پایەكانی ئیمان پێویستە، بەهەمان شێوە عیلمی تەزكییەش پێویستە بۆ چاك خواپەرستیی ئەنجامدان، وە باش بەڕێوە بردنی ئیسلام، وە خۆ پاك و چاككردن، بۆ ڕوون بوونەوەی مەبەست دەتوانین چەند وێنەیەك بهێنینەوە:

**وێنەی یەكەم: نوێژ كردن:** كەسێك كە نوێژەكەی هەروا بە هاكەزایی دەكات، بەڵكو جاری واهەیە تەعبیری: (بانوێژەكانمان لەكۆڵ بكەینەوە) بەكاردێنێ، ئەوە نوێژی لەلا وەك كۆڵ و بارێكەو دەیەوێ لێی دەرباز بێ!، ئنجا ئەوە لەكوێ؟ وە ئەوە لەكوێ، كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كاتێ كاتی نوێژ دەهات، دەیفەرموو: (أَرِحْنَا بِهَا يَا بِلَالُ)[1]، واتە: ئەی بیلال!

(١) أخرجه أحمد برقم ٢٣١٣٧ و، أبوداود برقم ٤٩٨٥.

بەنوێژ ئاسوودەمان بكە، واتە: بانگ بڵێ، با نوێژەكەمان بكەین و ئاسوودە بین، ئەوكەسەی كە نوێژ بەمایەی ئاسوودەیی دادەنێ و، دەڵێ: (أَرِحْنَا بِهَا)، زۆر جیایە لەوەی نوێژ بە كۆڵێك دادەنێ و دەڵێ: (أَرِحْنَا منهَا)، واتە: دەربازمان بكە لێی!.

**وێنەی دووەم: ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان:** ئەوە لەكوێ كە تۆ موشتاق و تامەزرۆ بیت كە مانگی ڕەمەزان دێ، بۆ ئەوەی مەجالێكی چاكترت دەست بكەوێ بۆ قووڵكردنەوەی پەیوەندیی لەگەڵ خواو، گەرم و گوڕكردنی پەیوەندییت لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، وەك خوا پەرستیی و، وەك ئەنجامدانی كردەوە چاكەكان، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مانگی ڕەمەزاندا، لە بواری دەور كردنەوەی قورئان و بەخشین و تاعەتدا، زیاتر خۆی ماندوو كردوە، وەك لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە، وە ئەوە لەكوێ كە تۆ ڕەمەزان وەك مانگێكی مەترسیی لێكراو، دابنێی!.

**وێنەی سێیەم: حەج و عومرە:** ئەوە لەكوێ، كە یەكێ بچێ حەج یان عومرە یان هەردووكیان بەیەكەوە ئەنجام بداو، ئەو گەشت و سەفەرە بە گەورەی سەفەران (سيد الأسفار) لەقەڵەم بدات، لەبەر ئەوەی دەچێت زیارەتی ماڵی خوا دەكات، دەچێتە مزگەوتی حەرام، وە دەچێتە مزگەوتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وە بە ئیشتیاق و تامەزرۆییەوە پێویستییەكانی حەج و عومرە ئەنجام دەدات، وە ئەوە لەكوێ كە كەسێك پێیوایە حەج بارێكەو، مادام حەجی لێكەوتوە، دەبێ لەكۆڵ خۆی بكاتەوە، یاخود خۆی پێوە هەڵكێشێ و بۆ ئەوەی پێی بگوترێ: فلان دەچێتە حەج؟!.

**وێنەی چوارەم: زەكات دان و ماڵ بەخشین:** ئەوە لەكوێ، كە تۆ خوا خوات بێ كەسێكت لێ هەڵكەوێ، هاوكاریی بكەی و پێی ببەخشی، لەبەر ئەوەی ئەو ماڵ و سامانە ئەمانەتی خوایەو پێت وابێ، دەبێ بیگەیەنیە شوێنی خۆی! وە ئەوە لەكوێ بابایەك زەكات بداو، كۆڵێ منەت و فیزو كەشخەی پێوە بكاو بڵێ: ئەوەندەم زەكات داو، دام بە فلان كەس و فلان كەس؟!.

**وێنەی پێنجەم: زیکر کردن:** ئەوە لەکوێ کەتۆ یادی خوا بکەی بەدڵێکی گەرم و گوڕ، بەشێوەیەك پێت خۆشنەبێ کەس پێت بزانێ! وە ئەوە لەکوێ کە مرۆڤ یادی خوا بکات، بەڵام زیاتر حاڵەتێکی ڕوو دەرباییسی و ڕواڵەتیی پێوە دیاربێ؟!.

هەروەها هەموو ئەو تاعەت و چاکانەی کە پێویستە ئینسان پێیان لەخوا نزیك بێتەوە، ئەگەر بێت و حاڵەتی پەنهانییان تێدا هەبێ، ئەو حاڵەتەی کە شەریعەت داوای کردوە، حاڵەتی چێژتن و تامکردنیان تێدابێ، ئەوە زۆر جیایە لەوەی کە تەنیا کەلەشێك و ڕواڵەتێك و دیکۆرێك بن، بۆیە ئێمە پێویستیمان بە زانستی تەزکیەی نەفس هەیەو، پێویستیمان بە زانستی ئیحسان هەیە، تاکو خواپەرستیی و دینداریمان، ئەو ڕووحەی تێدابێ و ئەو دیوە پەنهان و شێرراوەیەی تێدا بێ، کە تەنیا خوا سبحانە و تعالى دەیبینێ، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ) أخرجه أحمد برقم (٧٨١٤)، ومسلم برقم (٢٥٦٤)، وابن ماجه برقم (٤١٤٣)، وأخرجه أيضًا: إسحاق بن راهويه برقم (٣٧٩)، وابن حبان برقم (٣٩٤)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١٠٤٧٧)، والديلمي برقم (٦١٤).

واتە: خوا تەماشای ڕەنگ و ڕوو و ماڵ و سامانتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵەکانتان و کردەوەکانتان دەکات.

بەڵێ پێشێ خوا تەماشای دڵ و دەروونەکانمان دەکات، جێی سەرنجی خوا دڵە، جێی سەرنجی خوا بەر لەوەی کە لەش (قالب) بێ، دڵ (قلب)ە، پاشان خوا تەماشای کردەوەکان دەکات، ئەو کردەوانەش ئەگەر لە دڵێکی ساف و ساغەوە نەهاتبن، ئنجا: نوێژە، ڕۆژوویە، حەج و عومرەیە، کۆچکردن و جیهادە، زیکرو یادی خوایە، ماڵ بەخشینە، هەڵسوکەوتی چاکە، فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لە خراپەیە، صیلەی ڕەحمە، هەموو ئەوانە ئەگەر لەدڵێکی ساف و ساغەوە سەرچاوەیان نەگرتبێ و ئیخلاصیان تێدا نەبێ، ئەوە جێی ئیعتیباری خوای پەروەردگار نین و خوای پەروەردگار بەتەماشا کردنی ئیعتیبار بۆدانان، تەماشایان ناکات.

ئنجا لەڕاستیدا ئینسان كاتێك كە حاڵەتی تەزكیەی نەفسی بۆ پەیدا دەبێ، ئەو كاتە ئەگەر دەستەڵاتی هەبێ، ئەگەر ماڵ و سامانی هەبێ، ئەگەر زانستی هەبێ، ئەگەر پێگەی كۆمەڵایەتیی هەبێ، هەموو ئەوانە وەك نیعمەتی خوا تەماشا دەكا، وە شوكری خوا لەسەر ئەو نیعمەتانە دەكا، شوكری خواش بریتیە لەوەی ئەو نیعمەتانە لە ڕەزامەندیی خوادا بەكار بهێنرێن.

بەڵێ، تەزكیەی نەفس و تەصەووف، نە شتێكی جیایە لە ئیسلام، وەك نەیارەكانی عیرفان و تەصەووف و تەزكیەی نەفس دەڵێن، وە نەجۆرێكیشە لە ئیسلام و بەدیلە بۆ ئیسلام، وەك هەندێك لە پەیڕەوان و شوێنكەوتووانی بەهەڵەداچووی بواری تەصەووف گومان دەبەن، بەڵكو تەزكیەی نەفس بەو چەمك و واتایە كە باسمان كرد: دیوی پەنهانی مسوڵمانەتییەو دیوە شێرراوەكەیەتی و، بریتیە لە مسوڵمانەتیی و دینداریی چاكترو ئیكتیفا نەكردن بەئەندازەیەكی كەمی دینداریی.

ئنجا ژمارەیەك لە زانایان و شارەزایانی ئیسلام -وەك پێشتر باسمان كرد- لەو لایەنەدا قووڵ بوونەتەوە، وە كۆمەڵێك كتێب و سەرچاوەیان بۆ بەرهەم هێناوین، بۆ ئەوەی ئێمە لەو ڕووەوە خۆمان پەروەردە بكەین، وەك چۆن زانایانی بواری فیقهو ئوصووڵی فیقە، وە زانایانی تەفسیرو زانایانی فەرموودەناسیی، وە زانایانی بواری ئوصووڵی دین و عەقیدە، وە زانایانی مێژوو، هەروەها شارەزایانی زمانی عەرەبی، هەموویان كۆمەڵێك كتێبیان بۆ بەرهەم هێناوین لەو بوارانەدا، بەهەمان شێوەش كۆمەڵێك لە زانایان و پێشەوایانمان خوا لە هەموویان خۆشبێ، كۆمەڵێ كتێب و بەرهەمیان خستووینەتە بەردەست، كە لەڕووی ڕووحیی و دەروونیەوە، خۆمان زیاتر پەروەردە بكەین، وە زیاتر خۆمان گەشە پێ بدەین.

ئنجا لێرەدا پێویستە ئاماژە بە شتێكی دیكەش بكەم، سەبارەت بەوانەی كە تێبینی زۆریان هەبوون، لەسەر تەصەووف، بۆ ئەوەی تووشی زوڵم نەبین، ئەویش ئەوەیە كە هەندێ لەزانایان، بەتایبەت ئەوانەی كە نازناو سەلەفیین، {(سەلەفیی)) بەو واتا عورفییەی ئێستای، نەك بەواتا ڕاستەقینەكەی، كە وەك پێشتر گوتم: سەلەفیی بوون بەو واتایە، كە دەبێ بەدوای سەلەفی صالح بكەوین، خاڵی

هاوبەشی بەینی هەموو مسوڵمانانەو، تەنیا تاپۆی چەند كۆمەڵێك و دەستەیەك نیە كە ئەو ناوە لەخۆیان دەنێن، بەڵكو دەبێ هەموومان بەدوای پێشینی چاك بكەوین و، وەك ئەوان هەوڵ بدەین لە ئیسلام تێبگەین، بەشێوە گشتییەكەی، وە هەوڵ بدەین وەك ئەوان دینداریی بكەین، بەشێوە گشتگیرییەكەی، كە دیارە سەلەفی صاڵحی ئێمەش پێش هەموو كەس پێغەمبەری خوایە (صلى الله علیه وسلم)، وە دوای ئەو خەلیفەكانی و هاوەڵەبەڕێزەكاننی، خوا لێیان ڕازی بێ، دوایی جیلەكانی دیكەن، كە چاك بەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم)و هاوەڵانی خوا لێیان ڕازی بێ، كەوتوون}. بەڵێ، هەندێ لەوانە كە نكوولّیی لە تەصەووف دەكەن، مەبەستیان پێی بواری تەزكیەی نەفس نیە، وەك هەندێ لە ئەهلی تەصەووف بەهەڵە دەیانەوێ ئەوەیان لەسەر حیساب بكەن، بەڵكو لە ڕاستیدا هەڵوێستەكەیان كاردانەوە بووە، بۆ ئەو داهێنراوانەو ئەو پەیداكراوانەی كە لەژێر پەردەی تەصەووفدا هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە، كە وەك من جاری دیكەش گوتوومە: لەژێر دوو ناوونیشاندا كە شیعەگەریی و سۆفیگەریی (التشیع والتصوف)ن، بیدعەت و داهێنراوی زۆر هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە، ئەوەی كە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

(مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ) أخرجه أحمد برقم (٢٥١٧١)، ومسلم برقم (١٧١٨) والبخاري برقم (٢٥٥٠).

واتە: هەركەسێ لەم كارەی ئێمەدا (لەو ئیسلامەی ئێمەدا) شتێك پەیدا بكا، كە پێی بێگانە بێ، ئەوە ڕەتكراوەیە، یان دەفەرموێ:

(مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ) رواه مسلم برقم (١٧١٨).

واتە: هەركەسێ كردەوەیەك ئەنجامبدا، فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ، ئەوە ڕەتكراوەیە، كەواتە: ئەوانەی كە نكوولّییان لە تەصەووف كردوە، نكوولّییان لە ئەصلی حاڵەتی تەزكییەی نەفس نەكردوە، كە هەموو كەس دەزانێ دەبێ مسوڵمان بەشی هەبێ لە تەزكیەی نەفسدا، وە بەشی هەبێ لە لایەنی پەنهان و شێرراوەی دینداریی و مسوڵمانەتیی دا، بەڵكو ئەوان هەڵوێستەكەیان بریتی

بووە لە كاردانەوە بەرانبەر بەو داهێنراوانەو بەو پەیداكراوانەی كە لەژێر ناوو پەردەی تەصەووفدا هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە، كە جاری دیكەش گوتوومانە: لەژێر ناوونیشانی شیعەگەریی و سۆفییگەرییدا، داهێنران و پەیداكرانی زۆر هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە، بەپێچەوانەی ئەوەوە كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێكردوە، كە فەرموویەتی: هیچ شتێك لە ئیسلامدا پەیدا مەكەن، وەهیچ كردەوەیەك ئەنجام مەدەن، كە فەرمانی ئێمەی لەسەر نیە، واتە: لەبوارەكان: ئیمان و عەقیدەو عیبادەت و ئەو مەسەلانەدا كە دەقەكانی شەرع نوختەیان تێدا ختستوونە سەر پیت، كە دیارە ئیسلام بەگشتی دەبێتەوە بە دوو بەش: ١- عیبادەت. ٢- عادەت، بواری عیبادەت كە درووشمەكانی خواپەرستیی و ئیمان عەقیدە دەگرێتەوە، ئەصڵ تێیدا ئەوەیە كە دەبێت پابەند بین بەدەقەكانە وەو، هیچ شتێك لەخۆمانەوە ئەنجام نەدەین، وە لەو بوارەدا هەر شتێك پەیدا بكرێ، بەپەیداكراوو داهێنراو لەقەڵەم دەدرێ، چونكە شەریعەت لەو بوارەدا قسەی بۆكەس نەهێشتۆتەوە، بەڵام لەبورای عادەت و هەڵسوكەوتەكاندا، بە پێچەوانەوە: شەریعەت دەقی كەمی داناون و بۆشایی زۆری هێشتۆتەوە، تاكو خەڵك لەو بوارەدا داهێنان (إبداع) بكات، بۆچی؟ چونكە مامەڵە لەگەڵ خوادا، چ مامەڵەی فیكریی، كە ئیمان و عەقیدەیە، چ مامەڵەی كردەیی، كە دروشمەكان و خواپەرستییەكانن، هەر خوا دەزانێ دەبێ چۆن مامەڵە لەگەڵ خوادا بكرێ، بەڵام مامەڵەی نێوان خۆمان، لە مەودای عەقڵی ئینسان دا هەیەو لەژێر ڕكێفی عەقڵی ئینسان دا هەیە، بۆیە شەریعەت دەقی كەمی لەو بوارانەدا داناون، وەبۆشایی زۆی هێشتوونەتەوە، تاكو خەڵك بتوانێ داهێنان بكات، وە بەپێی پەرەسەندنەكانی ژیانی دنیای، بتوانێ گۆڕانكاریی بكاو شێوازی تازە دابێنێ، تاكو دین لە ژین بەجێ نەمێنێ.

بەكورتی دەتوانم بڵێم: لەنێوان هەندێك لەوانەدا كە خۆیان بەسەلەفیی ناودەبەن و، هەندێك لەوانەدا كە خۆیان بەئەهلی تەریقەت و تەصەووف ناودەبەن، جۆرێك لە لێكحاڵی نەبوون هەیە، بۆیە پێویستە ئەو لێكحاڵی نەبوونانە لابچن و باش لەیەكدی تێبگەین و، گومانی خراپ بەیەكدی نەبەین، وە بزانین كە: وەك

چۆن سەلەفیی بوون، خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، خاوەن نەفسی موزەككا بوون و پشك و بەش هەبوون لە ئیحسان و تەصەووفیشدا، بەمانا قورئانییەكەی، ئەویش دیسان خاڵی هاوبەشی بەینی هەموو مسوڵمانانە، یانی: هەموومان دەبێ هەوڵ بدەین نەفسی خۆمان تەزكیە بكەین، خۆمان پاك و چاك بكەین و، خوا پەرستییەكەمان، خوا پەرستییەكی چێژ لێوەرگرانەبێ، خواپەرستییەك بێ بەر لەوەی پەیوەندیی بەڕواڵەتمانەوە هەبێ، پەیوەندیی بە دەروونمانەوە هەبێ، وە ئەوە خاڵی هاوبەشی بەینی هەموو مسوڵمانانەو، تەنها لەسەر ئەهلی تەصەوف و تەریقەت قۆرخ نەكراوە، بەڵكو هەر مسوڵمانێكی ڕاست و ساغ، دەبێ پشكی لەوەدا هەبێ، هەروەك هەموو مسوڵمانێكی ڕاست و چاك، دەبێ بەدوای پێشینی چاك (السلف الصالح) بكەوێ، لەو بنەمایاندا كە ئەوان لەسەریان ڕۆیشتوون لەبواری دینداریدا، بەڵام دیارە هەموو ئەو فیكرەو بۆچوونانەی پێشینی چاكمان، لەبارەی تێگەیشتنی دینەوە گوتوویانن، پابەندكەر نین بۆئێمە، مادام پەیوەست بن بەبارودۆخ و ژینگەكان و، عورف و عادەت و، بەو شتانەوە كە گۆڕانیان بەسەردا دێ، بەڵام ئەوەی كە پەیوەندیی بە عەقیدەو عیبادەت و، بنچینەكانی دینەوە هەیە، بەتەئكید دەبێ تێیدا بەدوای پێشینی چاكمان بكەوین، هەم لەبواری تێگەیشتنی دینداو، هەم لەبواری پابەندیی بەدین و شەریعەتدا.




# گرنگیی و پێگەی تەزکیەی نەفس لە ئیسلامدا

خوا پشتیوان بێ ئێمە لەم دەرسەدا دەمانەوێ تیشك بخەینە سەر ئەوەی کە تەزکیەی نەفس چ پێگەیەکی هەیە لە ئیسلامداو، چ گرنگیی و بایەخێکی هەیە؟، هەرچەندە لە باسەکانی پێشتریشدا کەم و زۆر باسی ئەوە کرا، بەڵام لەم باسەدا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتە.

ئەگەر سەرنجی ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی (الشمس) بدەین، زۆر جوان بۆمان دەردەکەوێ، کە تەزکیەی نەفس، وە بوون بەخاوەن نەفسێکی پاك و چاك، چ گرنگییەکی هەیە، لە دینداریی و مسوڵمانێتیدا! خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا ١ وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ٢ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ٣ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰهَا
٤ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ٥ وَٱلْأَرْضِ وَمَا طَحَىٰهَا ٦ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا
وَتَقْوَىٰهَا ٨ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ١٠﴾ الشمس.

من سەرەتا بەکورتی تەفسیرو تەرجەمەیان دەکەم، خوا (جل جلاله) دەفەرموێ:

(بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە)

﴿سوێند بەخۆرو بە تیشكەكەی ﴿١﴾ وەسوێند بە مانگ كەبەدوای خۆردا دێ ﴿٢﴾ وە سوێند بە ڕۆژگار كە (سەرزەوی) ڕۆشن دەكاتەوە ﴿٣﴾ وە سوێند بە شەوگار كە (سەرزەوی) دادەپۆشێ ﴿٤﴾ وە سوێند بە ئاسمان و بەو كەسەی كە ئاسمانی بنیات ناوە ﴿٥﴾ وە سوێند بە زەوی و بەو كەسەی زەوی پان ڕاخستوە ﴿٦﴾ وە سوێند بەنەفس و بەو كەسەی كە ڕێكی خستوە ﴿٧﴾ پاشان خراپەكاریی و پارێزكاریی فێر كردوە ﴿٨﴾ بێگومان ئەو كەسەی نەفسی خۆی پاك و چاك كردوە، سەرفرازە ﴿٩﴾ وەهەر كەسێ نەفسی خۆی پەنهان كردبێ (لەژێر چڵك و چەپەری گوناهدا) پەشێمان و بەدبەختە ﴿١٠﴾﴾.

خوای كاربەجێ سبحانە و تعالی لێرەدا یازدە سوێندی خواردوون:

١و٢- سوێند بەخۆرو بە تیشكەكەی.

٣- سوێند بە مانگ كە بەدوای خۆردا دێ، واتە: دوای ئەوەی كە خۆر ئاوا دەبێ، ئنجا مانگ هەڵدێ.

٤- سوێند بە ڕۆژگار، كە زەوی دەدرەوشێنێتەوە.

٥- سوێند بە شەوگار كە لەدوای ڕۆژگار، ڕووبەری زەوی دادەپۆشێ.

٦و٧- سوێند بە ئاسمان و بە بنیاتنەرو وەستێنەری ئاسمان، كە خوای بەدیهێنەرە.

٨و٩- سوێند بە زەوی و بە ڕاخەری زەوی، كە خوای پەروەردگارە.

١٠و١١- سوێند بە نەفس و بە ڕێكخەری نەفس و بە پەیداكەرو بەدیهێنەری، كە خوای بەخشەرە.

وەڵامی سوێندەكە چییە؟ ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾ بێگومان سەرفرازە هەركەسێ نەفسی خۆی تەزكیە كردوە، وە پەشێمان و بەدبەختە، هەر كەسێ نەفسی خۆی، لەجیاتی ئەوەی پاكی بكات و چاكی بكات، پیس و خراپ كردوەو، لەژێر كەمرەی چڵك و گوناهدا، شاردوویەتەوە،

چونكە وشەی تەزكیە -وەك پێشتر باسمان كرد- هەم بەمانای پاك بوون دێ، هەم بەمانای گەشە كردن دێ، هەم بەمانای چاك بوون دێ[1]، وشەی (دساها)ش كە لە (تدسية)ەوە هاتوە، واتە: شاردیەوەو پەنهانی كرد[2] وەك خوای پەروەردگار دەفەرمویّ:

﴿ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ٥٩ ﴾ النحل.

كەسێ كە لەسەردەمی نەفامییدا موژدەی ئەوەیان پێدەدا كە كچیان بووە، دەفەرمویّ: نەیدەزانی ئایا ئەو ڕیسواییە قبووڵ بكات و بیهێڵێتەوە؟ یاخود لە گڵی بخات و زیندە بەچاڵی بكات؟ ئنجا بێگومان ئەمە بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر پێگەو گرنگیی و هەستیاریی تەزكیەی نەفس، چونكە خوای پەروەردگار كە سوێند دەخوا، بۆ ئەوەیەتی كە ئێمە تێبگەیەنێ لەوەی كە ئەو شتەی سوێندی لەسەر دەخوا {واتە: (مُقْسَمُ عَلَيهِ)ەكە}، ئەو شتە كە سوێندی لەسەر خوراوە، دیارە شتێكی جێی بایەخە، ئنجا لێرەدا خوا سبحانە و تعالی یازدە (١١) سوێندان دەخواو سوێند بە یازدە شتان دەخوا، لەسەر چی؟ لەسەر ئەوە كە هەر كەس نەفسی خۆی تەزكیە بكا واتە: پاكی بكاو، گەشەی پێبداو، چاكی بكا، ئەوە بێگومان سەرفرازو بەختەوەرو بە موراد گەیشتوویەو دەرباز بوویە، بە پێچەوانەشەوە: هەر كەسێ نەفسی خۆی، لە جیاتی ئەوەی گەشە پێبداو، چاكی بكا، لەژێر چڵك و چەپەری گوناح و خراپەدا بیشارێتەوەو پەنهانی بكا، ئەوە بێگومان پەشێمان و بەد بەختەو، زیان بارە.

## ئنجا لێرە جێی سەرنج ئەوەیە كە:

**یەكەم:** نەفس لە ڕیزی ئاسمان و زەوی و مانگ و خۆرو شەوو ڕۆژدا باس كراوە، مانا وایە نەفسی بەشەرو ڕووحی مرۆڤ، شتێكی زۆر گرنگ و جێی بایەخە.

..............................................

(١) مختار الصحاح، ص ٢٤٨.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٩١، دسَّ الشيء في التراب: أخفاه فيه.

**دووەم:** وە خراوەتە ڕوو كەنەفس هەر كام لە (فجور) واتە: خراپەكاریی، وە (تقوى) واتە: پارێزكاریی فێر كراون و، خوای پەروەردگار ئەو نەفسەی وا خوڵقاندوە، كە بتوانێ خراپەش بكاو چاكەش بكا، نزمیش بێتەوەو بەرزیش بێتەوە، لەخواش دووربكەوێتەوەو لەخواش نزیك بێتەوە.

**سێیەم:** وە بە مسۆگەریی و دڵنیایی (فلاح) واتە: سەر فرازیی و بە موراد گەیشتن، دەرباز بوون و ڕزگار بوون و بە ئاوات گەیشتن، كراوە بە دەستكەوتی كەسێك كە نەفسەكەی خۆی تەزكیە كردوە، وە بە پێچەوانەشەوە (خیبة) واتە: پەشێمانیی زیانباریی و ڕۆژ ڕەشیی، كراوە بە سزای هەر كەسێك كە نەفسی خۆی لەجیاتی ئەوە كە پاك و چاك بكاو، گەشە پێبدا، خراپ دەكاو پیس و پۆخڵ دەكاو، لە ژێر باری گوناهاندا پەنهان دەكات.

**چوارەم:** خوا سبحانه و تعالى باسی (فجور)و (تقوى)ی كردوە، كەواتە: نەفس بە (فجور) یانی: گوناهو تاوان و خراپە، لادان لە شەریعەت و سەرپێچیی[1] خوا سبحانه و تعالى، پەنهان دەبێ و زیانبار دەبێ، وە خاوەنەكەی تووشی پەشێمانیی و بەدبەختیی دێ.

بە پێچەوانەوە: بە (تقوى) یانی پارێزكاریی[2]، نەفسی ئینسان گەشە دەكا، پاك دەبێ، چاك دەبێ، یاخود لە ئەنجامی پاك و چاك بووندا، تەقوای تێدا پەیدا دەبێ.

..............................

(١) مختار الصحاح، ص٤٢٩ (فَجَرَ: فَسَقَ، وَفَجَرَ، كذَبَ وأصلُهُ المَيْل. والفاجر: المائل).

(٢) مختار الصحاح، ص ٦٢٩.




# ئایا تەزکیەی نەفس لە چ ڕوویەکەوە گرنگە؟

هەڵبەتە نەفس پاك و چاك بوون، لە زۆر ڕووەوە گرنگەو، دەمەوێ ئاماژە بەچەند ڕووێکی بکەم، کە من لێرەدا لە دە (١٠) خاڵاندا، دە ڕووی ئەو گرنگییە باس دەکەم:

**یەکەم:** بەبێ نەفس تەزکیە بوون، ئینسان سەرفراز نابێ، چونکە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ ﴾ الشمس. لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ ﴾ الأعلى. ئەگەر بتەوێ سەرفراز بی، خۆش بەخت بی، بە مراد بگەی، خوا لێت ڕازی بێ، دەبێ هەوڵ بدەی نەفسی خۆت پاك و چاك بکەی و گەشەی پێ بدەی.

**دووەم:** بەبێ تەزکیە بوونی نەفس، تەقوا لە دەروونی ئینساندا گەشە ناکا، چونکە دوای ئەوەی دەفەرموێ: ﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ ﴾ ئنجا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ ﴾ الشمس، واتە: ئەگەر دەتانەوێ تەقوا لە دڵ و دەروونتاندا زیاتر ڕیشە دابکوتێ و زیاتر جێگیر بێ، نەفسی خۆتان تەزکیە بکەن، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکدا هاتوە، سێ جاران ئاماژەی بە سینەی موبارەکی خۆی کردوەو فەرموویەتی: (التَّقْوَى هَا هُنَا) رواه مسلم: ٢٥٤٦، واتە: تەقوا لێرەدایە، کەواتە: کەی تەقوا دەچێتە دڵ و دەروونی ئینسانەوە؟ ئەو کاتەی کە ئەو دڵ و دەروونە پاك و چاك

كرابێ، هەروەك لە فەمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دا هاتوە كە فریشتەكانی خوا ناچنە ماڵێكەوە كە سەگی تێدا بێ،یان پەیكەرو وێنەی (بت و صەنەمی) تێدا بێ[1]، لە ڕاستیدا تەقواش میوانێكی بەڕێزە ناچێتە دڵ و دەروونێكەوە پاك و چاك نەبێ و، بۆخوا صوڵحاو نەبێ، بۆیەش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێكدا كە موسلیم هێناویەتی، دوعای كردوە فەرموویەتی:

(اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا)، أخرجه أحمد برقم (١٩٣٢٧)، ومسلم برقم (٢٧٢٢) والنسائي برقم (٥٤٥٨)، والطبراني برقم (٥٠٨٦)

واتە: خوایە! تەقوا بەنەفسم ببەخشە، وە پاك و چاكی بكە، تۆ چاكترین كەسی كە پاك و چاكی بكەی، تۆ سەر پەرشتیارو مشوور خۆری نەفسی منی.

هەروەها خوا سبحانە و تعالى لە سوورەتی (محمد)دا دەفەرموێ:

﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾﴾ محمد.

واتە: وەئەوانەی كە هیدایەتی خوایان وەرگرتوە (واتە: هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە)، خوا ڕێنمایی و هیدایەتیان بۆ زیاد دەكاو، تەقواشیان پێ دەبەخشێ.

كەواتە: تەقوا پێ بەخشران لە ئەنجامی ئەوەدایە كە ئینسان دەبێ پێشێ هیدایەتی خوا قبووڵ بكاو، بەرەو خوا هەنگاو بنێ و لەگەڵ خۆیدا خەریك بێ و كار لەسەر خۆی بكا، وە هەوڵ بدا نەفسی خۆی پاك و چاك بكا، ئەوجار شایستەی ئەوە دەبێ كە خوا تەقوای پێ ببەخشێ، هەڵبەتە تەقواش پلە پلەیەو هەر (یەك) پلە نیە.

**سێیەم:** لە گرنگیی و بایەخەكانی تەزكیەی نەفس، ئەوەیە كە بەبێ تەزكیەی نەفس، ئینسان لەخۆی حاڵی نابێ: لە ڕووی عەقڵییەوە، لەڕووی ڕووح و

..........................................

(١) (لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلَا صُورَةٌ ) أخرجه أحمد برقم (١٦٣٩١)، والبخاري برقم (٣٠٥٣) ، ومسلم برقم (٢١٠٦) ، والترمذي برقم (٢٨٠٤) وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى برقم (٩٧٧١)، وأبن ماجه برقم (٣٦٤٩).

نەفسەوە، لە ڕووی دڵ و دەروونەوە، واتە: شارەزا نابێ لە دیوە پەنهانەكانی ڕووح و نەفس و دڵی خۆی، وەك لە دواییدا بە پشتیوانی خوای كاربەجێ باسی دەكەین.

**چوارەم:** بەبێ تەزكیەی نەفس، ئیمانی مرۆڤ نابێتە ئیمانێكی (شهودیی)، ئیمانێك كە تام و چێژ لەخوا پەرستی بكەی، ئیمانێك كە بەچاوی عەقڵ و دڵ خوای پەروەردگار ببینی و، چاودێریی خوا بەسەر خۆتەوە ببینی، لە ڕاستیدا تەنیا بەهۆی تەزكیەی نەفسەوە ئیمان ئاوا قووڵ دەبێتەوەو، لە حاڵەتێكی ڕواڵەتییەوە، دەبێتە حاڵەتێكی دەروونیی، وە لە حاڵەتێكی ڕووكەشییەوە، دەبێتە حاڵەتێكی شهوودیی چێژداریی (ذوقي)، وەك ئەهلی عیرفان ئەو زاراوەیان بەكار هێناوە.

**پێنجەم:** بەبێ تەزكیەی نەفس، ئینسان جەستەو ئەندامەكانی جەستەی و دەرو دەروونی خۆی، بۆ كۆنترۆڵ ناكرێ، كە تووشی سەرپێچیی و گوناهو تاوان نەبێ، چونكە ئینسان تاكو زیاتر خۆی تەزكیە بكاو باشتر نەفسەكەی پاك و چاك بێ، زیاتر دەستەڵاتی بەسەر پەنهان و ڕواڵەتی خۆیدا دەبێ، زیاتر دەستەڵاتی بەسەر دەرو دەروونی خۆیدا دەبێ، كە تووشی گوناهو تاوان نەبێ، چ گوناهو تاوانە دیارو ئاشكرایەكان، چ گوناهە شێرراوەو پەنهانەكان، وەك خوای پەنهانزان دەفەرموێ:

﴿وَذَرُوا۟ ظَـٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ۚ ﴿١٢٠﴾﴾ الأنعام.

واتە: وە واز لە گوناهی ئاشكراو پەنهان بێنن.

**شەشەم:** بەبێ تەزكیەی نەفس، مرۆڤ ناتوانێ بەهاو ڕەوشتە بەرزەكان لەخۆیدا بهێنێتە دی و، خۆییان پێ بڕازێنێتەوە، وەك: ڕاست بێژیی، ئەمانەت، بەزەیی، دادگەریی، ئارام گرتن و ...سەرجەم سیفەتە بەرزو جوانەكان، وە هەروەها ناشتوانێ سیفەتە نزم و پەستەكان لەخۆی دابڕنێ و خۆییان لێ بژار بكا، وەك: درۆ، غەیبەت، دڵ ڕەقیی، خۆ بەزل گریی، حەسەدو هەموو

ئەو سیفەتە خراپانەی دیکە چ پەیوەندییان بەدەروونی ئینسانەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە دەرو ڕواڵەتی ئینسانەوە هەبێ.

**حەوتەم:** بەبێ نەفس تەزکیە بوون، مرۆڤ لەززەت و چێژ لە خوا پەرستییەکان وەناگرێ و لەززەت لە تاعەت وەرناگرێ، وە پاشان ئەرکە شەرعییەکانی بە لەش سووکیی و گورج و گۆڵیی بۆ ئەنجام نادرێن، بەبەڵگەی ئەوە کە خوای تاك و پاك کاتێ باسی مونافیقەکان دەکات، دەفەرموێ:

﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ١٤٢﴾ النساء.

واتە: کاتێ بۆ نوێژ هەڵدەستن، بە تەنبەڵیی هەڵدەستن، وە ڕیا بازیی بۆ خەڵك دەکەن، وە بەکەمیی نەبێ، یادی خوا ناکەن.

**هەشتەم:** بەبێ نەفس تەزکیە بوون، ئینسان لە ناکۆکیی و دووبەرەکیی بێجێ لەگەڵ خەڵکدا، پارێزراو نابێ، لەو بارەوە عەبدولقادری گەیلانیی ڕەحمەتی خوای لێبێ قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ: (كُنْ مَعَ الحَقِّ بِلا خَلْق، وَمَعَ الخَلْقِ بِلا نَفْس)، واتە: لەگەڵ خوا دابە بەبێ خەڵك، وە لەگەڵ خەڵك دابە بەبێ نەفس، واتە: کاتێك مامەڵە لەگەڵ خوادا دەکەی، ڕەچاوی خەڵك مەکە، نوێژ دەکەی، ڕۆژوو دەگری، جیهاد دەکەی، ماڵ دەبەخشی، فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپە دەکەی، هەر چیەکی بۆ خوا ئەنجام دەدەی و، کاتێ ئەرکە شەرعییەکان ئەنجام دەدەی، ڕەچاوی خەڵك مەکە، داخۆ دەڵێن چی؟ پێیان خۆشە یاخود نا؟ تەماشات دەکەن یاخود نا؟ مەدحت دەکەن، یان زەمت دەکەن؟ حەقت بەسەر خەڵکەوە نەبێ، لە پەیوەندییت لەگەڵ خوادا، خەڵك مەهێنە نێوان، (وَمَعَ الخَلْقِ بِلا نَفْس)، وە لەپەیوەندییت لەگەل خەڵکدا، نەفس مەهێنە نێوان، بەنەفس و سیفەتە خراپەکانی نەفس، لەگەڵ خەڵکدا مامەڵە مەکەن.

بەڵێ ئەگەر ئینسان زۆر کار لەسەر دەروونی خۆی بکات و خۆی پاك و چاك بکا، لە زۆر تێکگیران و مشت و مڕ لەگەڵ خەڵکیدا دەپارێزرێ، ئەوەی من

بە ئەزموون بۆم دەركەوتوە، ئەوەیە كە مرۆڤ لە ئەنجامی ئەوەدا كە گومانی خراپی هەیە، ڕق و كینەی هەیە، حەسەدی هەیە، خۆ بەزلگریی هەیە، سەرسام بوون بەخۆی (عُجْب)ی هەیە، سیفەتە خراپەكانی دیكەی هەن، لە ئەنجامی ئەوەدا، لەگەڵ خەڵكدا تێك دەگیرێ، گومانی خراپ بەخەڵك دەبا، حەسەدیان لەگەڵ بەكار دێنێ، خۆییان بەسەردا هەڵدەكێشێ، غەیبەتیان دەكا، دەیانبوغزێنێ، سەرەنجام: لەگەڵیان تووشی مشت و مڕی بێجێ دەبێ، بەڵام ئەگەر ئینسان نەفسەكەی خۆی پاك و چاك بكاو، لەو سیفەتە خراپانە بژاری بكا، وە بە سیفەتە باشەكان بیڕازێنێتەوە، دەتوانێ خۆی لە ناكۆكیی و دوو بەرەكیی و تێكگیرانی بێجێ بپارێزێ، ئەگەر نا تێك گیرانی بەجێش هەیە، ئەویش ئەوەیە كە لەبەر ئەوە تۆ مسوڵمانی و دینداری، ڕەخنەت لێدەگرێ و دژایەتییت دەكا، ئەوە چارەی ناكرێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمَا نَقَمُوا⁽¹⁾ مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿٨﴾ ﴾ البروج.

واتە: وە هیچیان لێ بەڕەخنە نەگرتن، جگە لەوەی بڕوایان بەخوای زاڵی ستایشكراو هێنا. ئینسان ناتوانێ خۆی وا لێبكا، هەموو كەس خۆشی بوێ، بەڵام دەتوانی خۆت وا لێبكەی، خەڵك ڕەخنەو گلەیی شەرعیی لەتۆ نەگرێ.

**نۆیەم:** بەبێ تەزكیەی نەفس، ئینسان لە نەخۆشی دەروونیی و جەستەیی سەلامەت نابێ، ئێستا پزیشكەكان بۆیان دەركەوتوە، زۆر لە نەخۆشییە جەستەییەكان، دەرهاویشتەو ڕەنگدانەوەی نەخۆشییە دەروونییەكانە، ئەوانەی زوو تووڕە دەبن و، زوو هەڵدەچن و كینەیان هەیەو، بوغزیان هەیە، گومانی خراپیان هەیەو، دڵیان نائاسوودەیە، لە مامەڵە كردن لەگەڵ خەڵكدا، ئەوە دوایی لێیان دەبێتە نەخۆشی گەدەو، دوازدە گرێ و، فشاری خوێن و، شەكرەو...هتد، كەواتە: ئینسان بەهۆی نەفس تەزكیە بوونەوە، بەهۆی دەروون پاك بوونەوە، ئینسان لە نەخۆشی دەروونیی و، لە زۆر لە نەخۆشییە جەستەییەكان دەپارێزرێ.

.......................................

(١) نَقَمَ عليه فهو ناقِمٌ أي: عَتَبَ عَلَيْه... وَنَقَمَ الأَمْرَ: كَرِهَهُ. مختار الصحاح، ص ٥٨٢.

**دەیەم:** بەبێ نەفسی تەزكیە كراو، مرۆڤ ناتوانێ مافی دەورو بەری خۆی بدا، لە دایك و باب و خێزان و، خزم و دۆست و برادەرەكانی، بۆیە: هەندێ لە ئەهلی عیرفان و تەزكیە گوتوویانە: (التَّصوُّف خُلُقٌ، فَمَن زادَ عَلَيْكَ فِي الخُلُقِ، زادَ عَلَيْكَ فِي التَّصوُّفِ) واتە: تەصەووف: بریتیە لە ڕەوشت و ئاكاری بەرزو پەسندو جوان، هەر كەسێ ڕەوشت و ئاكاری لە تۆ جوانتر بێ تەصەووف و تەزكییەی لەتۆ زیاترە، با ئەو ناوەشی لەخۆی نەنابێ.

خوای پەروەردگار بە لوتف و كەڕەمی خۆی ئێمە وا لێبكا، كە بەهۆی نەفس تەزكیە بوونمانەوە، هەموو ئەو بەرهەم و دەستكەوتانەمان بۆ دەستەبەر ببن.



# ٧ تەزكيە يەكێكە لە چوار ئەركە سەرەكييەكانی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم)

ئەم باسەشمان هەر تەواوكەری بابەتی پێشوویە، كە بریتیە لەوە: ئایا تەزكیەی نەفس چ پێگەیەكی هەیە لە ئیسلامدا؟ تەزكیە، واتە: تەزكیە كردنی خەڵك، یەكێكە لەچوار ئەركە سەرەكییەكانی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم)و ئەم ڕاستییە لە چوار ئایەت لە ئایەتە موبارەكەكانی قورئاندا هاتوە، كە ئەمانەن:

١- لە ئایەتی ژمارە (١٠٩)ی سوورەتی (البقرة)دا، پێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام لە خوای پەروەردگار دەپاڕێتەوە، وەك خوای زانا بۆمان باس دەكات و دەفەرموێ:

﴿ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٢٩ ﴾

واتە: پەروەردگارمان! وە لەنێویاندا، (واتە: لەنێو وەچەی مندا، یان لەنێو ئەوانەدا كە من بۆیان ڕەوانە كراوم، كە ئیبراهیم علیه الصلاة والسلام پێغەمبەرێكی گشتگیر بووەو تەنها بۆ گەلێك نەهاتوە، لە عێراق بووە، لەشام بووە، چۆتە میصر، لەحیجاز بووە)، پێغەمبەرێك ڕەوان بكە، كە ئایەتەكانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە، وە كتێبیان فێربكاو حیكمەتیان فێر بكا، وە تەزكیەیان بكا، بێگومان هەر تۆی زاڵی كاربەجێ.

٢- هەر لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (١٥١)دا، خوا سبحانە و تعالی ڕووی دواندن لە ئیمانداران دەكاو دە فەرمویٚ:

﴿ كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمۡ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ١٥١ ﴾

واتە: ئیٚمە چاكەمان لەگەڵ ئیٚوەدا كردوە، وەك چۆن پیٚغەمبەریٚكمان لە خۆتان لەنیٚوتان دا بۆ ڕەوانەكردوون، ئایەتەكانی ئیٚمەتان بەسەردا دەخویٚنیٚتەوە، وە تەزكیەتان دەكاو، كتیٚب و حیكمەتتان فیٚر دەكا، وە ئەوەتان فیٚر دەكا كە پیٚشتر نەتان دەزانی.

٣- شویٚنی سیٚیەم ئایەتی (١٦٤)ی (آل عمران)ە، كە خوا دەفەرمویٚ:

﴿ لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ١٦٤ ﴾

واتە: بیٚگومان خوا چاكەی لەگەڵ ئیمانداراندا كردوە، كە لەخۆیان (واتە: لە نەفسی خۆیان) پیٚغەمبەریٚكی بۆ ڕەوانە كردوون، كە ئایەتەكانی خوایان بەسەردا دەخویٚنیٚتەوە، وە تەزكیەیان دەكا، وە كتیٚب و حیكمەتیان فیٚر دەكا، وەبیٚگومان پیٚشتریش لە گومڕاییەكی ئاشكرادا بوون.

٤- شویٚنی چوارەم سوورەتی (الجمعة)یە، ئایەتی ژمارە (٢)، كە دەفەرمویٚ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٢ ﴾

واتە: خوا ئەو كەسەیە كە لەنیٚو نەشارەزایەكاندا (واتە: ئەوانە شارەزای شەریعەت و كتیٚبەكانی خوا نەبوون) پیٚغەمبەریٚكی لە خۆیان بۆ ڕەوانە كردوون، كە ئایەتەكانی خوایان بەسەردا دەخویٚنیٚتەوە، وە تەزكیەیان دەكا، وە كتیٚب و حیكمەتیان فیٚر دەكا، وە بە دڵنیاییەوە پیٚشتریش لە گومڕاییەكی ئاشكرا دابوون.

كەواتە: پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم)، خوا چوار ئەركی بۆ دیاریی كردوون، كە لە نێو خەڵكدا ئەنجامیان بدا، واتە: لەنێو خەڵكی ئیمانداردا، دوای ئەوەی وەڵامی هیدایەتی خوا دەدەنەوەو بەدەم هیدایەتی خواوە دێن، یاخود لەنێو بەشەردا بەگشتی، چونكە موحەممەد (صلی اللە علیە وسلم) كۆتا پێغەمبەری خوایەو، ئەو چوار ئەركە لەنێو ئینسانەكاندا جێ بەجێ دەكات.

ئنجا با جارێكی دیكە سەرنجی ئەو چوار ئەركە مەزنەی پێغەمبەری خاتەم (صلی اللە علیە وسلم) بدەین:

**یەكەم:** (يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ) ئایەتەكانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە واتە: قورئان.

**دووەم:** (وَيُزَكِّيهِمۡ) تەزكیەیان دەكا، واتە: پاك و چاكیان دەكا، نەفسیان گەشە پێدەدا، نەفسیان پاك دەكاتەوەو، بژاری دەكا لە سیفەتە خراپەكان، وەدەیڕازێنێتەوە بە سیفەتە چاكەكان.

**سێیەم:** (وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ)، ئەركی سێیەمی پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) ئەوەیە كە كتێب فێری بەشەر دەكا، یا فێری ئۆممەتەكەی دەكا.

**چوارەم:** (وَٱلۡحِكۡمَةَ)، وە حیكمەتیان فێر دەكا.

## لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش، ئایا خوێندنەوەی كتێبی خوا، لەگەڵ فێر كردنی كتێب و حیكمەت، هەر یەك نیە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، هەڵبەتە هەندێك لە زانایان وایان لێكداوەتەوە كە (وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ) واتە: قورئانیان فێر دەكا، (وَٱلۡحِكۡمَةَ)ش واتە: سوننەتیان فێر دەكا، بەڵام وەك من لەچەند كتێبێكی خۆمدا باسم كردوەو، لێرەشدا دووبارەی دەكەمەوە: لێرەدا نە مەبەست لە (ٱلۡكِتَٰبَ) قورئانەو نەمەبەستیش لە (وَٱلۡحِكۡمَةَ) سوننەتی پێغەمبەرە (صلی اللە علیە وسلم)، بەڵكو مەبەست لەو چوار وشەیە (بەبۆچوونی بەندە) ئاوایە:

١- سەرەتا یەكەم ئەركی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەیە: (يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ) ئایەتەكانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە، ئەو (٦٢٢٣) ئایەتە یان ئەو شەش هەزارو شەش سەدو ئەوەندە ئایەتە كە لە (١١٤) سوورەتی قورئاندا خۆیان دەبیننەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەسەر بەشەردا، بەسەر مرۆڤایەتییدا، وە بەسەر مسوڵمانان و بەسەر ئۆممەتەكەیدا، لەڕێی هاوەڵانی بەڕێزیەوە خوێندوونیەوە، كەواتە: ئەوە قورئان.

٢- مەبەستیش لە (وَيُزَكِّيهِمۡ) ئەوە دیارە واتە: پاكیان دەكاتەوە لە سیفەتە خراپەكان، كە پێشتریش باسمان كرد، خراپترین سیفەتی خراپ شیركە، دوای ئەوە زوڵمە، ئنجا دوایی سیفەتەكانی دیكەن، وە باشترین سیفەتی چاك كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەفسی ئەوانەی پێ دەڕازێنێتەوە، كە ئایەتەكانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە، بریتیە لە: خوا بەیەكگرتن (توحید الله) كە كاكڵی ئیمانە، وە پاشان بریتییە لە دادگەریی، پاشان هەموو سیفەتەكانی دیكە لە ڕاستیی و ئەمانەت و زانیاریی و بەزەیی و چاكەكاریی و خۆبەكەمگریی و بەخشندەیی و ئازایەتیی و ..هتد.

٣- ئەدی مەبەست لە: (وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ) چییە؟

من وای تێدەگەم -كە دیارە هەندێ لە زانایانیش هەمان ڕایان هەیە- لێرەدا مەبەست لە (ٱلۡكِتَٰبَ) قورئان نیە، بەڵكو مەبەست پێی شەریعەتە، واتە: یاساكانی، كە ژیانی كۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسیی كۆمەڵگا ڕێك دەخەن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دوای ئەوەی ئایەتەكانی خوا بەسەر خەڵكیدا دەخوێنێتەوە، وە خەڵك ئیمان دێنن و مسوڵمان دەبن و دێنە نێو ئیسلامەوە، ئنجا پڕۆسەی پاك كردن و، چاك كردن و، گەشە پێدانیان لەگەڵدا ئەنجام دەدا، دوای ئەوە: پڕۆسەی ڕێكخستنی ژیانی كۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسییان لەگەڵ ئەنجام دەدا، بە یاساكانی شەریعەت، كەواتە: مەبەست لە (ٱلۡكِتَٰبَ) واتە: شەریعەت و ئەو یاسایانەی كە ژیانی كۆمەڵگا لەهەموو بوارەكانداو لە هەموو ڕەهەندەكانەوە، ڕێك دەخەن.

٤- ئەدى مەبەست لە (وَٱلْحِكْمَةَ ) چییە؟
مەبەست لە حیكمەت واتە: ئەو ئەدەب و بەها بەرزو سیفەتە پاك و چاكانەی كەدەبێ كۆمەڵگا خۆیانیان پێ برازێنێتەوە، ئنجا ئایا لێرەدا كە دەڵێین: (ٱلْكِتَٰبَ ) و (وَٱلْحِكْمَةَ ) قورئان و سوننەت نین، بەڵكو حیكمەت لە قورئانیش وەردەگیرێ، وە لە سوننەتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وەردەگیرێ، بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە؟

**یـەك:** بەڵگەمان ئەوەیە كە: خوا سبحانە و تعالى باسی حیكمەت دەكا، لەسوورەتی (البقرة)داو دەفەرموێ:

﴿ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾ ﴾ البقرة.

واتە: هەركەسێ حیكمەتی پێ بدرێ، ئەوە خێرێكی زۆری پێدراوەو چاكەیەكی گەورەی لەگەڵ كراوە، كەواتە: دەگونجێ غەیری پێغەمبەرانیش علیهم الصلاە والسلام حیكمەتیان پێ بدرێ، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (لقمان)دا دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ ﴾ لقمان.

واتە: حیكمەتمان بە لوقمان بەخشیبوو، كە سوپاسی خوا بكە، وە هەر كەسێك سوپاس -ی خوا- بكات، ئەوە بۆخۆی لەو سوپاسكردنە بەهرەمەندە، وە هەركەسێكیش سپڵە بێ، بە دڵنیاییەوە خوا بێنیازی ستایش كراوە.

دیارە لوقمانیش لەسەر ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان پێغەمبەر نەبووە، كەواتە: حیكمەت یانی: وەستایی و دانایی و كارامەیی، یاخود: خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە جوانەكان و، خۆ دارنین لە سیفەتە خراپەكان.

**دوو:** بەڵگەیەكی دیكەی بەهێزمان لەسەر ئەوە كە حیكمەت واتە: وەستایی و دانایی و كارامەیی و بەها پەسندەكان، ئەوەیە كە خوا سبحانە و تعالى لە

سوورەتی (الإسراء)دا لە درێژەی شازدە (١٦) ئایەت دا، كە لە ئایەتی (٢٣) ەوەن تاكو ئایەتی (٣٨)، باسی دوازدە (١٢) سیفەتی خراپ دەكات كە دەبێ خۆیان لێ دوور بگیرێ، وەك: هاوبەش بۆ خوا دانان، هێشاندنی دڵی دایك و باب، دەست قووچاندن لە بەخشین، فیزو كەشخە نواندن بەسەر خەڵكدا، زینا، منداڵی خۆ كوشتن لەترسی برسیەتی، بەبێ زانیاریی شوێن كەوتنی شت، ...هتد، وە باسی دوازدە (١٢) سیفەتی باشیش دەكا وەك: تەنیا خوا پەرستن، چاكە لەگەڵ دایك و بابدا كردن و ڕێز لێگرتنیان، بەخشندەیی، كێشان و پێوانی تەواو...هتد، دوایی دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ۗ ﴿٣٩﴾ ﴾

واتە: ئەوە ئەو حیكمەتەیە كە پەروەردگارت بۆی ناردووی، حیكمەتەكەش بریتیە لە: خۆ دورگرتن لەو سیفەت و ئاكارو خوو خدە خراپانەی كە گیاكەڵەو ماك و میكرۆبی ژیانی ئینسانن، بەتاك و كۆمەڵگاوە، وە بە پێچەوانەشەوە: خۆڕازاندنەوە بەسیفەتە جوانەكان، كە كۆمەڵگا گەشە پێدەدەن و، جوانی دەكەن و، بەختەوەری دەكەن.

ئنجا بێگومان ئێمە بەهۆی سوننەتی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) دەستمان لە حیكمەت گیر دەبێ، خوای پەروەردگار لە سیاقێكدا كە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەدوێنێ لە سورەتی (الأحزاب) دا دەفەرموێ:

﴿ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: یادی ئەوە بكەن (ئەوە فێربن) كە لە ماڵەكانتاندا دەخوێندرێتەوە، لە كتێبی خواو لە حیكمەت، بێگومان سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە هەرسێ بەشەكەیەوە واتە: بەشی كردەیی، وە بەشی گوتەیی، وە بەشی دان پێ هێنان، چونكە سوننەت دەبێ بە سێ بەش:

**بەشی یەکەمی سوننەت: کردەوەکانی:** پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شتێكی ئەنجام داوە لە پێش چاوی هاوەڵانی وەك نوێژ، وەك فەرموویەتی:

(صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِي)، أخرجه أحمد برقم (١٥٦٣٦)، والبخاري برقم (٧٨٥). ومسلم برقم (٦٧٤)، والنسائي برقم (٦٣٥)، وابن حبان برقم (١٦٥٨).

واتە: نوێژ بكەن وەك چۆن منتان بینی نوێژم كرد، یان لە فەرموودەیەكی دیكەدا فەرموویەتی:

(خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ)، أخرجه الطبراني في الكبير كما في مجمع الزوائد (٢٦٩/٣)، وأخرجه أيضًا: في الأوسط برقم (١٩٢٩). قال الألباني صحيح.

واتە: خوا پەرستییەكانی حەجم لێ فێربن، هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كۆچی كردوە، جیهادی كردوە، فەرمان بەچاكەو نەهی لە خراپەی كردوە، صیلەی ڕەحمی جێبەجێ كردوە، لەگەڵ خاوو خێزان و دۆست و ڕەفیقان و خەڵكیدا، بە ڕەوشتی بەرز ڕەفتاری كردوە، ئەوە بەشی یەكەمی سوننەتی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) كە بریتی بوو لە كردەوەكانی ئاكارو ڕەفتارەكانی.

**بەشی دووەمی سوننەت: بریتیە لە فەرمایشتەکانی:**

ئەوەی كە بەفەرمایشت گوتوویەتی، بۆ وێنە، فەرموویەتی:

(إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ) أخرجه مالك برقم (٩٨٣)، وأحمد برقم (١٦٨)، والبخاري برقم (١)، ومسلم برقم (١٩٠٧)، والترمذي برقم (١٦٤٧)، وأبو داود برقم (٢٢٠١)، والنسائي برقم (٣٤٣٧)، وابن ماجه برقم (٤٢٢٧)، والبيهقي برقم (١٨١)، والطبراني في الأوسط برقم (٤٠)، والدارقطني (٥٠/١)، والبزار برقم (٢٥٧)، والبيهقي في الزهد برقم (٢٤١)، والديلمي برقم (٤٠١)، وابن حبان برقم (٣٨٨).

واتە: كردەوە -باشە- كان بە گوێرەی نیەتەكان وەردەگیرێن.

یان فەرموویەتی:

(وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَاليَومِ الآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ)، أخرجه البخاري: برقم (٥٦٧٢) ومسلم برقم: (٤٧).

واتە: وە هەركەسێ ئیمانی بە خواو بەرۆژی دوایی هەیە، ئەگەر قسەی باش دەكات، ئەگەر نا با بێدەنگ بێ.

**بەشی سێیەمی سوننەت:** بریتیە لەو شتانەی كە لەبەر چاوی ئەو كراون، یان بیستوویەتی كە ئەنجام دراون، ئەویش دانی پێدا هێناون: جاری وا هەبوو هاوەڵێك شتێكی كردوە یاخود شتێكی گوتوە، ئەویش دانی پێدا هێناوە، ئەمەش پێی دەگوترێ: (تقریر) مادام پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دانی پێدا هێنابێ ئەمیش دەچێتە چوار چێوەی سوننەتەوە، واتە: ئەوە شتێكی ڕەوایەو چاكە، بۆ وێنە: ئەو سریەیەی كە عەمرِی كوڕی عاص فەرماندەیان بوو، لە ڕێگادا عەمر ئیحتیلامی بوو، دوایی پێش نوێژیشی بۆ كردن بەبێ ئەوەی خۆی بشوا، بەڵكو تەیەمومی كرد، كە گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) هەواڵیان پێدا، پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) فەرمووی: ئایا پێش نوێژییت بۆ كردن، بێ ئەوەی خۆت بشۆی؟

ئەویش گوتی: بەڵێ، لە خوای پەروەردگارم بیستبوو كە دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ٢٩﴾ النساء.

واتە: خۆتان مەكوژن خوا لەگەڵتان بەبەزەییە، (كاتەكەشی زۆر سادر بووەو دیارە ئاویشیان بۆ گەرم نەكراوەو ترساوە لەوەی ئەگەر خۆی بشوات بمرێ) بۆیە منیش تەیەمومم كرد، پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) پێكەنی و هیچی نەفەرموو، ئەمەش یانی: پشتگیریی هەڵوێستەكەی عەمرِی كوڕی عاصی كرد، كە پێكاویەتی لەوەدا كە لەجیاتی خۆ شۆردن، تەیەمومی كردوەو دەستی بە ڕووی زەویدا هێناوەو، دەم و چاوو هەردو دەستی خۆی پێ مەسح كردوە.

ئنجا بێگومان بە هۆی سوننەت و تێگەیشتنی ڕێبازی پێغەمبەرەوە (صلى الله علیه وسلم) دەستمان لە گەورەترین و چاكترین حیكمەت گیر دەبێ، بەڵام حیكمەت وەك چۆن لە سوننەتدا هەیە، لە قورئانیشدا هەیە، بەڵكو ئەو

حیكمەتەی لە فەرمایشتی خوادا هەیە لە سوننەتداو لە هیچ شتێكی دیكەشدا نیە، بگرە پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) هەر لە قورئانەوە فێری حیكمەت بووە! ئەوەتا خوای كار بەجێ دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ ﴿٣٩﴾ ﴾

واتە: ئەوە ئەو حیكمەتەیە كە خوا بۆی ناردووی، كەواتە: حیكمەت واتە ڕەفتار كردن بە شێوەیەك كە جێگای ڕەزامەندیی خوا بێ، وە دووركەوتنەوە لە كارێك كە جێگای ناپەسندیی خوابێ.

ئنجا كۆتایی ئەو بابەتە بەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دێنم كە پێشتریش هێنام، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەخوا پاڕاوەتەوە بۆ ئەوەی نەفسی تەزكیە بكا، دەفەرموێ:

(اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا)(١).

واتە: ئەی خوایە! تەقوا بە نەفسم ببەخشە، وە پاكی بكەوەو چاكی بكەو گەشەی پێ بدە، تۆ چاكترین كەسی، كە نەفس پاك دەكاو چاك دەكاو گەشەی پێدەدا، تۆ سەر پەرشتیارو مشور خۆری نەفسی منی. لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە كە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەخوا دەپاڕێتەوە هاوكاریی بكا، چونكە خوا سبحانه و تعالی بێ ئەوەی كە ئینسان هەوڵ بداو كردو كۆشش بكا، شتەكانی بۆ ئەنجام نادا، ئاخر خوا سبحانه و تعالی لەم سەر زەوییە تەنبەڵ خانەی دانەناوە: هەر شتێكت ویست لە خوای داوا بكەی، بەڵام بۆخۆت هیچ نەكەی، چونكە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ النجم.

واتە: ئینسان هیچ شتێكی دەستگیر نابێ و هیچ بەرهەمی نابێ، مەگەر ئەوەی بۆخۆی هەوڵ بدا، دەبێ بۆخۆی هەوڵ بداو كۆشش بكا، بەڵام لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ كە: تەنیا هەوڵ دان و كۆشش كردنی ئینسان بەس نیە،

(١) پێشتر (تخریج) كراوە.

بەڵكو دەبێ خوا هاوكارت بێ و ئاسانكارت بێ، بۆ ئەوەی بەسەر نەفسی خۆتدا زاڵ بی، وە نەفسەكەت هەوڵ بدەی تەقوای تێدا جێگیر بكەی، دوای ئەوەی كە پاك دەبێ و چاك دەبێ و گەشە دەكا، چونكە لە ئەنجامی تەزكیە بوونی نەفسدا، تەقوا دەبێتە میوانی نەفس و، لە نەفسدا جێگیرو سەقامگیر دەبێ، وە بێگومان هەر خوای پەروەردگاریش سەرپەرشتیارو مشورخۆری نەفسەكانە، هەر خوا خاوەنیانەو، بە نهێنییەكانیان ئاگادارە، بۆیە دەبێ هەمیشە ئینسان پەنا بۆخوا بەرێ و، داوا لەخوا بكا كە یارمەتی بدا: نەفسەكەی پاك و چاك بكا، بۆ ئەوەی شایستەی ئەوەبێ كە بەتەقوا بڕازێتەوە، كە دیارە تەقواش كۆكەرەوەی هەموو سیفەتە بەرزو چاكەكانە.



# ٨ قورئان بناغەی پڕۆسەی تەزکیەی نەفسە

دیارە مەبەستیشم لە جەخت کردنەوە لەو مەسەلەیە -کە پێشتریش ئاماژەمان پێداوە - ئەوەیە کە هەندێ کەس لەوانەی بە ناشارەزایی خۆیان بە ئەهلی تەریقەت و تەصەووف دەزانن، پێیان وایە کە ئینسان بەبێ شارەزاییش لە قورئان و سوننەت، دەگونجێ کە قۆناغەکانی تەزکیەی نەفس و صالح بوون و بەرەو خوا چوون ببڕێ! بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە خەیاڵ پڵاوەو قورئان بناغەی پڕۆسەی تەزکیەی نەفسەو، بەبێ پابەندیی بە قورئانەوەو بەبێ تێگەیشتن لە قورئان و، بەبێ لەبەر ڕۆشنایی قورئان دا هەنگاو نان، ناگونجێ مرۆڤ دەستی بگاتە ئامانجی بەرزی: نەفس تەزکیە بوون، ئنجا کە دەشلێین قورئان واتە: سوننەتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)، چونکە قورئان مەتنی ئیسلامە، وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) جگە لە قورئان شتێکی دیکەی پێ نەبووە بۆ هیدایەت دانی خەڵك، یاخود بۆ تێگەیاندنی خەڵك لە ئیسلام و، خەڵك فێری دینداریی کردن.

ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوەی کە قورئان بناغەی پڕۆسەی تەزکیەی نەفسە؟

## لەو بارەوە چوار بەڵگان دەهێنینەوە :

### بەڵگەی یەكەم:

قورئان بناغەو مەتنی ئیسلامەو هیچ گومانی تێدا نیە كە قورئان هەناوو كاكڵی ئیسلامە، چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەر قورئانی لەخواوە بۆ هاتوە، دوا نوسخەی هیدایەتی خوا تەنها هەر قورئانە، وە سوننەتی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) هەر پەیڕەو كردنی قورئانە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەبەر رۆشنایی قورئاندا هەنگاوی ناوە، بۆیە قورئان و سوننەت، دوو شتی لێك جیانین، بەڵكو قورئان هەناوی سوننەتە، وە سوننەت بریتیە لە شێوەی جێبەجێكردنی قورئان و بەرجەستە كردنی لە دنیای واقیعدا، ئنجا مادام قورئان بناغەو مەتنی ئیسلام بێ، وە تەزكیەش بەشێكی ئیسلامە، كەواتە: دەبێ قورئان بناغەو بنچینەی ئەنجامدانی پرۆسەی تەزكیەی نەفس بێ.

### بەڵگەی دووەم:

لە هەركام لەو چوار ئایەتەدا كە پێشتر هێنامانن، دوو ئایەتەكەی سوورەتی (البقرة)و ئایەتەكەی سوورەتی (آل عمران) و ئایەتەكەی سوورەتی (الجمعة)، لە ریز بەندیی چوار ئەركەكەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) كە بریتین لە:

١- خوێندنەوەی ئایـەتەكانی خوا.
٢- تەزكیـە كردن.
٣- فێر كردنـی كیتاب.
٤-فێركردنی حیكمەت.

لە هەر چواریاندا خوێندنەوەی ئایەتەكانی خوا پێشخراوە:

﴿يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ ﴿١٢٩﴾﴾ البـقرة، كـەواتـە: سـەرەتـای دینـداریی كـردن و مسوڵمانەتیی كردن و، بناغەی مسوڵمانەتیی و دینداریی بە گشتی، وە لە نێویشیان

تەزكیەی نەفس، دەبێ لەبەر ڕۆشنایی ئایەتەكانی قورئان دابێ، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە كە وشەی ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾ لە سێ شوێناندا پێش خراوە، واتە: ﴿يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ ﴿١٢٩﴾﴾ باسی تەزكیە كراوە، لە پێش فێركردنی كیتاب و حیكمەتەوە، بەڵام لەیەك شوێندا كە لە سوورەتی (البقرة)یە، تەزكیە دوا خراوە، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ كە خوێندنەوەی ئایەتەكان هەر دەبێ بەردی بناغە بێ و لە پێشەوە بێ، یانی: دوای ئەوەی كە نەفس تەزكیە دەبێ، بەهۆی خوێندنەوەی ئایەتەكانی قورئانەوەو، كارلێك كردن لەگەڵیاندا، ئنجا دەگونجێ ئینسان فێری یاساكانی شەریعەت بێ، وە فێری بەها بەرزەكانی شەریعەت بێ، بەڵام ئەو دووانە واتە: تەزكیە بوون و، فێربوون و شارەزا بوون لە شەریعەت و، بەها بەرزەكان، كاریگەرییان لەسەر یەكدی هەیە، وە دەگونجێ پاش و پێش بكەن، بەڵام هیچ كاتێك ناگونجێ، بەبێ ئایەتەكانی قورئان و بەبێ شارەزایی لە قورئان، هیچ كارێكی دینداریی و هیچ پرۆسەیەكی دینداریی ئەنجام بدرێ، نە تەزكیەی نەفس و، نە هیچ شتێكی دیكە.

## بەڵگەی سێیەم:

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جگە لە قورئان شتێكی دیكەی پێ نەبووە، وەك پێشتریش باسمان كرد، وە خوای پەروەردگاریش لەسوورەتی (الشوری)دا دەفەرموێ:

﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾﴾ الشوری.

(پێشێ باسی چۆنیەتی ناردنی وەحی خۆی بۆ هەموو پێغەمبەران دەكا (علیهم الصلاة والسلام) دوایی دەفەرموێ:) ئاوا بەو شێوەیە ڕووحێكمان لەلایەن خۆمانەوە بۆتۆ نارد، تۆ پێشتر نەتدەزانی نە كیتاب چییەو نە ئیمانیش چییە، بەڵام ئێمە ئەو وەحییەمان كردە ڕۆشناییەك، هەر كام لە بەندەكانمان بمانەوێ پێی ڕێنمایی

دەكەین، وە بێگومان تۆ (خەڵك) بەرەو ڕاستەڕێ ڕێنمایی دەكەی.

كەواتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وەك هیدایەتی خوا، تەنها قورئانی بۆ هاتوە، بەڵێ خوای زانا وەحی دیكەشی بۆ ناردوە، جگە لە قورئان و هەندێ تەفاصیلی دیكەی وەك سوننەت فەرمووە، بەڵام مەبەستم ئەوەیە كە وەك هیدایەتێكی ڕاستەوخۆی خوای پەروەردگار، كە بە ئێمەی پێشان بدات، وەك فەرمایشتی خوا، تەنیا قورئانی لەبەر دەستدا بووە، وە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم): چ بۆ فێركردنی ئیمان و عەقیدە، چ بۆ فێركردنی حەڵاڵ و حەڕام، چ بۆ فێركردنی تەزكیەی نەفس، چ بۆ فێركردنی ئەخلاق، چ بۆ فێركردنی دروشمەكانی عیبادەت، چ بۆ فێركردنی جەنگ و جیهاد، چ بۆ فێركردنی چۆنیەتی وڵات بەڕێوە بردن، تەنیا قورئانی پێبووە، بۆیە وەك چۆن قورئان بناغەی دینداریە بە گشتی بەهەموو ڕەهەندو لایەنەكانیەوە، بەهەمان شێوە بناغەی پرۆسەی تەزكیەی نەفسیشە.

## بەڵگەی چوارەم:

بێگومان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خاوەنی پاكترین و چاكترین نەفس بووە، هیچ گومان لەوەدا نیە، وەخاوەنی بەرزترین ڕەوشت بووە، وەك خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم.

واتە: بێگومان تۆ لەسەر ڕەوشتێكی مەزنی، وە كاتێك پرسیار لە دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ كراوە، دەربارەی هەڵس و كەوت و ئاكارو ڕەوشتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گوتوویەتی:

(إِنَّ خُلُقَ نَبِيِّ اللهِ كانَ القُرْآن) أخرجه مسلم: ٧٤٦.

واتە: بێگومان ڕەوشتی پێغەمبەری خوا قورئان بووە، كەواتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خاوەنی بەرزترین ڕەوشت بووە، چونكە خوای پەروەردگار وا دەفەرموێ، وە ئەو ڕەوشتە بەرزو مەزنەشی، وەك دایكمان

عائیشه گوتوویەتی: لە قورئانەوە وەرگرتبوە، کەواتە: بەهۆی پابەندیی بە قورئانەوە، ئینسان دەتوانێ ڕەوشتی مەزن وەدەست بخا، ئاکاری جوان وەدەست بخا، کە لە ڕاستیدا هەر ئەوەش ئامانجی تەزکیەی نەفسە، ئامانجی تەزکیەی نەفس ئەوەیە ئینسان دەستی بگاتە بەهاو ڕەوشتە جوان و پەسندەکان و، خۆی دوور بگرێ لە خوو خدە نزم و خراپەکان، هەر بۆیەش پێشەوایانی تەزکیەی نەفس و عیرفان زۆر جەختیان لەوە کردۆتەوە، کە ئەو ڕێبازەی ئێمە واتە: ڕێبازی تەزکیەو بەرەو خوا چوون و صاڵح بوون، پابەندە بە قورئان و سوننەتەوەو لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا ئەنجام دەدرێ، بۆ نموونە: (سَهلُ التُّستُری) کە یەکێکە لە بۆخوا صوڵحاوان و، یەکێکە لە گەورە پیاوانی بواری تەزکیەی نەفس، دەڵێ:

(( بني أصول مذهبنا على ست:
١- التمسك بكتاب الله. ٢- والإقتداء بسنة رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم. ٣- وأكل الحلال. ٤- وعدم إيذاء الخلق ولو آذونا، ٥-والبعد عما نهى عنه الله. ٦-والتعجيل بالحقوق )) [1].

واتە: بنچینەکانی ئەم ڕێبازەی ئێمە، لەسەر شەش پایە بینا کراوە:

١- دەست گرتن بە کیتابی خوا. ٢- کردنە سەرمەشقی سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم). ٣- خواردنی حەڵاڵ، ٤- ئازار نەدانی خەڵك، با ئەوانیش ئازارمان بدەن (واتە: نابێ لە کاردانەوەشدا خەڵك ئازار بدەین، چ جای ئەوەی دەست پێشخەر بین بۆ ئازاردانی خەڵك)، ٥- خۆ دوور گرتن لەهەر شتێك کە خوا قەدەغەی کردوە، (چ لە بواری قسەو وتاردا، چ لە بواری کردارو ڕەفتاردا، چ لە بواری هەڵس و کەوتەکاندا، چ لە بواری عیبادەت و ڕەوشت و ئاکاردا، هەروەها لە بواری کەسابەتدا، لەبواری سیاسەتدا، هەرچی خوا قەدەغەی کردوە، خۆی لێ دوور بگری) ٦- پەلە کرن لە جێبەجێ کردنی مافەکاندا، (واتە: مافی خاوەن مافەکان پەلەی لێبکەی دەست و بردی لێبکەی، ئنجا هاوسەرتە، کوڕو کچتە، دایك و بابن، نەنك و باپیرن، خزمانن بە

(١) الرسالة القشيرية - ص ١٤٩.

گشتی، دراوسێن، ڕێبوارن، هەروەها کەسێك کە بەرپرسە بەرانبەر بەردەستەکانی خۆی، هەروەها ئەوان بەنیسبەت سەرەوەی خۆیان، مافەکان بۆ خاوەن مافەکان بە دەست و بردی جێ بەجێ بکرێن) ئەم شەش بنچینەیە سەهلی توستوریی دەڵێ: ئەو ڕێبازە کە لەسەری دەڕۆین بۆ تەزکیەی نەفس و صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، لەسەر ئەو شەش پایە بنیات نراوە، کە یەکەمیان: دەستگرتنە بە کتێبی خواوەو، دووەمیان: چاو لێکردن و دەست گرتنە بە سوننەتی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم).

بۆیەش لێرەدا دەڵێم: هەموو ئەوانەی لافی ئەوە لێدەدەن کە دەتوانن نەفسی خۆیان تەزکیە بکەن، یان توانیویانە نەفسی خۆیان تەزکیە بکەن، بەبێ شارەزایی لە قورئان و سوننەت، با خۆشیان بە شێخێکی گەورە بزانن، یان بە خەلیفەو کەسێکی بەرجەستە لەو بوارەدا، ئەوە بە دڵنیایی خەیاڵ پڵاویان کردوە، چونکە ئێمە بەهۆی وەحی خوای پەروەردگارەوە ڕاستییەکانمان بۆ دەردەکەون، وە دەبێ خوا سبحانه و تعالى پێمان بفەرموێ: چۆن بەندایەتیی بۆ بکەین؟ چۆن بیپەرستین و هەڵسوکەوت بکەین، چ لەگەڵ خۆیداو چ لەگەڵ بەندەکانیدا؟! کەواتە: بەبێ شارەزایی لە قورئان و سوننەت، بەبێ شارەزایی لە شەریعەت، ئینسان ناتوانێ بڵێ: من دەزانم خوای پەروەردگار فڵان شتەی پێ چاکە، چۆن دەزانی خوا ڕەزامەندیی لەسەر چییە؟ چۆن دەزانی کە خوا ئەو جۆرە پەرستشەی پێ چاکە؟ ئەو جۆرە هەڵس و کەوتەی پێ چاکە؟ بەتەئکید دەبێ بگەڕێیەوە بۆ وەحی خوا، وەحی خواش لە قورئاندا، پاشان لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بەرجەستەیە.

ئنجا من لێرەوە ئامۆژگاریی هەرکەسێ دەکەم، کە دەیەوێ لە بواری تەزکیەی نەفس و صاڵح بوون و بەرەو خوا چووندا، هەنگاو بنێ، با پێش ئەوە هەوڵ بدا لە قورئان و سوننەتدا شارەزا بێ، بەتایبەت قورئان، ئنجا دواییش ڕێبازو ڕێ و شوێنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کە وەك پێشتر گوتمان: ئەویش هەر بەرجەستەکەری قورئانە، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هیچ شتێکی نەکردوە، وە هیچ شتێکی نەفەرمووە، وە دانی بەهیچ شتێکدا

نەناوە، كە لەگەڵ قورئاندا نا سازگار بێ، بۆیە زۆر گرنگە وەك چۆن ئینسان گەر بیەوێ كەسابەتێك بكا، دەبێ هەوڵ بدا لە فیقهی كەسابەت شارەزا بێ، ئەوەی بیەوێ حەج و عومرە بكا، دەبێ هەوڵ بدا لە فیقهی حەج و عومرە شارەزا بێ، وە ئەگەر بیەوێ زەكات بدا، دەبێ هەوڵ بدا لە فیقهی زەكاتدا شارەزا بێ، وە ئەگەر بیەوێ نوێژ بكا، دەبێ هەوڵ بدا بزانێ نوێژ چۆن دەكرێ؟ دەبێ تەماشای قورئان و سوننەت بكاو تەماشای شەریعەت بكا، بەهەمان شێوەش: كەسێك بیەوێ بە مسوڵمانەتییەكی عادەتیی ئیكتیفا نەكاو، زیاتر بە دینداریی دا قووڵ بێتەوەو خوا پەرستیەكەی تۆخ بكاتەوەو بیەوێ لەخوا نزیكتر بێ و بۆ خوا صوڵحاوتر بێ، بەڕاستی دەبێ هەوڵ بدا هەرچی زیاتر لە قورئان و سوننەت شارەزا بێ، ئنجا هەر كەسێ بێ، دەبێ وابێ، بەتایبەت ئەگەر خۆی بە چاوساغ و مامۆستاو ڕێنماییكارێكی مسوڵمانان بزانێ، لە بواری تەزكیەی نەفسدا، ئەوە ئەگەر بۆ خەڵك پێویست بێ، بۆ ئەو حەوت جار پێویستە، چونكە كەسێك بۆخۆی بەرێیە نەزانێ و شارەزا نەبێ، بێگومان ناتوانێ ڕێنمایی خەڵك بكاو، خەڵك شارەزا بكا، ئەو شیعرەی ئیبن و لبەننای سەرقوسطي (إبن البنا السرقسطي) لە (المباحث الأصلية)دا چەند جوانە كە لەو بارەوە دەڵێ:

وَإِنَّمَا القَوْمُ مُسَافِرُونَ... لِحَضْرَةِ الْحَقِّ وَظَاعِنُونَ
فَافْتَقَرُوا فِيهِ إِلَى دَلِيلِ... ذِي بَصَرٍ بالسَّيْرِ وَالْمَقِيلِ
قَدْ سَلَكَ الطَّرِيقَ ثُمَّ عَادَ... لِيُخْبِرَ الْقَوْمَ بِمَا اسْتَفَادَ

واتە: ئەو كۆمەڵە (كە دەیانەوێ خۆیان تەزكیە بكەن و خۆیان صاڵحتر بكەن و زیاتر لەخوا نزیك بن، ئەوانە) ڕێبوارن بەرەو ڕەزامەندیی خوا، وەك بڵێی بارگەو بنەیان پێیەو لە هەندێ شوێن ڕایدەخەن و، لەهەندێ شوێن دەڕۆن، ئنجا بۆ ئەو سەفەری بەرەو خوا چوونەیان، پێویستیان بە ڕێنیشاندەرێك هەیە، كە شارەزا بێ كە لەكوێ بڕۆن، وە لەكوێش بارگەو بنە بخەن و پشوو بدەن، بابایەك كە ڕێگاكەی بڕیوەو چۆتە مەنزڵ، ئنجا گەڕاوەتەوەش، بۆ ئەوەی هەواڵ بدا بەو خەڵكە، بەوەی كە لەو ڕێ بڕینەدا لێی بەهرەمەند بووە، واتە: كەسێك كە دەبێتە

دەلیل و ڕێنیشاندەر بۆ كەسێك، دەبێ خۆی ئەو ڕێگایەی بڕیبێ و گەیبێتە مەنزڵ، ئنجا خەڵك لەگەڵ خۆی بەرێ، لەڕاستیدا كەسێك شارەزا نەبێ لە قورئان و سوننەت، لە شەریعەت: لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، لە ڕووی عیبادەتەوە، لە ڕووی ئەخلاق و ئاكارەوە، لە ڕووی حەڵاڵ و حەرامەوە، لەڕووی حوكم و سیاسەتەوە، لە هەموو بوارەكانی دینداریی شارەزا نەبێ، ناتوانێ دەستی خەڵك بگرێ و لەخوایان نزیك بخاتەوە، ئاخر ئەگەر بۆخۆی لە خوای تاك و پاك نزیك نەبێ، چۆن ئەوان نزیك دەخاتەوە؟ وەك بنچینەیەك هەیە دەڵێ: (فاقد الشيء لا يعطيه)، كەسێ شتێكی نەبێ، ناتوانێ بیبەخشێ، ئەوە بۆ هەموو كەس هەروایە، ئنجا كەسێكیش نەفسی خۆی پاك و چاك نەكردبێ، لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، وە بەهۆی پابەندیی بە شەریعەتەوە، بەتەئكید ناتوانێ خەڵك لە شتێك بەهرەمەند بكا كە خۆی نیەتی، ئەوە پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقە.

خوا بەلوتف و كەرەمی خۆی یارمەتیمان بدا كە لەهەر بوارێكی دینداریدا، ویستمان هەنگاو بنێین، پێشێ بزانین دین چی دەفەرموێ، شەریعەتی خوا چی دەفەرموێ؟ وەك خوا سبحانه و تعالی دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١﴾﴾ الحجرات.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هیچ شتێك پێش دەستی خواو پێغەمبەرەكەی نەخەن، یاخود خوێنراوەتەوە (لا تَقَدَّموا) واتە: بەپێش دەستی خواو پێغەمبەری خوا نەكەون، هەتا نەزانن ئەوان چییان فەرمووە، لەخۆڕا هەنگاو مەنێن، چ لە بواری تەزكیەدا، چ لەهەر بوارێكی دیكەدا، خوا لەو كەسانەمان بگێڕێ، كە شارەزا دەبن و، بەرچاو ڕوون دەبن، ئنجا هەنگاو دەنێن.




# تەزکیەی نەفس و ڕێبازەکانی تەصەووف لێك جیان

بێگومان شوێن کەوتنی پێشینی چاك (إتباع السلف الصالح) شتێکە، وە کەسێك کە ناو لەخۆی دەنێ سەلەفیی، شتێکی دیکەیە، کەسێك ئەگەر بە کردەوە بەدوای پێشینی چاك بکەوێ، ئەگەر ناویشی لەخۆی نەنابێ سەلەفیی ناو لەخۆ نەنانەکەی زیانی لێ نادات و، بەهۆی ئەوەوە کە ناوەکەی نیە، نێوەڕۆکەکەی لێ ون نەبووەو نێوەڕۆکەکەی لەدەست نەچووە، بەڵام ئەگەر سەد جار ناو لەخۆی بنێ سەلەفیی، بەڵام بە کردەوە لە ئیمان و عەقیدەیان، لە عیبادەتیان، لە هەڵس و کەوتیان، لە ئاکاریاندا، بەدوای پێشینی چاك نەکەوێ، بێگومان ناو لەخۆ نانەکە، هیچ شەفاعەتێکی بۆ ناکاو، هیچ بەهرەیەکی دەست ناخات، بەهەمان شێوەش لەبواری تەزکیەی نەفسدا، لەبواری چاك خوا پەرستندا، لەبواری خۆ پاك و چاك کردندا، ئەگەر ئینسان هەوڵ بدا، ئەو نێوەڕۆکەی بۆ پەیدا بێ، با شوێن کەوتووی ڕێبازێکی دیاریی کراوی تەزکیەش نەبێ، با پابەندی قوتابخانەیەکی دیاریکراوی تەصەووفیش نەبێ، زەرەری نەکردوەو ئەو نێوەڕۆکەی لەدەست نەچووە، بەهۆی ئەوەوە کە ئەو ناوەی لەخۆی نەناوە، بەڵام ئەگەر نێوەڕۆکەکەی نەبێ، پەنجا جار ئەو ناوە لەخۆی بنێ، بێگومان ناو لەخۆنان بەبێ نێوەڕۆك، هیچ دەستی ئینسان ناخاو شەفاعەتی بۆ ناکا، مەبەستم ئەوەیە کە هەندێ کەس هەر کات باسی تەزکیەی نەفس کراو، باسی لایەنی مەعنەویی لە دیندارییدا کراو، باسی صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون کرا، وە ئەو زاراوانە بەکار هاتن، پێی وایە: تۆ دەبێ حەتمەن پابەندو

شوێن كەوتووی یەكێ لە ڕێبازەكانی تەصەووف بی، قادریی بی، نەقشیی بی، شاذلیی بی، ڕیفاعیی بی، بەدەویی بی، ...هتد، بەڵام ئەو بۆچوونە ڕاست نیە، بۆیە من بە پێویستم زانی، لێرەدا پێنج ڕوونكردنەوە بدەم:

## ڕوونكردنەوەی یەكەم:

هەرچەندە ڕێبازەكانی تەصەووف واتە: ئەوانەیان كە پابەندن بەقورئان و سوننەتەوە، وە دوور بوون لە شیرك و داهێنان و لادان و غەڵەت و پەڵەت، بەڵێ، هەرچەندە ڕێبازەكانی تەصەووف ڕۆڵی گەورەو گرنگیان گێڕاوە لە پرۆسەی تەزكیە كردندا، چونكە زۆربەی زانایان و پسپۆڕانی بواری تەزكیەی نەفس، لەژێر ئەو چەترەدا دانراون، با لە بنەڕەتیشدا لەژێر ئەو چەترەدا نەبووبن، پیاوانی وەك: (ئەبو حامیدی غەزالیی، شێخ جونەیدی بەغدادیی، ئەبو سولەیمانی دارانیی، ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم) دواتر: (عەبدولقادری گەیلانیی، بەهائەددینی نەقشەبەندیی، سەید ئەحمەدی سەرهەندیی، مەولانا خالیدی نەقشبەندیی، كاك ئەحمەی شێخ) ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ و خوا پاداشتیان بداتەوە، ئەوانە لەدوای خۆیان ئەو قوتابخانەو ئەو ئەزموونە كە هەیانبووە، بۆ پەروەردە كردنی خەڵكی لە ڕووی ڕۆحییەوە، ناوی لێنراوە تەڕیقەتی فلان، بۆ وێنە: تەڕیقەتی قادریی، تەڕیقەتی نەقشی، تەڕیقەتی شاژلیی، تەڕیقەتی سوهرەوەردیی، تەڕیقەتی غەزالیی، بەڵێ، ئەو ڕێبازانەی تەصەووف ڕۆڵی گرنگیان بینیوە لەبواری تەزكییەدا، بەڵام مەرج نیە هەر كەسێك ئێستا و لە ڕابردووشدا لافی ئەوەی لێدابێ، كە بەدوای فلانە تەڕیقەت كەوتوە، بۆ وێنە: تەڕیقەتی قادریی، بەكردەوەش بەو شێوەیە بێ كە عەبدولقادری گەیلانیی خەڵكی لەسەر پەروەردە كردوە، یان تەڕیقەتی نەقشیی، مەرج نیە هەركەسێ وای گوت، بەو شێوەیە بێ، كە بەهائەددینی نەقشەبەندیی، یان سەید ئەحمەدی سەرهەندیی، خەڵكی لەسەر پەروەردە كردوە، هەتا كۆتایی ئەو تەڕیقەت و ڕێبازانە، كەواتە: تەڕیقەتەكان و، شوێن كەوتەكانیان جیان، هەروەك چۆن ئیسلام و مسوڵمانان جیان، ئیسلام ئەو حەقیقەتە موتڵەقەیە كە خوا ناردوویەتی، ڕاست

و ڕوون و بێ گرێ و گۆڵەو، هیچ هەڵەو پەڵەی تێدا نیە، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ، لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا لاَ يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلاَّ هَالِكٌ). (أخرجه أحمد برقم: (١٧١٨٢)، وابن ماجه برقم: (٤٣)، والحاكم برقم (٣٣١). وأخرجه أيضًا: الطبراني برقم (٦٤٢) تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح بطرقه وشواهده وهذا إسناد حسن).

واتە: لەسەر ڕێیەكی ڕۆشن و ڕوون و سپی بەجێم هێشتوون، شەوەكەشی وەك ڕۆژەكەی وایە (واتە: تاریكیی تێدا نیە)، مەگەر كەسێ خۆی بفەوتێنێ، ئەگەرنا كەس لێی لانادا، هێندە ڕاست و ڕوون و ڕێكە، مەگەر كەسێك خۆی بیەوێ لابدا، ئەگەرنا دووچاری لادان نابێ، ئیسلام بەم شێوەیە، بەڵام مسوڵمانان مەرج نیە هەموویان لە ئاستی ئیسلام دابن، هەروەها ئەو تەڕیقەتانەش و ئەو گەورە پیاوانەش كە ئەو قوتابخانانەیان داناون، مەرج نیە دوایی شوێن كەوتەكانیان هەموویان بەو شێوەیە ڕەفتاریان كردبێ، كە مامۆستاكانیان گوتوویانە، وە وەك ئەوەی ئەو پێشەوایانە كە لە كتێبەكانی خۆیان باسیان كردوە، ڕەفتاریان كردبێ.

## ڕوونكردنەوەی دووەم:

ئەو ڕێبازو تەڕیقەتانە دوایی گۆڕانكاریی زۆریان بەسەردا هاتوە، واتە: كە لە ئەصڵ و سەرچاوەكانیاندا ڕوون بوون، دوایی لیتەو لاڵ و خشپ و خاڵی زۆریان ڕەگەڵ كەوتوە، ڕێبازو تەڕیقەتی وا هەیە ئەگەر خاوەنە ئەصڵیەكەی زیندوو بێتەوە، ڕەنگە هەر نەیناسێتەوە، با وێنەیەك بێنمەوە كە لە كتێبی (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)یشدا باسم كردوە: شێخ عەبدولقادری گەیلانیی ڕەحمەتی خوای لێبێ، پیاوێكی زۆر گەورە بووە لە شاری بەغداو لە ڕۆژگاری خۆیدا وەرچەرخانێكی گەورەی درووست كردوە، بە سەدان لە جوولەكەو نەصڕانیی لەسەر دەستی مسوڵمان بوون و، بەهەزاران لە مسوڵمانانی گوناهبار، لەسەر دەستی تۆبەیان كردوەو بوون بەئینسانی چاك، لە پیاوان و ئافرەتان، لە هەموو چین و توێژەكان، ئنجا ئەو زانایە كتێبێكی هەیە بەناوی (الفتح الرباني والفيض الرحماني)، عەبدولقادری گەیلانیی لەو كتێبەیدا ڕوو دەكاتە مسوڵمانان و

زۆر جەخت دەكاتەوە لەسەر خوا بەیەكگرتن، وە لەسەر پابەندیی بە سوننەتی پێغەمبەرەوە (صلى الله علیه وسلم)، وە لەسەر ئەوە كە ئینسان ڕاست و ساغ بێ، وە بێ گرێ و گۆڵ بێ، بەڵام ئێستاكە ئێمە دەبینین كەسانێك هەن بەناوی ئەو ڕێبازەوە كە عەبدولقادری گەیلانیی لەسەری بووەو، خۆیان دەدەنە پاڵ ئەو ڕێبازە، بەڵام گیرۆدە بوون بە چەند جۆرێ لە شیركەوە، وە بە چەند جۆرێك لە داهێنان و بیدعەتەوە!! كەواتە: دەبێ بزانین ئەو ڕێبازو تەریقەتانە كە لە سەرچاوەكەیان ڕوون و بێگەرد بووە، مەرج نیە، دوایی پاش جیابوونەوەی ئەو جۆگەلانەی لێی بوونەتەوە، وەك خۆیان مابنەوە، بەڵكو خڵتەو لیتەو لاڵی زۆریان تێكەوتوە، هەروەك چۆن مسوڵمانەتیی مسوڵمانانیش، ئەو ئیسلامە بەرزو مەزنە دەبینی، كەچی دوایی تێگەیشتنی مسوڵمانان هەڵس و كەوتەكانیان تەماشا دەكەی، هەڵەو پەڵەو كەم و كوڕیی زۆری تێدا بووە، هەڵبەتە ئەگەر هەرچی بۆچوونی مسوڵمانانە، لەسەر ئیسلامی حساب بكەی، ئەوە زوڵمێكی گەورەت لە ئیسلام كردوە، ئیسلام بەرجەستەیە لە قورئان و سوننەتداو بێ هەڵەو پەڵەیە، بەڵام بێگومان ڕێباز و مەزهەبەكان و، بۆچوون و ئیجتیهادەكان، زادەی هۆش و زەینی مسوڵمانانن و، بەشەریش هیچ كات لە هەڵەو كەم و كوڕیی خاڵی نابێ، بەڵێ ئەگەر بێت و هەرچی زادەی فیكری بەشەرە لەسەر ئیسلامی حیساب بكەی، ئەوە زوڵم لە ئیسلام دەكەی، بەهەمان شێوەش ئەگەر هەرچی بۆچوون و هەڵس و كەوت هەیە لەبواری (تصوف)داو بەناوی ئەو ڕێبازانەی تەصەووفەوە، لەسەر خاوەنە ئەصڵیەكانیان و لەسەر سەرچاوەكانیانی حیساب بكەی، ئەوە زوڵمیان لێدەكەی.

## ڕوونکردنەوەی سێیەم:

هیچ کام لە گەورە پیاوان و دامەزرێنەرانی ئەو ڕێبازانە لە ڕۆژگاری خۆیاندا، خەڵکیان بۆ ئەو ڕێبازانەی خۆیان بانگ نەکردوە، بۆ وێنە: عەبدولقادری گەیلانیی نەیگوتوە: بەدوای عەبدولقادر بکەون و دوایی بڵێن: ئێمە شوێنکەوتووی تەڕیقەتی قادریین، هەروەها بەهائەددین نەقشەبەندیی نەیگوتوە: وەرن بەدوای من بکەون و دوایی بڵێن: ئەوە ڕێبازی نەقشەبەندییە، هەروەها مەولانا خالید نەیگوتوە: بڵێن: ڕێبازی خالیدیی...هتد، بەڵکو ئەو گەورە پیاوانە خەڵکیان تەنها بۆ قورئان و سوننەت بانگ کردوەو، خەڵکیان بانگ کردوە بۆ پەیڕەویی کردن لە ڕێگای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە؟ بەڵگەمان کتێبەکانیانە، بچۆ کتێبی: (الفتح الرباني والفیض الرحماني) بخوێنەوە، بچۆ کتێبی (المكتوبات)ی سەید ئەحمەدی سەرهەندیی بخوێنەوە، بچۆ (إحیاء علوم الدین)ی غەززالیی بخوێنەوە، بچۆ قسەکانی شێخ جونەیدی بەغدادیی و ئەبو سولەیمانی دارانیی و ئەوانی دیکە سەرنج بدە، کەس خەڵکی بۆ لای خۆی بانگ نەکردوە، یاخود بۆ لای ڕێبازێك کە تایبەت بێ بە خۆیەوە، بەڵکو ئەوە خەڵك بووە دوایی گوتوویانە: ڕێبازی فلان و ڕێبازی فلان، ئەگەرنا لە ڕاستیدا ئەوان وەك لە کتێبی: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)دا باسم کردوە، ئەوان خەڵکیان تەنیا بۆ ئیسلام، بۆ ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بانگ کردوە، بەڵام ئەوە خەڵك بوون، کە نەیانتوانیوە وەخۆگر (مستوعب)ی ئەو ڕێنماییانەی ئەوان بن و، وایان زانیوە کە عەبدولقادری گەیلانیی، شتێکی نوێی لە ئیسلامدا داهێناوە، یان بەهائەددینی نەقشبەندیی، ڕێچکەیەکی تایبەتی بەدیهێناوە، بەڵام لە ڕاستیدا هەر ڕێبازە ئەصڵیەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بووە کە ئەوان لەسەری ڕۆیشتوون، بەڵام ئەوان لەسەردەمی خۆیاندا گەشەیان پێداوەو بووژاندوویانەتەوە، وە ئەوان دووبارە خەڵکیان لەسەر قورئان و سوننەت پەروەردە کردۆتەوە، بەڵام دوایی خەڵك لەجیاتی ئەوەی بڵێن: ئەوە ئەزموونی فلان پێشەوا بووە لەبواری دینداریی و ئیسلامەتییدا، یەکسەر کردوویانە بە ڕێبازێکی تایبەت و دواتر هەندێ لە خەڵك وایان زانیوە کە ئەو ڕێبازو ڕێچکانە شتێکن لە بەرانبەری ئیسلامدا!.

## ڕوونكردنەوەی چوارەم:

ئەو ڕێبازانە قوتابخانەی پەروەردەیی بوون، وەك چۆن مەزهەبەكان قوتابخانەی فیقهیی بوون، وە تەوژمەكانی بواری عەقیدەو ئەهلی كەلام، قوتابخانەی فیكریی بوون بۆ ئیمان و عەقیدەو ...هتد، بەهەمان شێوە: ئەو ڕێبازانەش قوتابخانەی ڕووحیی بوون و ئەزموونی ئەو پێشەوایانە بوون، لەبواری پەروەردە كردنی مسوڵمانانـدا لە ڕووی ڕوحییەوە، وە لە ڕووی تەقواو تەزكیەوە، ئەزموونی خۆیان خستۆتە ڕوو، وە هەوڵی خۆیان داوە، تاكو لەو ڕووەوە خەڵك بهێننەوە سەر ڕاستە شەقامی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وەك چۆن زانایانی عەقیدەو عیلمی كەلام هەوڵی خۆیان داوە، لەو بوارەدا خەڵك بهێننەوە سەر ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، هەروەها زانایانی شەرعزان لە ڕووی فیقهو ئوصووڵی فیقهەوە، هەوڵیان داوە خەڵك پابەند بكەنەوە بە یاساكانی شەریعەتەوە، بەهەمان شێوە، ئەوانیش ئەزموون و هەوڵی خۆیان پێشكەش كردوە، بۆ گێڕانەوەی مسوڵمانان لەو بوارەدا كە ئەوان تێیدا پسپۆڕ بوون، بۆ دینداریی و خوا پەرستیی، دواییش كە تەمەشای كتێبەكانی ئەو پێشەوایانە دەكەی، ئەوەش نەبووە كە تایبەتیان بكەن بە تەزكیەی نەفسەوە، بۆ نموونە: عەبدولقادری گەیلانیی كە قسە دەكا، ڕوو لە مسوڵمانان دەكا بە گشتی كە بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام، بە ئیمان و عەقیدەوە، بە تەزكیەوە، لە بواری هەڵس و كەوتەوە، لە بواری كڕین و فرۆشتنەوە، لە بواری هەڵسوكەوتی خێزانییدا، هەروەها ئەبو حامیدی غەززالیی (إحياء علوم الدين)ەكەی بخوێنەوە، باسی هەموو دینداریی دەكا، هەر ناوەكەشی وا داناوە: (زیندوو كردنەوەی زانستەكانی دین)، هەروەها زانایەكانی دیكەش: سەعیدی نوورسی لە (پەیامەكانی نوور)دا هەوڵیداوە باسی هەموو ئیسلام بكا، بە ئەندازەی ئەوە كە بارو دۆخە سیاسیەكە ڕێی پێداوە، وە سەید ئەحمەدی سەرهەندیی لە (المكتوبات)ەكەی خۆیدا كە ناردوونی، وە لە وەڵامی نامەكانیدا كە ناردوونی، خەڵك بانگ دەكات بۆ هەموو ئیسلام، بە نوێژو تاعەتەوە، بە چۆنیەتی مامەڵە كردنی خۆیان لەگەڵ دەستەڵاتداران، بە هەموو ڕەهەندو لایەنەكانەوە.

## ڕوونکردنەوەی پێنجەم:

تەزكیەی نەفس، خۆ پاك و چاك كردن، زیاتر صالْح بوون و لەخوا نزیك بوون، بەرەو خوا چوون، خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، وەك چۆن (شوێن كەوتنی پێشینی چاك) خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، وە من لێرەوە ئامۆژگاریی كەسانێك دەكەم كە خۆیان بە شوێن كەوتووی ڕێبازەكانی تەصەووف و تەزكیە دەزانن: پێیان وانەبێ هەر كەسێ لە چوار چێوەی ئەو ڕێبازەدا نەبوو كە ئەوان لە سەرنی، ئەوە بێبەش (محروم)ە لە تەزكیەی نەفس، وە هیچ كەسیش پێی وا نەبێ كە بۆ ئەوەی نەفسی خۆی تەزكیە بكا، حەتمەن دەبێ سەر بەیەكێ لەو ڕێبازانە بێ و، شوێن یەكێ لەو شێخانە بكەوێ، كە ئەمڕۆ دیارن لە نێو خەڵكدا، با ئەوان خزمەت بكەن و دەوری خۆیان ببینن، بەڵام لە ڕاستیدا: دەست گەیاندنە تەزكیەی نەفس و، صالْح بوون و بەرەو خوا چوون و، جەخت كردنەوە لەسەر لایەنی مەعنەویی لە ئیمان و ئیسلامدا، پەكی لەسەر ئەوە نەكەوتوە كە تۆ دەبێ حەتمەن سەر بە یەكێ لە ڕێبازەكانی تەصەووف بی! چونكە پێشەوایەكانی ئێمە، چوار ئیمامە موجتەهیدەكان: ئەبو حەنیفە، مالیك، شافیعیی، ئەحمەدی كوڕی حەنبەل، هەروەها سوفیانی ثەوریی، سەعیدی كوڕی موسەییب، لەیثی كوڕی سەعد، ئەبو داودی ظاهیریی، ئەبو جەعفەری طەبەریی، هەموو ئەو ئیمامانە، نەناسراون بەوەی شوێن یەكێ لە ڕێبازەكانی تەصەووف كەوتبن، بەڵام ئایا دەتوانین بڵێین: ئەوانە نەفسیان تەزكیە نەبووەو خاوەنی نەفسی زۆر پاك و چاك نەبوون؟ بێگومان ناتوانین، هەروەها هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وە پاشان شوێنكەوتووان، پیاوانی وەك: حەسەنی بەصریی، ئیبن و سیرین، سەعیدی كوڕی جوبەیر، ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هەموو پێشەوایانی ئەم ئۆممەتە بێ، ئایا سەر بە ڕێبازێكی دیاریی كراوی تەصەووف بوون؟ نەخێر، بەڵام ئایا خاوەنی نەفسێكی تەزكیە كراو نەبوون؟ با، وە دوایی زانایانی دیكەش، بۆ وێنە: سەعیدی نووڕسی سەر بە هیچ ڕێبازێكی تەصەووف نەبووە، بەڵام سوودی لە كتێبەكانی عەبدولقادری گەیلانیی و شێخ ئەحمەدی سەرهەندیی و بەهائەددین نەقشەبەندیی و مەولانا

جەلالەددینی ڕۆمیی، دیوە، بەڵام خۆی نەبەستۆتەوە بە هیچ كام لەو ڕێبازانەوە، وەك منیش لە كتێبی (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)دا باسم كردوە كە ئەوەی گرنگە، ئەوەیە كە ئێمە پابەند بین بە قورئانەوەو بە سوننەتی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، دیارە بەبەهرە وەرگرتن لە زانایان و پێشەوایانمان، لە ئەزموون و تەفسیر كردن و لێكدانەوەی ئەوان، بەڵام پەك لەسەر ئەوە نەكەوتوە كە سەر بەیەكێك لە ڕێبازەكانی تەصەووف بی وە ڕاست نیە كە تۆ لە چوارچێوەی ڕێبازێكی دیاریی كراوی تەصەووفدا نەبووی، بەشت لە تەصەووفدا نەبێ! بۆیە من لێرەوە ئامۆژگاریی ئەو خەڵكە دەكەم كە لەچوار چێوەی ڕێبازی تەصەووف دان، بە چاوێكی نامۆ تەماشای خەڵكی دیكە نەكەن، وە پێیان وا نەبێ كە تەنیا ئەوان مسوڵمانی ساغ و صافن! تاكو جۆرێك لە بەخۆ سەرسام بوون (عجب)یان بۆ دروست نەبێ لەبەرانبەر باقی مسوڵمانانداو، پێیان وابێ ئەوان شتێكی دانستەن، لەبەر ئەوەی سەر بە فلان ڕێبازی تەصەووفن، وە پێیان وانەبێ ئەوەی ئەوان دەستیان كەوتوە - ئەگەر ڕاست بێ دەستیان كەوتبێ- كە (مەقامی ئیحسان) و (تەزكیە) تەعبیری لێ دەكەن، خەڵكی دیكە لێی بێبەشە!! بەڵێ ئەگەر ئەو كەسانە بەباشی بەدوای ئەو ڕێبازە بكەون، وەك سەرچاوە ڕوونەكە گوتوویەتی، پابەند بن، لێی بەهرەمەند دەبن، بەڵام بێگومان ئەوە تەنیا ئەو كتێبانەو ئەو پێشەوایانە نەبوون، كە خەڵك فێری دینداریی ڕاست و ساغ بكەن، بەڵكو خەڵكی دیكەش بوون، با ئەو ناوەشیان لەخۆیان نەنابێ، وەك گوتمان: پێشەوا سەر مەزهەبەكان، هەموویان خاوەنی نەفسێكی موزەككا بوون، وە خاوەنی مەقامی ئیحسان بوون، هیچ ناوێكی تەصەووف و سۆفییگەرییشیان لەخۆیان نەنابوو.

ئنجا هەڵبەتە ئەم بنچینەیە دەربارەی سەلەفیەكانیش هەر ڕاستە، بۆیە ئامۆژگاریی دڵسۆزانەیان دەكەم، كە ئەوانیش خۆیان بە شتێكی جیاواز لە مسوڵمانانی دیكە لەقەڵەم نەدەن، وە بەهۆی ناوی (سەلەفیی)یەوە، وا بزانن كە تەنها ئەوان بەدوای سەلەفی صاڵح كەوتوون! چونكە بە دڵنیاییەوە: شوێن پێشینی چاك كەوتن (إتباع السلف الصالح) پەكی لەسەر ئەوە نەكەوتوە، ئەو

ناوە لەخۆت بنێی، ناو لەخۆ نان، ئەگەر نێوەڕۆكی لەگەڵدا نەبێ، خاوەنەكەی بەهیچ ناگەیەنێ.

هەروەك لایەنە ئیسلامییەكانیش كە كار دەكەن بۆ گێڕانەوەی خەڵك بۆ ئیسلام و، خزمەت كردنی كۆمەڵگا لە هەموو بوارەكانی، ئیمان و عەقیدەو، عیبادەت و ئەخلاق و ...هتد، ئەوانیش نابێ لەبەر ئەوەی كە ناوی ئیسلامییان لەسەرە، پێیان وابێ كە لە هەموو ئاوان پەڕیونەتەوە، وە هەر ئەوان مشورخۆرو دڵسۆزی ئیسلام و مسوڵمانانن! با هەریەك لەوانە كاری خۆی بكا، وەك خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ ﴿٨٤﴾ ﴾ الإسراء.

هەركەسە با كاری خۆی بكا، بەڵام خاڵی هاوبەشمان ئەوەیە كە هەموومان بەشوێن سەلەفی صاڵح بكەوین و، هەمووومان هەوڵ بدەین نەفسی خۆمان تەزكیە بكەین، وە هەمووومان مشووری گەلەكەمان بخۆین، هەمووومان فەرمان بەچاكەو نەهی لە خراپە بكەین و، خەڵك پابەند بكەینەوە بە شەرعی خوای پەروەردگارەوە، با ئەمانە خاڵە هاوبەشەكانمان بن، وە هەر كامێكیشمان دان بە چاكەو فەزڵی ئەوی دیكەدا بێنێ، وە پێكەوە هاوكار بین، وەك تیمێك، بۆ دووبارە نزیك خستنەوەی خۆمان و خەڵكەكەمان لە شەریعەتی خوای پەروەردگار.




# پەیوەندیی و جیاوازیی نێوان هەرکام لە: ڕووح، نەفس، عەقڵ، قەلب[١].

ئەم چوارە: (ڕووح) و (نەفس) و (عەقڵ) و (قەلب) کە بابەتی تەزکیەی نەفسن، واتە: تەزکیەی نەفس، زۆر ئەو چوار وشەیەی تێدا بەکار دەهێنرێن، ئایا ئەو چوار وشەیە تەعبیر دەکەن لە چوار حەقیقەت؟

یاخود تەعبیر دەکەن لەیەك حەقیقەت، بەڵام لەچەند ڕوویێکەوەو بەچەند تەعبیرێکی جیاجیا؟! با سەرنجی هەر کامێکیان بدەین:

## ١- ڕووح:

خوای پەروەردگار وشەی ڕووحی لە قورئاندا چەند جارێك بەکار هێناوە، بەڵام ئەوەی کە لە سووڕەتی (الإسراء)دا هاتوە، هەرچەندە خوای پەروەردگار بە گشتی هێناویەتی، بەڵام بەڕای زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان، مەبەست پێی ڕووحی ئینسانە، کە دەفەرموێ:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء.

.........................................

(١) دیارە ئێمە لە کوردیدا (ڕووح) وشەی (گیان)ی بۆ بەکار دەهێنین، بۆ (نفس)یش (خود) یان هەر نەفسیش بەکار دەهێنین، وە (عقل)، (ژیریی) بۆ بەکار دەهێنرێ، وە (قلب)یش (دڵ)ی بۆ بەکار دەهێنین، ئنجا هەرکام لەم چوار وشانە، ئێمە وشە عەرەبیەکانیشیان بۆ بەکار دەهێنین و، ئەو واتایانەش کە باسم کردن، بەکار دەهێنین.

واتە: دەربارەی ڕووح پرسیارت لێ دەکەن (ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)) تۆ پێیان بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمە، (یانی: پەیوەندیی تایبەتیی بە پەروەردگارمەوە هەیە) وە ئەندازەیەکی کەم نەبێ زانیارییتان پێ نەدراوە. ئەمەش ئاماژەیەکە، بەو ئەندازە کەمە زانیارییە، ئێوە ناتوانن دەرکی ماهیەت و حەقیقەتی ڕووح بکەن.

دیارە ڕووح بە پێی ئایەتەکان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەنێو جەستەی مرۆڤدایەو، تاکو مرۆڤ زیندوو بێ ڕووحی تێدایە، بۆیەش لە کوردەواریی خۆماندا وشەی: (ژیان لەبەر) یان (گیاندار) یان (ڕووح لەبەر) بەکار هاتوە بۆ هەر شتێ کە خاوەنی ژیان و زیندوو بێ، ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە کە دەڵێین: ڕووح لەنێو جەستەدایە؟ وە ئایا لە قوڕئاندا چۆن باسی ڕووح کراوە؟

## بەڵگەی یەکەم:

ئەو ئایەتانەی سووڕەتی (الواقعة)ن، کە خوا سبحانه و تعالى لە سیاقی چەند ئایەتێکدا، کە باسی قوڕئان و، ئیمان هێنان بە قوڕئان و، باسی ئەوانەی کە ئیمان بە قوڕئان ناهێنن، سزایان چۆنە؟ وە ئەوانەی کە ئیمانی پێ دەهێنن، پاداشتیان چۆنە؟ دەکەن، دەفەرموێ:

﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الواقعة.

لێرەدا خوا سبحانه و تعالى بە گشتی ڕوو لە بەشەر دەکا، یاخود بەتایبەت ڕوو لە بێ بڕوایان دەکاو دەفەرموێ: دەبووایە کاتێك کە دەگاتە گەروو {(ٱلْحُلْقُومَ) لە زمانی عەرەبیدا واتە: (بلعوم)[1] ئەوەی کە خواردن و خواردنەوەی پێدا ئاودیوی گەدەو هەناوی ئینسان دەبێ} وە ئێوە لەو کاتەدا تەماشا دەکەن، سەرنج

(١) الحلقوم: الحلق. مختار الصحاح، ص ١٤٤.

دەدەن، (مەبەست پێی حاڵەتی گیانەڵایە بۆ ئینسان)، وە ئێمە لە ئێوە لێی نزیکترین (لەو بابایە کە لە حاڵەتی گیانەڵاو ڕووح دەرچووندایە)، بەڵام ئێوە نابینن، (لێرەدا بەتەئکید (نحن) ئێمە، یانی: فریشتەکانمان، ئەو فریشتانەی کە گیان کێشرانیان پێ سپێردراوە، ئەگەرنا خوا سبحانە و تعالی، بەڵێ بە زانیاریی و ویست و دەستەڵات، لە هەموو دروستکراوەکانیەوە نزیکە، بەڵام وەك زاتی خۆی لەسەر عەرشی خۆیەتی بەو شێوەیە کە بۆخوا شایستەیە)، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ دەبووایە ئەگەر ئێوە ژێر دەستی خوانین، مل پێکەچکراو نین، ﴿ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ ئەو ڕووحە کە خەریکە دەربچێ و بچێتە گەروو، بیگێڕنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن لەبەر دەستی خوا دانین، لێرەدا هەرچەندە وشەی (ڕووح) نەهاتوە، بەڵام بە سیاق دیارە کە ئەوەی دەگاتە گەروو، وە ئەوەی لەنێو جەستەدایە، وە ئەوەی کە لەکاتی مردنی ئینساندا لە جەستە دەهێنرێتە دەر، بێگومان ڕووحە.

### بەڵگەی دووەم:

هەروەها خوای بێ وێنە دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾ السجدة.

خوا سبحانە و تعالی باسی خۆی دەکاو دەفەرموێ: ئەو کەسەی کە هەرشتێکی دروست کردوە، چاکی دروست کردوە، بەباشترین شێوە دروستی کردوە، وەك لەئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ:

﴿ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾ النمل.

واتە: ئەوە دروستکراوی خوایە، کە هەموو شتێکی بەجوانترین شێوەو بە وردەکاریی زۆرو بە کارامەیی هێناوەتە دی، ﴿ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴾ وە

دروست كردنی مرۆڤی لە قوڕەوە دەست پێ كردوە، واتە: یەكەمین مرۆڤ كە ئادەمە سەلامی خوای لێبێ، بابی بەشەر، لە قوڕ دەست پێكراوە، ﴿ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴾ پاشان وەچەی ئەو بەشەرەی لە پوختەو ڕاپازنەراوی[1] ئاوێكی بەكەم سەیر كراو[2]، یان قێزەوەن، دروستكردوە ﴿ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ﴾ دوایی ڕێك و پێكی كرد {قۆناغ بە قۆناغ، لەحاڵەتی (نطفة)ەوە بۆ (علقة) پاشان بۆ (مضغة) پاشان بۆ حاڵەتی ئێسقان، پاشان بە گۆشت داپۆشران، پاشان لەو ڕووحە كە تایبەتە بەخواوە (كەس غەیری خوا حەقیقەتەكەی نازانێ}، فووی بەبەردا كرد، هەڵبەتە ڕووحیش دروستكراوی خوایە بەڵام دروستكراوێكی تایبەتەو وەك باقی ئەو دروستكراوانە نیە كە ئێمە سەرو كارمان لەگەڵیاندا هەیە، لە ژیانی دنیاو ژیانی ماددییماندا، ﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾ دوایی بیستن و بینینەكان و عەقڵی بۆ ئێوە گێڕان و تێدا پەیدا كردن، بە كەمیی سوپاسگوزاریی خوا دەكەن. لێرەدا زۆر بە ڕوونیی دیارە كە ڕووح دروستكراوێكە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، وەك فوویەك بەبەر جەستەی هەموو ئینسانەكاندا دەكرێ، ئەوە بە نیسبەت (روح)ەوە، كە ئایا لە قوڕئاندا چۆن باس كراوە؟!

## ٢- نـەفـس:

وشەی نەفسیش لە قوڕئاندا، چەند جارێك باس كراوە، هەرچی ڕووحە بەبێ حاڵەتی مەدح و زەم باس كراوە، واتە: نە ستایش كراوە، نە سەرزەنشت كراوە، بەڵام نەفس بە پێچەوانەوە: لەهەندێ حاڵدا مەدح كراوەو، لەهەندێ حاڵدا زەم و سەرزەنشت كراوە، بۆ وێنە:

١- خوای بەرز لە سوورەتی (یوسف)دا لەسەر زمانی وی سەلامی خوای لێبێ دەفەرموێ:

..............................

(١) مختار الصحاح، ص ٢٧٨، ٢٧٩٩.

(٢) مختار الصحاح، ص ٦٠٣.

﴿ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ ﴿٥٣﴾ ﴾

واتە: بێگومان نەفس زۆر فەرمانكەرە بە خراپە، مەگەر پەروەردگار بەزەیی و ڕەحم بنوێنێ، (نەهێڵێ ئەو نەفسە كە زۆر فەرمانی خراپە بە خاوەنەكەی دەكا، بەسەر خاوەنەكەیدا زاڵ بێ)، كەواتە: لێرەدا نەفس لە حاڵەتی سەرزەنشت و بەخراپ دانراندا باس كراوە، چونكە شتێك زۆر فەرمان بە خراپە بكا، دیارە خراپە.

٢- وە لە سوورەتی (القیامة)دا، خوا ئاوا باسی نەفس دەكاو دەفەرموێ:

﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ ﴾

واتە: نەخێر، سوێند دەخۆم بە نەفسێكی زۆر لۆمەكەر، زۆر ڕەخنەگر[1]، زۆر لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: خوای بێوێنە لێرەدا مەبەستی نەفسێكە كە خاوەنەكەی هەوڵی لەگەڵ داوەو، تێكۆشانی لەگەڵدا كردوەو ویستوویەتی ملی پێ كەچ بكا بۆ شەرع، وە سەرەنجام ئەو نەفسە وای لێهاتوە ئەگەر خراپە بكات، لۆمەی خۆی دەكاو سەركۆنەی خۆی دەكا.

٣- وە لە حاڵەتێكی دیكەدا خوای بەرزو مەزن باسی نەفسی كردوە، لە سوورەتی (الفجر)داو دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾ ﴾ الفجر.

واتە: ئەی نەفسی ئارام گرتوو! بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، تۆش ڕازی و ئەویش لەتۆ ڕازییە، بچۆ نێو بەندەكانمەوە، بچۆ نێو بەهەشتمەوە. لێرەشدا دیارە لە حاڵەتی مەدحدا باسی نەفس كراوە، كە بریتیە لە نەفسێكی ئارام گرتوو، ئۆقرە گرتوو.

........................................

(١) مختار الصحاح، ص ٥٢٥، (اللوم: العذل، تقول: لامَه على كذا).

٤- وە لە فەرمایشتێكی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) هەم باسی ڕووح و، هەم باسی نەفس هاتوە: وەك ئەو فەرمایشتەی كە باسی چۆنیەتی ڕووح كێشرانی ئینسان دەكا لەلایەن فریشتەكانەوە، كە دوایی ئەو ڕووحە بەرز دەبێتەوە بەرەو ئاسمانەكان، ئنجا ئەگەر چاكەكار بووبێ، فریشتەكان سڵاوی لێدەكەن، وە ئەگەر خراپەكار بێ، سەركۆنەی دەكەن، لە فەرمایشتەكەدا هاتوە دەفەرموێ:

(إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ) أخرجه أحمد برقم (٢٦٥٨٥)، ومسلم برقم (٩٢٠)، وابن ماجه برقم (١٤٥٤)، وأخرجه أيضًا: إبن حبان برقم (٧٠٤١)، والبيهقي برقم (٦٣٩٨)، وأبو يعلى برقم (٧٠٣٠)، والطبراني برقم (٧١٢)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وقال الألباني: صحيح.

واتە: كاتێ ڕووح كێشرا، چاو بەدوایدا دەچێ و تەماشای دەكا، هەروەها لە فەرمایشتەكەدا هاتوە: (أَيَّتُهَا النَّفْسُ الطَّيِّبَةُ)، ئەگەر چاكەكار بێ فریشتەكان دەڵێن: ئەی نەفسی پاك و چاك! بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر خراپەكار بێ، فریشتەكان پێی دەڵێن: (أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْخَبِيثَةُ)، ئەی نەفسی پیس و خراپەكار! كەواتە: وەك ڕووح: مەدح و زەم ناكرێ، بەڵام وەك نەفس: مەدحیش و زەمیش دەكرێ، كە دوایی حیكمەت و هۆكاری ئەوە ڕوون دەكەینەوە.

## ٣- عــەقڵ:

لە قورئاندا وشەی عەقڵ وەك ناو (إسم) نەهاتوە، بەڵام وەك كردار (فعل) هاتوە، (يَعْقِلون، تَعْقِلون، تَفقَهون)، هەروەها وشەی (فوآد) كە بەكۆش هاتوە (أَفْئِدة)، وە وشەی (نُهى) كە كۆی (نُهْية)یە، وە وشەی (حِجر)یش هاتوە، هەركام لە وشەكانی: (فوآد، نُهْية، حِجر) بەمانای عەقڵ دێن، ئەو هێزەی كە ئینسان شتی پێ دەفامێ و تێدەگا، بەڵام دیسان وشەكانی: (فوآد، نُهْية، حِجر) نەزەم كراون، نە مەدح كراون، واتە: وەك حاڵەتێكی بێلایەن لە قورئاندا بەكار هاتوون، بۆ وێنە:

١- خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: وە شوێن شتێك مەكەوە كە نایزانی، بێگومان بیستن و دیتن و عەقڵ، هەركامێك لەوانە لێی دەپرسرێتەوە، واتە: هەر كامێك لەوانە ئامرازێكە بە ئینسان دراوە، بۆ ئەوەی كە شتەكانیان پێ ببیستێ، ببینێ، دەرك بكاو بزانێ، ئنجا ئەگەر ئینسان لەو ئەركە سروشتیەی خۆیاندا بەكاریان نەهێنێ، یان بەهەڵە، یاخود بۆ ئامانجێكی خراپ، بەكاریان بێنێ، ئەوە لێپێچینەوەی لەسەریان لەگەڵدا دەكرێ.

٢- هەروەها لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ ﴾ طه.

واتە: بێگومان لەوەدا (كە پێشتر باس كراوە) نیشانە هەن بۆ كەسانێك كە خاوەنی (ٱلنُّهَىٰ)ن، واتە: خاوەن عەقڵن، بۆیەش عەقڵ پێی دەگوترێ (نهیة) چونكە خاوەنەكەی لە خراپە دەگێڕێتەوە[1].

٣- هەروەها سەبارەت بە وشەی (حِجر) لە شوێنێكی دیكەدا خوای زانا دەفەرموێ:

﴿ هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴿٥﴾ ﴾ الفجر.

واتە: ئایا لەوەدا شایستەیی سوێند پێ خواردن هەیە، بۆ كەسێك خاوەن (حِجر) بێ، واتە: خاوەن عەقڵ بێ، چونكە (حَجَرَهُ) واتە: (مَنَعَهُ)، خاوەنەكەی دەگێڕتەوە لە شتی خراپ[2].

.............................................

(١) مختار الصحاح، ص ٥٨٧، (النهية بالضم واحدة (النهى) وهي العقول لأنها تنهى عن القبيح).

(٢) مختار الصحاح، ص ١٢٠، ١٢١ (حجر القاضي عليه: منعه عن التصرف في ماله، ... وحجر الإنسان بكسر الحاء وفتحها واحد الحجور).

## ٤- قەلب:

ئەمیش دیسان لە قورئاندا هەم بە تاك هاتوە: (قلب)، هەم بە كۆش هاتوە: (قلوب)، وە مەدح و زەمیش ئاراستەی قەلب كراوە، بەپێی ئەو حاڵەتەی كە دڵ بەخۆیەوە دەبینیٚ، با سەیری چەند ئایەتێك بكەین.

١- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرمویٚ:

﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾ الشعراء.

واتە: ئەو ڕۆژەی كە نە سامان و نەكوڕان سوود ناگەیەنن (بە خاوەنەكەیان)، مەگەر كەسێك بە دڵێكی ساغەوە هاتبێتە لای خوا، كەواتە: دڵی ساغ هەیەو، دڵی نەخۆشیش هەیە.

٢- هەروەها لە سوورەتی (المجادلة)دا خوای بیٚ هاوتا دەفەرمویٚ:

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ﴿٢٢﴾ ﴾ المجادلة.

باسی ئیمانداران دەكا، ئەوانەی دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی لەبەر خوا دەگرن، دەفەرمویٚ: ئەوانە كەسانێكن خوا ئیمانی لە دڵدا نووسیون و تۆمار كردوون، وە لەلایەن خۆیەوە بە ڕووحێك پشتگیریی كردوون.

٣- وە لە سوورەتی (الرعد)دا دەربارەی دڵانی ئارامگرتوو دەفەرمویٚ:

﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد.

واتە: ئاگاداربن! بە یادی خوا دڵان ئارام دەگرن و ئۆخژنیان بۆ دیٚ.

٤- هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا خوای توانا بۆمان باسی دڵی نەخۆش دەكاو دەفەرمویٚ:

﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ ﴾ البقرة.

خوا باسی مونافیقەكان دەكاو دەفەرمویّ: دڵیان نەخۆشی تێدایە، خوا نەخۆشییان زیاد بكا (ئەوە تەفسیرێكی) تەفسیرێكی دیكەی: خوا نەخۆشییەكەی بۆ زیاد كردن، وە ئازارێكی بە ئێشیان هەیە، بەهۆی ئەوەوە كە درۆیان كرد.

٥- وە لە سوورەتی (المطففين)دا باسی حاڵەتێكی دیكەی نەخۆشی دڵ دەكا، كە بریتییە لە حاڵەتی ژەنگ (رَین)[1]، دەفەرمویّ:

﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففين.

واتە: نەخێر وانیە (كە ئەوان دەیڵێن) بەڵام دڵیان ژەنگی گرتوە، بەهۆی ئەو كردەوە خراپانەوە كە ئەنجامیان دەدەن.

٦- وە لە سوورەتی (البقرة)دا باسی حاڵەتێكی دیكەی نەخۆشیی دڵ دەكا، كە بریتیە لە حاڵەتی مۆركران (خَتم)، وەك دەفەرمویّ:

﴿ خَتَمَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰ أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٧﴾ ﴾ البقرة.

واتە: خوا مۆری[2] بەسەر دڵیان و بەسەر بیستنیانەوە ناوە، وە چاویشیان پەردەی بەسەر هەڵكشاوە، وە ئازارێكی مەزنیان هەیە.

٧- وە لە سوورەتی (محمد)دا باسی حاڵەتێكی دیكەی نەخۆشكەوتنی دڵمان بۆ دەكا، كە مەترسیدارترین حاڵەتەو، بریتیە لە حاڵەتی (قَفل) دەفەرمویّ:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ﴿٢٤﴾ ﴾ محمد.

واتە: ئایا لە قورئان ورد نابنەوە، یاخود دڵیان قوفڵی لەسەرە؟ كە دیارە ئەوە خراپترین حاڵەتی كوفرو خراپەكارییە كە ئینسان بكەوێتە حاڵەتێكەوە دڵی قفڵی

........................................

(١) مختار الصحاح، ص٢٤٢. (الرين: الطبع والدنس، يقال: ران ذنبه على قلبه، أي: غلب... وقال الحسن رضي الله عنه: هو الذنب على الذنب حتى يَسْوادَّ القلب).

(٢) مختار الصحاح، ص ١٦٠.

لێ بدرێ، مانای وایە تازە هیچ ڕێگای هیدایەت نیە بچێتە نێوی!

هەڵبەتە ئێمە بۆیە باسی ئەو چوار وشەیە دەكەین، (روح، نفس، عقل، قلب) چونكە هەر چواریان تەوەری سەرەكیی تەزكیەی نەفسن و، تەزكیەی نەفس زۆر پەیوەست و پەیوەندداره بەم چوارەوە، ئنجا زانایان زۆر شتیان گوتوە سەبارەت بە پەیوەندیی و جیاوازیی ڕووح و نەفس لەلایەكەوە، وە پاشان پەیوەندیی عەقڵ و دڵ بە ڕووحەوە، یان عەقڵ و دڵ بە نەفسەوە، بەڵام ئەوەی كە من بە ڕاستترو نزیكتر لە ڕاستیەوە دەزانم، ئەوەیە كە ئەبو حامیدی غەززالیی لە كتێبە ناودارەكەی خۆی (إحياء علوم الدين) باسی كردوە، دەربارەی ئەو چوارانە، هەڵبەتە مەرج نیە ئەوەی ئێمە نەقڵی دەكەین، ڕێك تەعبیرەكەی ئەو زانا بەڕێزە بێ، ڕەنگە پوختەی قسەكانی ئەو بێ، ئەوەی من بەڕاستی دەزانم دەربارەی پەیوەندیی و جیاوازیی ئەو چوار وشەیە ئەوەیە: كە خوا سبحانە و تعالى باسی دروستكردنی ئینسانی كردوە، چ ئادەم سەلامی خوای لێبێ، چ وەچەی ئادەم، كە لەدەرسی پێشووشدا ئاماژەمان پێدا، تەنیا باسی دوو پێكهێنەر دەكا، هەم بۆ ئادەم و هەم بۆ وەچەی ئادەم، هەڵبەتە كە باسی ئادەم دەكەین، مەبەستمانە حەوواشە، كە ئەویش دایكی مرۆڤایەتییە، چونكە خوا سبحانە وتعالى لە سەرەتای سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئەی خەڵكینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بكەن، كە لە یەك نەفس دروستی كردوون، وە هەر لەخۆشیی هاوسەرەكەی دروست كردوە، یانی: لەهەمان ئەو ماددەو توخمەی ئادەمی لێ دروست كراوە، حەوواش بەهەمان شێوە لە هەمان توخم و ماددە دروست كراوە.

خوا كە باسی پێكهاتەی وەچەی ئادەمیش دەكا، بە نێرو مێ و بە هەموو پێكهاتەو ڕەنگ و زمانەكانیەوە، دیسان هەموویان وەك یەك باس دەكا، كە گڵ و ڕووح، یاخود قوڕو ڕووحن، قوڕێكی وەرگیراو لەخاك، لەگەڵ ڕووحێكی لەخواوە هاتوو! با تەماشا بكەین:

١- دەربارەی دروست كردنی ئادەم لە سوورەتی (ص)دا، خوا سبحانه و تعالى دەفەرمویّ:

﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾ ص.

واتە: یاد بكەوە كاتێك پەروەردگارت بە فریشتەكانی فەرمووی: من بەدیهێنەری بەشەرێكم لە قوڕ، {ئەوە پێكهاتەی یەكەمی (یەكەم) مرۆڤ كە ئادەمە سەلامی خوای لێبێ كە بریتییە لە قوڕ، كە دیارە مەبەست پێی جەستەكەیەتی}، پێكهاتەی دووەمی: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾ ئنجا هەر كاتێك ڕێكم خست، (كەواتە: هەموو قوڕێك وە هەموو خاكێك شایانی ئەوە نیە ڕووحی بەبەردا بكرێ، دەبێ ڕێكبخرێ و ئامادە بكرێ) وە لە ڕووحی خۆم فووم بەبەردا كرد، ئێوە هەمووتان كڕنووشی بۆ ببەن. (لێرەدا مەبەستی كڕنووشی ڕێزگرتن و سڵاوە لەلایەن فریشتەكانەوە، بۆ ئادەم سەلامی خوای لێبێ، نەك كڕنووشی بەندایەتیی و پەرستن، كە ئەوە تەنیا شایستەی خوای پەروەردگارە) كەواتە: لێرەدا خوا زۆر بە ڕوون و ڕاشكاویی باسی ئەوە دەكا، كە ئادەم سەلامی خوای لێبێ لە دوو شتان پێك هاتوە:

١- قوڕ.

٢- ڕووح.

قوڕێك كە لەزەوی وەرگیراوەو گڵ و ئاوە تێكەڵ بووە، وە ڕووحێك كە لەخواوە هاتوە كە ئەویش هەر دروست كراوی خوایە، بەڵام دیارە دروستكراوێكی تایبەتە، كە ئێمە وەك سەرمان لە قوڕو لە گڵ دەردەچێ، بەو شێوەیە سەرمان لە ڕووح دەرناچێ، وەك پێشتریش باسمان كرد خوای بێ هاوتا لە بارەی نهێنیی بوونی ڕووحەوە، دەفەرمویّ:

﴿ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء.

٢- بۆ وەچەی ئادەمیش بەهەمان شێوە خوا سبحانە و تعالی ئاماژە دەكا بۆ ئەو دوو پێكهاتەیە، وەك لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرمویٚ:

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: بێگومان ئینسانمان لە ڕاپازنراوێك لە وەرگیراوێك لە قوڕ دروست كردوە، (كە لێرەدا دەگونجیٚ مەبەست پێی ئادەم بیٚ، وە دەشگونجیٚ مەبەست لە هەركام لە وەچەی ئادەم بیٚ، كە ئەو تۆو (مَني)ەی لە ئینساندا دروست دەبیٚ، خوڵاصەی ئەو خواردن و خۆراكەیە، كە لە قوڕو زەویەوە هاتوە: ئینسان دەیخوا، دوایی دەبێتە خوێن و، پاشان دەگۆڕیٚ بۆ مەنی، چ بۆ پیاو چ بۆ ئافرەت)، دەفەرمویٚ: دوایی لە نشینگەیەكی دامەزراودا، لە شوێنێكی دامەزراوو مەحكەمدا، نیشتەجێمان كرد، (كە مەبەست پێی منداڵدانی دایكە)، دوایی ئەو نوتفەیەمان گۆڕی بۆ عەلەقە، (كە وەك شێوەی زەروویەك خۆی بە منداڵدانی ئافرەت هەڵدەواسیٚ)، دوایی عەلەقەكەمان گۆڕی بۆ زارجوویەك، (واتە: پارچە گۆشتێك هێندەی زار جوویەك)، دوایی ئەو (مضغة)یەمان گۆڕی بۆ ئێسقان، پاشان ئێسقانەكانمان بە گۆشت داپۆشی. (ئەوە هەمووی پێكهاتەی یەكەم)، پاشان دەربارەی پێكهاتەی دووەم، دەفەرمویٚ: ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ﴾ واتە: دوایی كردمان بە دروستكراوێكی دیكە، كە دیارە دوای ئەوەیە كە ڕووحی بەبەردا دەكریٚ، لە چوارمانگ و دە شەو بە پشتەوە، ئەمەش قۆناغێكی دیكەو پێكهاتەی دووەم، بۆیە دەفەرمویٚ: ﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴾ بەرزیی و پیرۆزیی و گەورەیی بۆ خوای باشترینی بەدیهێنەران.

## ئنجا ئایا ڕووح و نەفس کامیان ئەصڵن؟ وە ئایا عەقڵ و قەلب پەیوەندییان چییە بە نەفسەوە؟

ئەوەی ئەبو حامید دەیڵێ، ویستم ئەو پێشەکی و ڕێخۆشکردنەی بۆ دانێم، ئەوەی کە من بەڕاستی دەزانم، ئەوەیە کە: (ڕووح) و (نەفس) هەر یەك شتن، ڕووح ئەو دروستکراوە تایبەتییە خواییەیە کە تەنها خوا خۆی دەزانێ چۆنە، دیارە ڕووح جیایە لە ژیان (حیاة)، ڕووحیش ژیانێکی تایبەتە، واتە: من قەناعەتم وایە کە ڕووح تایبەتە بە مرۆڤەوەو ژیاندارانی دیکە تەنیا ژیانیان هەیە، بەڵام ڕووح تایبەتە بە مرۆڤەوە، وە ڕووح پەرەسەندووترین و پێشکەوتووترین جۆری ژیانە، کە خوای پەروەردگار تایبەتی کردوە بە مرۆڤەوە، ئەو ڕووحەی کە لەتوانای دایە گەشە بکا، خراپە بکا، چاکە بکا، بێت و بچێ، ئەوە تایبەتە بە مرۆڤەوە، بەڵام زیندەوەرانی دیکە، خاوەنی ژیانن، چ لە ژیانێکی سادەی وەك: ئەمیبا کە ژیاندارێکی یەك خانەییە، تاکو باقی زیندەوەرو دڕندەو ئاژەڵ و باڵندەکانی دیکە، ئەوە ڕووح.

ئنجا ڕووح کە دەچێتە نێو جەستەوە لەگەڵ چوونی بۆ نێو جەستەو، هەتا لەنێو جەستەدا بێ، پێی دەگوترێ: نەفس، هەر لەبەر ئەوەشە کە ڕووح، نە مەدح کراوە نەزەمیش کراوە، بەڵام نەفس مەدحیش دەکرێ و زەمیش دەکرێ، چونکە ڕووح دوای ئەوەی دەچێتە نێو جەستە، دەتوانێ چاکەو خراپە بکا، ڕووح هەتا لە جەستەدا نەبێ، نەچاکەی لەدەست دێ، نە خراپە، بەڵام کە دەچێتە نێو جەستەوە، ئەو جەستەیە بەکار دێنێ بە ئەندامەکان و غەریزەکان و هەموو ئەو شتانەوە، کە لەجەستەی ئینساندا هەن، ئەو ڕووحە دەتوانێ ئەو جەستەیە بەکار بێنێ، بەباری خێرو بەباری شەڕدا، بۆیە خوا سبحانە و تعالی هەم مەدحی ئاڕاستەی نەفس کردوە، ئەگەر ئەو جەستەیە بەرەو خێر تاو بدات و بەکاری بێنێ، کە لە حاڵەتی: (أمارة بالسوء)ەوە، دەبێتە حاڵەتی (لوامة)، پاشان دەبێتە حاڵەتی (مطمئنة)و (راضية)و (مرضية)، وە ئەگەر بەرەو خراپەش بێ، دیارە

ئەو ڕووحە لەبارانی دا هەیە، ببێتە خراپترین دروستكراوی خوا، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾﴾ الأنفال.

واتە: بە دڵنیایی خراپتر پیڕۆ لەلای خوا ئەوانەی بێبڕوان، كە بڕوا ناهێنن، وە دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَـٰهُ أَسْفَلَ سَـٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾﴾ التين.

واتە: بە دڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین شێوەدا دروستكردوە، پاشان (بەهۆی بێبڕواییەوە) گێڕامانەوە بۆ نزمی هەرە نزمان. جگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو كردەوە باشەكان دەكەن، ئەوە پاداشتێكی نەبڕاوەیان هەیە. بەڵێ مرۆڤ لە توانای دایە زۆر زۆر بەرز بچێ، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَـٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾﴾ المطففين.

واتە: نەخێر وانیە، تۆماری (ناوی) چاكەكاران لەسەری سەرەوەیە، كەواتە: ئینسان دەگونجێ بەرەو (عِلِّیین) بچێ، هەروەها بە پێچەوانەشەوە: دەتوانێ زۆریش بەرەو نزمی بچێ، وەك دەفەرموێ:

﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَـٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾﴾ المطففين.

نەخێر، تۆماری (ناوی) خراپەكاران لە (سجین)ە[1]، ئنجا ئەو ڕووحە بەشەرییە، بەهۆی ئەو جەستەیەوە دەتوانێ ئەو هەڵداو پێداو بەرزیی و نزمییە بكات.

كەواتە: نەفس هەر ڕووحە بەڵام دوای ئەوەی كە لەگەڵ جەستەدا ئاوێتە دەبێ، وەك گوتم: بەپێی جۆری بەكارهێنانی بەباری خێردا یان بەباری شەڕدا، مەدح یان زەم ڕووی تێدەكا.

..............................................

١ سجين: موضع فيه كتاب الفجار وقال أبن عباس: رضي الله تعالى عنهما هو دواوينهم، قال أبو عبيدة: هو فعيل من السجن. مختار الصحاح، ص ٢٦٠.

عەقڵیش بێگومان پەیوەندیی بە مێشك (دماغ)ەوە هەیە، وەك زانست ئێستا بە چاكیی دەری خستوە، وە بەشێكی عەقڵ پەیوەندیی بە دڵیشەوە هەیە، كە تائێستا ڕەنگە زانست ئەوەی وەك پێویست بۆ یەكلایی نەبوو بێتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەوەی كە مێشك بەكار دێنێ، بۆ دەرك كردنی شتەكان، ڕووحە، هەروەك چۆن ئەوەی جەستە بەكار دێنێ، بۆ چاكەكاریی یان بۆ خراپەكاریی، هەر ڕووحە، كە لەو حاڵەتەدا پێی دەگوترێ: نەفس، بۆیەش ڕووح كە لەجەستەدا نەما، با مێشك ساغ و سەلیمیش بێ، تەماشا دەكەی ئینسان توانای بیركردنەوەو شیكردنەوەی نامێنێ، چونكە ئەوەی مێشكی بەكار دەهێنا، نەماوە، هەڵبەتە ئەو زانیارییانەی كە تێیدا تۆمار كراون، هەر هەن، بەڵام ئەو ڕووحە نەماوە كە مێشكی بەكار دەهێنا، وەك چۆن سەرجەم ئەندامەكانی جەستەش بەكاردێنێ و بەباری خێرو چاكە، یان شەڕو خراپەدا هەڵیان دەسووڕێنێ!

دڵ (قلب)یش وەك چۆن دەرك كردنی شتەكان، لە ڕێی ڕووحەوەیە، بەڵام بەهۆی مێشكەوە، ویستن و نەویستن و خۆشویستن و بوغزاندن و هەست و نەستە دەروونییەكانیش، پەیوەندییان بەو دڵە گۆشتینەوە هەیە، بەڵام دیسان لە ڕێگای ڕووحەوە، چونكە كاتێ شادمان دەبی، هەست دەكەی دڵت گوشاد دەبێ، ئەو دڵە گۆشتینەی كە خوێن دابەش دەكا، وە كاتێك كە خەمێك و ناڕەحەتییەك دادەگرێ، هەست دەكەی ئەو دڵە گۆشتینەت دەگوشرێ، كەواتە: دڵ چەقی بڕیاردانە، هەروەك مێشك چەقی دەرك كردن و پەی پێ بردنە، بەڵام چ پەی پێ بردنی مێشك، چ بڕیاردانی دڵ، هەمووی لە ڕێگای ڕووحەوە ئەنجام دەدرێ، كە وەك گوتم: ڕووح هەتا لەنێو جەستەدا بێ، پێی دەگوترێ: نەفس.
خوا سبحانه و تعالى بەنسبەت عەقڵەوە كە وشەكانی: (فوآد و نهية و حجر) یشی بۆ بەكار هێنراون، خوا سبحانه و تعالى زەم و مەدحی نەكردوە، چونكە دەرك كردنی شتەكان، خۆی لە خۆیدا شتێكی باشە، بەڵام بەپێی ئەو ئەنجامەی كەلێی دێتە دی، ئەو كاتە دەردەكەوێ بۆ چاكە بەكارهاتوە، یان بۆ خراپە؟ وە زەم و مەدحەكە لەوێدا دێتە دی، بەڵام دڵ (قلب) وانیەو، تەماشا دەكەین خوا سبحانه وتعالى دڵی بەچەند شێوەیەك وەسف كردوە، بۆ وێنە:

١- دڵی وەسف كردوە بەوەی ئارام دەگرێ بەهۆی یادی خواوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد.

٢- یاخود بەهۆی بەچاوی سەر دیتنی زیندوو بوونەوەی مردووان و بەرز بوونەوەی ئاستی زانست لە پلەی: زانیاریی تەواو (علم الیقین)ەوە وە بۆ دیتنی بەچاو (عین الیقین)، ئارامیی (إطمئنان)ی زیاتری بۆ دەڕەخسێ. وەك خوا لەسەر زمانی پێغەمبەر ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ، فەرموویەتی:

﴿ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ﴿٢٦٠﴾ ﴾ البقرة.

٣- وە لە حاڵەتی دیكەدا دڵی وا وەسف كردوە، كە ئیمان دەچێتە نێوی:

﴿ وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ﴿١٤﴾ ﴾ الحجرات.

٤- وە لە شوێنێكی دیكەدا باسی ڕاچڵەكین و ترسانی[1] دڵ كراوە، لە سۆنگەی یادكردنی خواوە، وەك خوا عز وجل لەبارەی بڕوادارانی ئیمان پتەوەوە دەفەرموێ:

﴿ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴿٢﴾ ﴾ الأنفال.

٥- بەڵام بۆ بێبڕوایان بە پێچەوانەوە، باسی دڵگووشەران و بێزاریی كراوە، بەهۆی یادی خوای بەرزو مەزنەوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ﴿٤٥﴾ ﴾ الزمر.

واتە: وە ئەگەر بەتەنیا باسی خوا بكرێ، ئەوانەی بێ بڕوان، دڵیان دەگووشرێ[2]، كەواتە: دڵ چەند حاڵەتێكی هەن: دەگونجێ ئیجابییانە مامەڵە لەگەڵ خواو،

(١) مختار الصحاح، ص ٦١٠.

(٢) إشمأز الرجل إشمزازا: إنقبض، وقیل: ذعر. مختار الصحاح، ص ٣٠٨.

لەگەڵ قورئان و، لەگەڵ یادی خوادا بكات، وە دەشگونجێ بە پێچەوانەوە مامەڵە بكا.

## هەروەها لە ڕووی ساغیی و نەخۆشیی دڵەوە:

١- خوا سبحانە و تعالی باسی دڵی كردوە كە دەگونجێ ساغ بێ، وەك دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ الشعراء.

واتە: ئەو ڕۆژەی كە نەسامان و نەكوڕان سوود ناگەیەنن. مەگەر كەسێك بەدڵی ساغەوە هاتبێتە لای خوا، هەروەها باسی ئیبراهیم دەكاو دەفەرموێ:

﴿إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾﴾ الصافات.

واتە: بە دڵێكی ساغەوە هاتە لای پەروەردگاری، كەواتە: دەگونجێ دڵ ساغ بێ.

٢- دەشگونجێ دڵ نەخۆش بێ، وەك خوای شارەزا سەبارەت بە مونافیقەكان دەفەرموێ:

﴿فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ﴿١٠﴾﴾ البقرة.

واتە: دڵیان نەخۆشیی تێدایە، خواش نەخۆشیی بۆ زیاد كردن. یان دەفەرموێ:

﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ﴿٧﴾﴾ آل عمران.

واتە: بەڵام ئەوانەی كە دڵیان لادانیی تێدایە، دەكەونە شوێن ئەو (ئایەت)انەی مانای وێكچوویان هەن، كەواتە: دڵ ساغ دەبێ و نەخۆش دەبێ، وە دەگونجێ دڵ هەڵوێستی ئیجابیی بێ، لەگەڵ خوای بێ وێنەو، لەگەڵ كیتاب و دینی خوادا، وە دەشگونجێ هەڵوێستی سەلبیی و خراپ بێ، بەڵام ئەوەی كە دڵ بەكار دەهێنێ، بێگومان ڕووحە.

كەواتە: دەتوانین بە كورتیی بڵێین: ئەو چوار وشەیە (روح، نفس، عقل، قلب) تەعبیر لە یەك حەقیقەت دەكەن و چوار ڕووی یەك حەقیقەتن، ئەویش بریتیە لە دیوی پەنهانی ئینسان، ئەو نهێنییەی كە ئینسانی پێ بۆتە ئینسان، ئینسانی

پێ جیا كراوەتەوە لە دروستكراوەكانی دیكە، كە بریتیە لەو فووە خواییەی بەبەر جەستەی مرۆڤدا كراوە، ئنجا ئەو فووە، یاخود ئەو دروستكراوە تایبەتییەی خوا:

١- ئەگەر لەدەرەوەی جەستەیە، پێی دەگوترێ: ڕووح.

٢- وە ئەگەر بێتە نێو جەستە پێی دەگوترێ: نەفس.

٣- وە بەو ئیعتیبارەی شتەكان دەزانێ و دەرك پێ دەكا، پێی دەگوترێ: عەقڵ.

٤- وە بەو ئیعتیبارەی كە بڕیار دەدا، بۆ چاكە یان خراپە، پێی دەگوتێ دڵ (قەلب). ئەمە كورتەیەك بوو لەباسی ڕووح و نەفس و عەقڵ و دڵ، لەبەر ئەوەی وەك گوتمان: تەزكیەی نەفس زۆر پەیوەندیی بەو دیوە پەنهانەی ئینسانەوە هەیە، كە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا: ئەو دیوە پەنهانەی مرۆڤ چوار ڕووی هەن، وە چوار ناوی بۆ بەكاردێن، بە چوار ئیعتیباری جیا جیا، ئەگەرنا لە حەقیقەتدا هەر یەكە، كەواتە: ئەوەی كە هەندێ لە ئەهلی تەصەووف دەڵێن: ئینسان ڕووحی هەیەو، نەفسی هەیەو ئەو دووانەش لەیەك جیان، وە دەڵێن: (سِرّ) و (خفي) و (أخفى)ش هەن! ئەوە وانیەو، وەك هەندێكی دیكە لە لێكۆڵەرەوانی بواری تەزكیەی نەفس دەڵێن: ئەوانە حاڵەتەكاتی ڕووح یان نەفسن و، نەفس و ڕووح كە بەچەند قۆناغێكدا دەڕۆن، هەر قۆناغێ دەگونجێ یەكێ لەو ناوانەی بۆ بەكاربێ، بەڵام ئەو شتە مەعنەوییە سەروو ماددییە، كە تەنها خوا دەیزانێ، (روح)ە، وە هەركات لە جەستەدابێ (نفس)ی پێدەگوترێ، هەر بۆیەش (روح) نە مەدح كراوە، نەزەم، چونكە (ڕوح) بۆ خۆی بەتەنیاو بەبێ جەستەو ئەندامەكانی، خێرو چاكەی لەدەست نایەت، تاكو بەو هۆیەوە، مەدح و ستایش بكرێ، هەروەها بە پێچەوانەشەوە: هیچ شەڕو خراپەیەكی لەدەست نایەت، تاكو بەو هۆیەوە، زەم و سەرزەنشت بكرێ.




# هۆكارەكانی تەزكیەی نەفس

ئەو هۆكارانە چین كە ئینسانی مسوڵمان بە گرتنە بەریان، دەتوانێ دەست بگەیەنێتە نەفسێكی تەزكیە كراو، وە خۆی پاك و چاك بكا؟ وە كارێكی وا بكات كە خوا پەرستییەكی باشترو پوختترو ڕێكترو پەسندتری لای خوا، ئەنجام بدا؟ ئێمە سەرجەم پازدە (١٥) هۆكارمان ڕیز كردوون، لەو هۆكارانەی كە بەگرتنە بەریان، ئینسان دەتوانێ دەست بگەیەنێتە تەزكیەی نەفس:

## هۆكاری یەكەم (ئیمان)

دیارە كە دەڵێین: ئیمان واتە: ئیمان بە هەر چوار پێكهێنەرەكەی و شەش پایەكانیەوە، بێگومان ئیمان دەروازەی هاتنە نێو بەندایەتییە بۆ خوا، وە ئیمان بناغەی دینداریی و بەندایەتییە بۆ خوا، بۆیە گەورەترین و بنەڕەتیی ترین هۆكاری صاڵح بوون و، بەرەو خوا چوون و پاك و چاك بوونیشە، ئێستا با ڕوونی بكەینەوە:

### مەبەستمان لە ئیمان چییە؟

ئیمان چوار پێكهێنەری سەرەكیی هەن، وەك من لە كتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا بە تەفصیل باسم كردوە:

**پێكهێنەری یەكەم**: بریتییە لە زانین و پەی پێبردنی ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، واتە:

١- ئیمان بەخوا: بەزاتی خوا، بە سیفەتەكانی، بە ناوەكانی، بە بەدیهێنەرایەتیی خوا، بە پەروەردگاریتی خوا، بە خاوەنداریتیی خوا.
٢- ئیمان بە فریشتەكانی خوا.
٣- ئیمان بەكتێبەكانی خوا.
٤- ئیمان بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).
٥- ئیمان بە ڕۆژی دوایی.
٦- ئیمان بەقەدەر.

بەڵێ پێكهێنەری یەكەمی ئیمان، بریتیە لە دەرك كردن و پەی پێبردنی ئەو شتانەی كە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، وەك خۆیان واتە: لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، كە ئەوە كاری عەقڵە.

**پێكهێنەری دووەم:** كە كاری دڵە، بریتیە لەوەرگرتن و قبووڵ كردن و پەسند كردن و خۆشویستنی، ئەو حەقیقەتە ئیمانییانەی كە عەقڵ دەركی كردوون، لە بەر ڕۆشنایی قوڕئان و سوننەتدا، كە ئەوەش كاری دڵە.

**پێكهێنەری سێیەم:** بریتیە لە دان پێداهێنانی زمان بەو شتانەدا كە بەعەقڵ دەرك كراون، وە بەدڵ قبوڵ كراون.

**پێكهێنەری چوارەم:** بریتیە لە جێبەجێ كردنی ئەندامەكان، بە كردەوە ئینسان ئەو شتانە لە خۆیدا بەرجەستە بكا.

بەڵگەمان لەسەر پێكهێنەری یەكەم: كە بریتیە لە: زانین و پەی پێبردنی عەقڵ، بەڵگەمان لەسەری ئەوەیە كە خوا سبحانە و تعالى دەفەرمویَ:

﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴿١٩﴾ ﴾ محمد.

خوا فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەكا دەفەرمویَ: بزانە! كە جگە لە خوا پەرستراوی دیكە نین، كەواتە: دەبێ خوا بەیەكگرتن پێشیَ دەركی پێ بكرێ و بزانرێ، زانیارییت لەو بارەوە هەبێ.

بەڵگەمان لەسەر پێكهێنەری دووەم: كە وەرگرتن و پەسند كردنی بەدڵە، بەڵگەمان لەسەری ئەوەیە كە خوا سبحانە و تعالى دەفەرمویَ:

﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ ﴿٢٢﴾﴾ المجادلة.

واتە: ئەوانە خوا ئیمانی لە دڵیاندا نووسیبوو، (كَتَبَ) نووسین، لێرەدا واتە: چەسپاندن، تۆمار كردن، كەواتە ئیمان دەبێ لە دڵیشدا بچەسپێ و قبووڵ بكرێ.

پێكهێنەری سێیەم: كە بریتیە لە دەربڕینی زمان، بەڵگەمان لەسەری ئەوەیە كە خوای بێ هاوەڵ لە سوورەتی (البقرة)دا فەرمان بە ئیمانداران دەكا، كە لە بەرانبەر خاوەن كتێبەكاندا بڵێین:

﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٦﴾﴾

پاشان دەفەرموێ:

﴿فَإِنۡ ءَامَنُواْ بِمِثۡلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا هُمۡ فِي شِقَاقٖ﴾.

كەواتە: كە دەفەرموێ: ئنجا ئەگەر ئیمانیان هێنا وەك ئەوەی كە ئەوان ئیمانیان پێ هێناوە، دیارە ئەوەش كە مسوڵمانان ئیمانیان پێ هێناوە، ئەوەیە كە بڵێین: (بڕوامان هێناوە بەخواو بەوەی بۆلامان دابەزێنراوەو، بەوەی بۆلای ئیبڕاهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و ئەسباط دابەزێنراوە، وە بەوەی كە بە مووساو عیسا دراوەو، بەوەی كە بە پێغەمبەران دراوە لەلایەن پەروەردگاریانەوە، جیاوازیی یان ناخەینە نێوان، وە ئێمە بۆی ملكەچین). كەواتە: دان پێداهێنانی زمان بەشێكە لە ئیمان، چونكە دوایی دەفەرموێ:

﴿فَإِنۡ ءَامَنُواْ بِمِثۡلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْ﴾

ئنجا ئەگەر ئیمانیان هێنا بەو شێوەیەی كە ئێوە ئیمانتان پێ هێناوە، ئەوە ڕێی ڕاستیان گرتوە، كەواتە: یەكێ لەو شتانەی كە ئیمانیان بەهۆیەوە پەیدا بووە، بریتییە لە دەربڕینی زمان، دان پێداهێنان و تەعبیر كردن بە زمان.

بەڵگەمان لەسەر پێكهێنەری چوارەم: كە بریتیە لە كردەوە، جێبەجێكردنی بە ئەندامەكان، بەڵگەمان ئەوەیە كە خوا سبحانە وتعالی لە باسی ڕوو

پێوەرسووڕاندنی مسوڵمانانەندا لە (بيت المقدس)ەوە بۆ كەعبە، كە هەندێ لە مسوڵمانان كەوتنە ئیشكال و گوتیان: ئەوانەمان كە پێشتر مردوون، یاخود كوژراون، نوێژیشیان كردوە ڕووەو (بيت المقدس)، ڕەنگە نوێژەكانیان زایە بووبن، چونكە ئەو قیبلەیە نەسخ بۆتەوە! خوا سبحانە و تعالى لەو بارەوە ئەو ئایەتەی ناردە خوارێ، كە دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة.

واتە: وە ناگونجێ خوا ئیمانتان زایە بكا، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: (إِيمَـٰنَكُمْۚ) أي: صَلاتَكُم[١]، واتە: خوا نوێژەكەتان زایە ناكا، نوێژ (صلاة)ی ناو ناوە ئیمان، كەواتە: نوێژ كە سەرەكیترین كردەوەی ئیماندارانە، خوا بە ئیمانی ناو بردوە كەواتە: كردەوە پێكهێنەرێكی ئیمانە.

لێرەدا ئەهلی سوننەت و جەماعەت، بەوە لە خەواریج و موعتەزیلە جیا دەبنەوە، كە خەواریج گوتوویانە: كردنی هەموو كردەوە باشەكان، وە نەكردنی هەموو كردەوە خراپەكان: پێكهێنەری ئیمانە، بۆیە ئەوان هەركەسێ واجبێكی چواندبێ، یاخود قەدەغەیەكی شكاندبێ، بەكافریان لەقەڵەم داوە، بەڵام موعتەزیلە گوتوویانە: ناڵێین: كافرە، بەڵام لە ئیمانیش چۆتە دەرێ، گوتوویانە: (لَهُ المَنزِلة بَيْنَ المَنزيلَتَين) واتە: پێگەیەك لەنێوان دوو پێگەكانداى هەیە! نە ئیماندار ماوەو، نە بۆتە كافریش، كە ئەوەش دیارە شتێكی بێ واتایە، چونكە ئەوەی مسوڵمان نەبێ و ئەهلی ئیمان نەبێ، دیارە كافرە[٢]، ئنجا جیاوازیی نێوان ئەهلی سوننەت

(١) صحيح البخاري: ٧٢٥٢، وصحيح مسلم: ٥٢٥، والترمذي: ٣٤٠، وأبن ماجة: ١٠١٠، وأحمد (٣/ ٢٨٣) عن البراء.

(٢) وەگەر بە (أهل الفترة) دابنرێ، چونكە پەیام و بەرنامەی خوای بە ڕوونیی و تەواویی پێنەگەیشتبێ، كە دیارە ئەو كاتە بە كافر دانانرێ، چونكە كافر بابایەكە هەقی پێ گەیشتوەو ڕەفزی كردەوەو داپۆشیوەو نادیدەی گرتوە، چونكە ((الكفر): التغطية... والكافر: الليل المظلم لأنه ستر بظلمته كل شيء، وكل شيء غطى شيئاً فقد كفره، قال أبن سكيت: ومنه سمي الكافر لأنه يستر نعم الله عليه) مختار الصحاح، ٤٩٦، ٤٩٧، كەواتە: كەسێك هەقی نەناسیبێ و ڕەفزی نەكردبێ، ناوی (كافر)ی بەسەردا ناچەسپێ، چونكە حەقی دانەپۆشیوە!.

و جەماعەت لەگەڵ خەواریج و موعتەزیلەدا، ئەوەیە كە: ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن: ئەصڵی كردەوە پێكهێنەری ئیمانە، نەك هەموو كردەوەیەك، بەڵكو جینسی كردەوە، بەتایبەتی نوێژ، وە كردەوە بەگشتی پێكهێنەری ئیمانە، نەک كردنی هەموو كردەوەیەكی باش و، وازهێنانی هەموو كردەوەیەكی خراپ.

كەواتە: ئیمان بە هەر چوار پێكهێنەرەكەی و، هەر شەش پایەكەیەوە، بەڕاستی هۆكارێكی گەورەو گرنگی تەزكیەی نەفسە، بەڵكو بنەڕەت و بناغەی تەزكیەی نەفس و، صاڵح بوون و بەرەو خوا چوونی ئینسانە، وە لە ڕاستیدا بەبێ ئیمان، جارێ ئینسان هەر نەبۆتە دۆستی خوا، هەر نەبۆتە بەندەی خواو، لە خوا نزیك نەبۆتەوە، جارێ هەر ڕووی نەكردۆتە خوا، ئاخر ئەگەر دۆستایەتیی لەگەڵ خوا نەگرێ، چۆن دەتوانێ لێی نزیك بێتەوە، چۆن دەگونجێ چاك خوا پەرستیی ئەنجام بدات، كە هێشتا نەبۆتە خوا پەرست؟ چونكە چاك خوا پەرستن، سەرووترە لە ئەصڵی خوا پەرستیی، مرۆڤ پێشێ دەبێ ئیمانی هەبێ و، ببێتە خوا پەرست، پاشان ببێتە چاك خوا پەرست و، لەخوا نزیك ببێتەوە، بەڵێ ئیمان بە هەر چوار پێكهێنەرەكەی و بەهەر شەش پایەكەیەوە، بنەڕەتییترین هۆكاری تەزكیە بوونی نەفس و، بەرەو خوا چوون و صاڵح بوونە، چونكە: وەك گوتمان: بەهۆی ئیمانەوە، ئینسان پەیوەست دەبێ بە خوای پەروەردگارەوەو دەبێتە بەندەی خواو، ڕوو دەكاتە خوا، ئنجا هەر كات ڕووی كردە خوا، دەگونجێ بەرەو خوا بچێ و، خۆی وا لێبكا جێگای ڕەزامەندیی خوا بێ.

## هۆكاری دووەم (ئیسلام)

ئیسلام بەهەر پێنج پایەكەیەوە، ئێمە پێشتر ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) باس كرد، كە جوبریل لە شێوەی پیاوێكدا پرسیاری لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كردوە، سەبارەت بە ئیسلام:

(أَخْبِرْنِي عَنْ الْإِسْلَامِ؟ (فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْإِسْلَامُ: أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ وَتَصُومَ رَمَضَانَ وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنْ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلا) رواه مسلم برقم: (٨).

### هەروەك چۆن پێناسەی ئیمان و ئیحسانیشی بۆ كردبوو، كەواتە: ئیسلام پێنج پایەی هەن:

### پایەی یەكەم:

ئەوەیە كە شایەتیی بدەی: جگە لە خوا هیچ پەرستراوی بەهەق نین، وە شایەتیی بدەی: موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانەكراوی خوایە، ئەو شایەتمانە كۆكەرەوەی هەر شەش پایەكەی ئیمانە، كە پێشتر باسمان كردن، چونكە كە تۆ شایەتییتدا كە جگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیكەی بەهەق نین، وە موحەممەدیش (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانە كراوی خوایە، كەواتە: هەرچی ئەو موحەممەدە لە خواوە هێناویەتی، لە: ئیمان بە خوا و فریشتەكان و بە كتێبەكان و بە پێغەمبەران و بە ڕۆژی دوایی و بە قەدەرو...هتد، ئەوە مانای وایە قەناعەتت وایە: ڕاستەو هەقە، كەواتە: شایەتمان هەر شەش پایەكانی ئیمان دەگرێتەوە.

### ئەدی ئایا جیاوازیی ئیمان لەگەڵ ئەو شایەتمانەدا چییە؟

ئیمان شتێكی پەنهانەو كەس پێی نازانێ، بەڵام شایەتمان جیاكەرەوەی مسوڵمان و نا مسوڵمانە، چونكە مرۆڤ كە شایەتمانی هێنا، ئەوە تەعبیر دەكا لە ئیمانەكەی

و تەعبیر دەكا لە بەندایەتیی خۆی بۆ خوای پەروەردگار، بۆیە هەندێ لە زانایان گوتوویانە: (الإيمانُ سِرٌّ وَالإِسْلامُ عَلانية)، ئیمان پەنهان و شێرراوەیە، بەڵام ئیسلام دیارو بەرچاوو ئاشكرایە، هەروەها بۆیەش زانایان دەڵێن: ئەو پێنج پایە، درووشمەكانی ئیسلامن، واتە: پێنج درووشمن كە ئینسانی مسوڵمان و كۆمەڵگای ئیسلامییان پێ دەناسرێتەوە. ئنجا كە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو پێنج پایەیە بە پایەكانی ئیسلام ناودەبا، وەك لە فەرموودەی دیكەدا هاتوە:

(عَنْ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ)، (أخرجه أحمد برقم (٦٠١٥)، والبخاري برقم (٨)، ومسلم برقم (١٦)، والترمذي برقم (٢٦٠٩) وقال: حسن صحيح. والنسائي برقم (٥٠٠١)، وابن حبان برقم (١٥٨). وأخرجه أيضًا: أبو يعلى برقم (٥٧٨٨)، وابن خزيمة برقم (٣٠٩)، والطبراني برقم (١٣٢٠٣)، والبيهقي برقم (٧٠١٣).

ئەوە مەبەستی ئیسلامەتیی كەسییە، كەسێك بمانەوێ بزانین مسوڵمانە یان مسوڵمان نیە؟ تەماشای دەكەین بزانین: شایەتمانی هەیە؟ ئەگەر دیتمان و بیستمان شایەتمانی هێنا ئنجا سەرنج دەدەین: ئایا نوێژی هەیە؟ ڕۆژووی هەیە؟ بەو درووشمانە دەتوانین بزانین ئایا ئەو شەخصە مسوڵمانە، یان نا؟، نەك مسوڵمانەتیی لەو پێنجانەدا كورت هەڵاتبێ و، هیچی دیكە نەبێ!، ئنجا دەربارەی گرنگی ئەو چوار دروشمەی خوا پەرستی واتە: نوێژو ڕۆژوو و زەكات و حەج، با سەرنجێك بدەین بزانین لە چ ڕوویێكەوە گرنگن بۆ مسوڵمان، تاكو نەفسی پاك و چاك بێ و، باشتر خوا پەرستیی بكا.

## گـرنگیی چــوار درووشــمەكەی خـــوا پەرستیی بــۆ نــەفــس تەزكـــیە بــوون:

## نـــوێژ:

دیارە بەنسبەت نوێژەوە ئەوە دەهێنێ كە زۆری لەسەر بنووسین، هەر بۆیەش من لە كتێبی (خوا پەرستیی ئیسلامیی) كە چوار بەرگە، بەرگێكم بەتایبەت و تەرخان كردوە بۆ نوێژ، بەڵام لێرەدا هەر بە كورتیی دەڵێین: نوێژە یەكەمین درووشمە بۆ ئەوەی بزانرێ، ئەو ئینسانە مسوڵمانە یان نا؟ وە بزانرێ كە بۆ خوا ملكەچە، یان نا؟ هەروەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە:

(الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ: الصَّلَاةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ) (أخرجه ابن أبي شيبة برقم (٣٠٣٩٦)، وأحمد برقم (٢٢٩٨٧)، والترمذي برقم (٢٦٢١)، وقال: حسن صحيح غريب. والنسائي برقم (٤٦٣)، وإبن ماجة برقم (١٠٧٩)، وإبن حبان برقم (١٤٥٤)، والحاكم برقم (١١)، وقال: صحيح الإسناد. والبيهقي برقم (٦٢٩١)، والدارقطني (٥٢/٢)، والديلمي برقم (٤٢٥٧) ، والمروزي في تعظيم قدر الصلاة برقم (٨٩٦)، وعبد الله بن أحمد في السنة برقم (٧٦٩). قال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي، وقال الألباني: صحيح.

واتە: ئەو پەیمانەی لەنێوان ئێمەو ئەوانە (واتە: نامسوڵمانان) بریتیە لە نوێژ، هەركەسێ نوێژی واز لێهێنا، ئەوە بێبڕوایە.

ئایا ئێمە بە چی بزانین ئەو ئینسانە ڕوو لە خوایە، یان پشت لەخوایە؟، تەماشا دەكەین بزانین سەجدەو ڕكووع بۆ خوا دەبا، یان نا؟ لەخزمەت خوادایە، یان نا؟ نوێژ دەكا، یان نا؟ هەر بۆیە ئەوەی مسوڵمان نیە، پێی ناگوترێ: ئەهلی قیبلە، چونكە ڕوو ناكاتە قیبلە، كەسێكیش نوێژ نەكا، ئەهلی قیبلە نیە، چونكە ڕوو ناكاتە قیبلە، بۆیە ڕای بەهێزترینی زانایان ئەوەیە، كە ئەوەی لە بنەڕەتدا نوێژ نەكاو سەر نەخاتە سەر زەوی بۆ خوا، با ئیددیعای مسوڵمانەتییش بكا، ئەوە بە مسوڵمان لەقەڵەم نادرێ، ئەوە ڕای بەهێزی زانایانە، وەك من لە بەرگی دووەمی كتێبی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا باسم كردوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی گرنگی نوێژ دەفەرموێ:

(إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ: صَلاتُهُ، فَإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ) (أخرجه الترمذي برقم (٤١٣)، وقال: حسن غريب، والنسائي برقم (٤٦٥)، وابن ماجة برقم (١٤٢٥)، قال: الشيخ الألباني: صحيح.

واتە: یەكەمین كردەوەی بەندە كە لە ڕۆژی قیامەتتدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەكرێ لەسەری، نوێژەكەیەتی، ئنجا ئەگەر نوێژەكەی باش بوو، ئەوە سەرفرازەو دەربازە، وە ئەگەر خراپ بوو، ئەوە پەشێمانەو زیانبارە.

ئەگەر خراپ بوو واتە: نوێژی نەبوو، یاخود هەیبوو بەڵام بە نیوە ناچڵیی، ئەگەر هەر نەیبوو، ئەوە ڕای زۆربەی زانایان ئەوەیە كە فڕی بە ئیسلامەوە نیە، وەكو عەبدوڵڵای كوڕی شەقیق دەڵێ:

(كانَ أَصْحابُ النَّبيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم لا يَرَوْنَ شَيْئاً مِنَ الأَعْمالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ، إلاَّ الصَّلاة) رواه الترمذي برقم (٢٦٢٢) قال الشيخ الألباني: صحيح.

واتە: هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێیان وانەبوو، هیچ كردەوەیەك وازهێنانی سەر دەكێشێ بۆ كوفر، جگە لە نوێژ، كەسێ نوێژی نەبووبێ پێیان وابووە بەشی بە ئیسلامەوە نەماوە.

هەروەها سەبارەت بە گرنگیی نوێژ بۆ پاك بوون و چاك بوون و تەزكیە بوونی ئینسان، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێكدا فەرموویەتی:

(مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ كَمَثَلِ نَهَرٍ جَارٍ غَمْرٍ عَلَى بَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ) أخرجه أحمد برقم (١٤٤٤٨)، وعبد بن حميد برقم (١٠١٤)، والدارمي برقم (١١٨٢)، ومسلم برقم (٦٦٨)، وإبن حبان برقم (١٧٢٥).

واتە: وێنەی نوێژەكان، وەك وێنەی ڕووبارێكی ڕۆیشتوو وایە، بەبەر دەرگای یەكێكتاندا، كە ڕۆژیی پێنج جاران خۆی لێ بشوا، وەك لە ڕیوایەتی دیكەدا هاتوە، فەرموویەتی:

(أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ، هَلْ يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ؟ قَالُوا: لَا يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ، قَالَ: فَذَلِكَ مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ يَمْحُو اللَّهُ بِهِنَّ الْخَطَايَا) رواه البخاري برقم (٥٢٨)، ومسلم برقم (٦٦٧).

واتە: ئایا ئەگەر یەكێ لە ئێوە رۆژی پێنج جاران لە رووبارێكی ئاو خاوێندا خۆی بشوا، هیچ چڵكی پێوە دەمێنێ؟ گوتوویانە: نەخێر، هیچ چڵكی پێوە نامێنێ، فەرموویەتی: ئەوە وەك پێنج نوێژە فەرزەكان وایە، خوا گوناهانیان پێ دەسرێتەوە كەواتە: بە تەئكید پێنج نوێژەكان كاریگەریی گەورەیان هەیە لەسەر تەزكیە بوونی ئینسان و صالح بوون و پاك و چاك بوونی ئینسان.

## زەكـــات:

دەربارەی زەكات، خوا سبحانە وتعالی بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ:

﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ﴿١٠٣﴾ ﴾ التوبة.

واتە: لە ماڵەكانیان صەدەقەو زەكات وەربگرە، تاكو پاكیان بكەی و چاكیان بكەی، تەزكیەیان بكەی، بەهۆی ئەو صەدەقەیەوە، كەواتە: زەكات و ماڵ بەخشین، دەبێتە هۆی نەفس تەزكیە بوون و پاك و چاك بوون، بەدەقی قورئان، چونكە كەسێ ماڵی خۆی ببەخشێ، مانا وایە رژدو چرووك نیەو، مانای وایە ماڵەكەی بە ئەمانەت دەزانێ، ئەوەش مانای وایە: نەفسی پاك و چاكەو، ماڵەكە لەبەر دەستی نەفسی دایە، نەك بە پێچەوانەوە،.

هەروەها خوا سبحانە و تعالی لە سوورەتی (الشوری) لە كاتی پێناسە كردنی ئیماندارانداندا بە سەرەكییترین سیفەتەكانیان، دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾

واتە: ئەوانەی بەدەنگی پەروەردگاریانەوە چوون، وە نوێژ بەرپا دەكەن، وە كاروباریان بە راوێژ ئەنجام دەدەن، وە لەوەی پێمان بەخشیون دەبەخشن.

## ڕۆژوو:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێكی قودسییدا لە خواوە دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

(قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلاَّ الصِّيَامَ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ) (أخرجه البخاري برقم (١٧٩٥)، ومسلم برقم (١١٥١)، والنسائي برقم (٢٢١٧)، وإبن حبان برقم (٢٠٥/٨).

واتە: هەموو كردەوەكانی ئینسان بۆ خۆینی، جگە لە ڕۆژوو، ڕۆژوو بۆ منەو، من پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژووش قەڵغانە. واتە: خاوەنەكەی دەپارێزێ لە گوناح، ئینسانیش ئەگەر لە گوناهان پارێزرا، مانا وایە نەفسەكەی پاك و چاك دەمێنێتەوە، وە خۆی پاك و چاك ڕادەگرێ.

هەروەها خوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕۆژوو گرتنتان لەسەر پێویست كراوە، وەك چۆن لەسەر ئەوانی پێش ئێوە پێویست كرا، بۆ ئەوەی تەقواتان پەیدا بێ، كەواتە: تەقوا بەرهەمی ڕۆژوو گرتنە، هەر كەسێكیش تەقوای هەبوو، مانا وایە نەفسی پاك و چاك بووە، وە خۆی پاك و چاك ڕاگرتوە.

## حـــــەج:

دەربارەی حەجیش خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بۆخوا لەسەر خەڵكی هەیە حەجی ماڵی خوا بۆ هەر كەسێ ڕێی تێبەرێ و بتوانێ، وە هەر كەسێكیش كافر بێ، ئەوە خوا بێنیازە لە جیهانییان، كەواتە:

کەسێکیش حەج ئەنجام نەدا، با لەخۆی بترسێ، لەوەی بچێتە ڕیزی کافرانەوە! وە دەربارەی کاریگەریی حەج لەسەر پاکیی و چاکیی نەفسی ئینسان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(مَنْ حَجَّ لِلَّهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ) أخرجه أحمد برقم (٧٣٧٥)، والبخاري برقم (١٤٤٩)، والنسائي برقم (٢٦٢٧)، وابن ماجة برقم (٢٨٨٩)، وابن حبان برقم (٣٦٩٤)، وأخرجه أيضًا: أبو يعلى برقم (٦١٩٨)، والبغوي في الجعديات برقم (٨٩٦).

واتە: هەر کەسێ حەج بکا بۆ خواو، قسەی خراپ نەکاو، کردەوەی خراپ نەکا (حەجێکی پاك و چاك و ڕێك و پێك ئەنجام بدا)، کە دەگەڕێتەوە، وەك ئەو ڕۆژە دەگەڕێتەوە، کە تازە لە دایکی خۆی بووە.

ئەوەش کورتەیەك دەربارەی کاریگەریی ئەو چوار درووشمەی خوا پەرستیی لەسەر نەفس تەزکیە بوون و، پاك و چاك بوون و، بەرەو خوا چوونی ئینسان.

## هۆكاری سـێیەم: وەدەست هـێنـانی زانـیاریی

هەر لەسەر تویژینەوەی هۆكارەكانی تەزكیەی نەفس بەردەوام دەبین، یەكی دیكە لەو هۆكارانەی كە كاریگەریی گەورەو گرنگیان هەیە، بۆ ئەوەی ئینسان دەستی بگاتە تەزكیەی نەفس، وە خۆی چاك بكاو خوا پەرستیی ڕێك و پێك و پوخت بۆ خوای پەروەردگار ئەنجام بدا، بریتیە لە وەدەست هێنانی زانیاریی، دیارە بەپلەی یەكەم مەبەستمان لە زانیاریی، زانیاریی شەریعەتە، وەحی خوای پەروەردگار كە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، هەڵبەتە لەوانەیە یەكێ بپرسێ: ئایا زانیاریی لە پێش ئیمان و ئیسلامیشەوە نیە؟
دەڵێین: با، وەك باسمان كرد: یەكەمین پێكهێنەری ئیمان بریتیە لە زانیاریی، كەواتە: لە ئیمان هێناندا، زانیاریی یەكەمین هەنگاوە، بەڵام پاش ئیمان هێنان خوا پەرستییەكان گەورەترین ڕۆڵ دەگێڕن لە تەزكیە كردنی نەفسدا، ئەگەر نا تۆ ئیمان بە چی دەهێنی؟ ڕوو دەكەیتە چی، بەرلەوەی عەقڵ ڕێ پێشان بداو، ئەو شتانە كەشف بكا، كە پێویستە دڵ قبووڵ و پەسندیان بكا؟ بەڵێ زانیاریی بە شەریعەت و وەحی خوا، یەكەمین هەنگاوی دینداریەو، یەكەمین هەنگاوی بەرەو خوا چوونەو، یەكەمین هەنگاوی بەندایەتیی كردنە بۆخوا، كە دیارە تەزكیەی نەفسیش، بەشێكی گرنگی دینداریی كردن و، بەرەو خوا چوون و، بۆخوا صوڵحانە، هەڵبەتە زانیاریی بەگشتی شتێكی پەسندو ویستراوە، بەڵام بۆ بەرەو خوا چوون و بەندایەتیی ئەنجامدان بۆ خوا سبحانە و تعالى، بەر لە هەموو شتێ، پێویستی بەو زانیارییە دەبێ، كە خوا بە پێغەمبەراندا علیهم الصلاة والسلام بەتایبەتی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله علیه وسلم) دا ناردوویەتی، كە بەشەر فێر بكەن چۆن بەندایەتیی بۆ خوا بكا، وە چۆن هەوڵ بدا خوای پەروەردگار لە خۆی ڕازی بكا، با لە قورئان و سوننەتدا تەماشای چەند دەقێك بكەین سەبارەت بەم مەسەلەیە:
١- لە سوورەتی (محمد)دا خوا سبحانە و تعالى بە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ ﴿١٩﴾ ﴾.
واتە: بزانە! بێگومان جگە لە خوا، هیچ پەرستراوی دیكە نین، وە داوای لێبووردن

لە خوا بكە بۆ گوناهەكەت، كەواتە: پێش ئەوەی بڵێی: (لا إله إلا الله)، دەبێ عیلمت هەبێ، دیارە ئەگەر زانیارییت نەبێ بە نێوەڕۆكی (لا إله إلا الله) بیشیڵێی، سوودی لێ نابینی و لێی بەهرەمەند نابی، كەواتە: بەتەئكید پێشێ زانیاریی و بەرچاو ڕوونیی پێویستە، كە خوا چی لەتۆ دەوێ؟ ئنجا بەرەو ئەوە هەنگاو بنێی كە خوا لەتۆی داوا كردوەو، ئەوە ئەنجام بدەی كە خوا داوای كردوە.

٢- لە سوورەتی (الحج) لە ئایەتی (٥٤)دا دەفەرموێ:

﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ ﴾.

پێشێ باسی چەند شتێك دەكا، پاشان دەفەرموێ: وە بۆ ئەوەی ئەوانەی زانیارییان پێدراوە بزانن كە ئەوە حەقە لە پەروەردگارتەوە، ئنجا دوای ئەوەی زانییان حەقە، ئیمانی پێ بێنن، سەرەنجام دڵیان بۆی ملكەچ بێ، وە بێگومان خوا ڕێنمایی كاری ئەوانەیە كە بڕوایان هێناوە، بەرەو ڕاستە شەقام، كەواتە: پێشێ دەبێ زانیاریی هەبێ، ئنجا ئیمان دەبێ، دوای ئەوەی زانییان حەقە، ئنجا ئیمانی پێ دێنن، وە پاشان دڵیان بۆی ملكەچ دەبێ و تەسلیمی دەبێ.

٣- لە سوورەتی (یوسف)یشدا خوا سبحانه و تعالی بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾.

واتە: بڵێ ئا ئەمە ڕێبازی منە، بەرەو لای خوا بانگ دەكەم لەبەر ڕۆشناییدا، خۆم و ئەوانەی شوێنم كەوتوون، وە پاكیی بۆ خوا من لە هاوبەشدانەران نیم، واتە: ڕێبازی پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) ئەوەیە كە لەبەر ڕۆشناییدا، خەڵك بۆ لای خوا بانگ بكەی، دەبێ لەسەر بەصیرەت بی و بەرچاوت ڕۆشن بێ، لە دینی خوا حاڵی بووبی و تێگەیشتبی، ئنجا خەڵكی بۆ بانگ بكەی، ئەگەرنا چۆن دەگونجێ خەڵك بۆ شتێ بانگ بكەی، كە هێشتا خۆت لێی شارەزا نی؟ وەك پێشتریش باسمان كرد.

دوایی كە دەفەرموێ: (أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي) واتە: من و شوێن كەوتووانم، كەواتە: شوێنكەوتووانی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) (مسوڵمانانیش) وەك پێغەمبەرەكەیان (صلی الله علیه وسلم) پێویستە بەبەرچاو ڕوونییەوە خەڵكی بانگ بكەن و، لەسەر بەصیرەت دینداریی بكەن، خەڵكی بۆ ئەوە بانگ بكەن كە پێشتر خۆیان تێیگەیشتوون.

دوایی كە دەفەرموێ: (وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ) وە پاكیی بۆ خوا، وە من لە هاوبەشدانەران نیم، واتە: پاكیی بۆ خوا من لە هاوبەشدانەران نیم، كە بەدوای نەزانیی و نەفامیی دەكەون، یاخود لاسایی كەرەوەی كوێرانەن، ئیماندار بەرچاو ڕوونانە شوێن دینی خوا دەكەوێ، نەك كوێرانە لاسایی بكاتەوە، هەر لە خۆوە شتێك بڵێ، كە خەڵك دەیڵێ، بێ ئەوەی كە بزانێ واتای چییە؟!.

٤- لە فەرمایشتێكدا هاتوە دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ:

{صَنَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا، فَرَخَّصَ فِيهِ، فَتَنَزَّهَ عَنْهُ قَوْمٌ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخَطَبَ فَحَمِدَ اللَّهَ، ثُمَّ قَالَ: (مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَتَنَزَّهُونَ عَنْ الشَّيْءِ أَصْنَعُهُ فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً} رواه البخاري برقم (٥٧٥٠).

دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ شارەزاترین كەس بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە چوار چێوەی خێزاندا، دەڵێ: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شتێكی كرد، كاری بە مۆڵەت كرد، (ئاسانگیریی كرد لە شتێكدا) بەڵام كەسانێك ئەو مۆڵەتەی پێغەمبەری خوایان (صلی الله علیه وسلم) قبووڵ نەكردو خۆیان بەپاكگرت، لەوەی ئەو شتە بكەن!، ئەوەش گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەویش وتاری بۆ دان و ستایشی خوای كرد، دوایی فەرمووی: بۆچی كەسانێك خۆیان بە دوور دەگرن و شتێك ناكەن، كە من مۆڵەتم پێ دراوەو كردوومە؟ {ئایا خۆیان پێ لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مسوڵمانترو پاكترو بەدینترە}، سوێند بەخوا من لە هەموویان بەخوا زاناترم، وە لە هەمووشیان زیاتر لێی دەترسێم.

بێگومان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەك هەر لە هاوەڵان، بەڵكو لە

هەموو ئۆممەتەکەی زاناتر بووە، بەخوای پەروەردگار، وە لەهەمووشیان زیاتر لێی ترساوە، کەواتە: ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە کێ زاناتر بێ بە خوای پەروەردگار، زیاتری لێ دەترسێ، بۆیە ئەگەر بمانەوێ نەفسمان چاك بکەین، ئەگەر بمانەوێ زیاتر بەرەو خوا بچین و، دینداریيەکەمان چاکتر بکەین، دەبێ زیاتر مشووری بەرچاو ڕوونیی و زانست و زانیارییمان بخۆین، کە تۆ نەزانی خوا کێیە؟ ناوە جوانەکانی چین؟ سیفەتە پاك و بەرزەکانی چین؟، وە نەزانی بەدیهێنەرایەتیی خوا یانی چی؟ پەروەردگارێتیی خوا یانی چی؟، پەرستراوێتیی خوا یانی چی؟ خوا چی لە بەندەکانی داوا کردوە؟ چی لێ قەدەغە کردوون؟ دەبێ چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ؟ ئەگەر ئەوانە نەزانی، چۆن دەتوانی بەرەو خوا بچی؟ چۆن دەتوانی بەرەو خوایەك بچی، کە پێی ئاشنا نی؟ کە نازانی ڕەزامەندیی خوا لەچیدایە؟

٥- هەر لەو بارەوە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)یش دێنین کە دەفەرموێ:

(مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ) أخرجه أحمد برقم (١٦٩٢٤)، والبخاري برقم (٧١)، ومسلم برقم (١٠٣٧)، وابن حبان برقم (٨٩)، وأخرجه أيضًا: الدارمي برقم (٢٢٤).

واتە: هەر کەسێ خوا چاکەی بۆی بوێ، لە دیندا شارەزای دەکا.
کەواتە: لە دیندا شارەزا بوون مانای وایە کە خوا چاکەی بۆ ئەو بەندەی خۆی ویستوە، چونکە بەبێ شارەزایی ئینسان ناتوانێ لەدین بەهرەمەند بێ، ناتوانێ تووشی هیچ چاکەیەك ببێ لە دینداریيدا، شارەزایی و بەرپێی خۆ دیتن، هەنگاوی یەکەمی دینداریيە بەگشتی، وە تەزکیەی نەفس و زیاتر لە خوا نزیك بوونەوە، بە تایبەت پێویستیی بە زانیاریی و شارەزایی زیاتریش دەکا.

٦- هەر لەو بارەشەوە زانایان قسەی جوان جوانیان کردوون، یەکێك لەوانە ئەو دێڕە شیعرەی (السنوسي)ە کە دەڵێ:

(وكلُّ مَن بِغَيرِ عِلْمٍ يَعْمَلُ   أَعْمالُهُ مَرْدودَةٌ لا تُقْبَلُ[1]).

---

(١) بوارق الحقائق، محمد مهدي بهاءالدين الرواس. تحقيق: عبد الحكيم القباني. الطبعة الرابعة. (د.ن.). دمشق.١٩٩٤م، ص٢١٨.

واتە: هەر كەسێ بەبێ زانیاریی كردەوە بكا، (واتە: تاعەتێكی زۆرو چاك بە حیسابی خۆی ئەنجام بدا، بێ ئەوەی زانیاریی و شارەزایی پێی هەبێ)، ئەوە كردەوەكانی ڕەت كراونەتەوەو لێی وەرناگیرێن.

وە مالیك ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەو بارەوە قسەیەكی جوانی هەیە، دەڵێ:

(مَنْ تَفَقَّهَ وَلَمْ يَتَصَوَّف فَقَدْ تَفَسَّق، وَمَنْ تَصَوَّفَ وَلَمْ يَتَفَقَّه فَقَدْ تَزَنْدَق، وَمَن جَمَعَ بَيْنَهُما فَقَدْ تَحَقَّق)[1].

واتە: هەر كەسێ شارەزاو بەرچاو ڕوون بێ لە شەریعەتدا، بەڵام تەزكیەی نەفس و تەصەووفی نەبێ، ئەوە بەرەو فیسق و لادان دەچێ، (زۆر كەس دەبینی بە حەڵاڵ و حەڕام شارەزایە، بەڵام لە ئەنجامی ئەوەدا كە ترس و سام و ڕێزو خۆشەویستی خوای لەدڵدا نیە، دڵەكەی تەزكیە نەبووە، دەروونەكەی پاك و چاك نەبووە، بەرەو فیسق و لادان دەچێ ئەوە شتێكی ئاشكرایە)، وە هەر كەسێك تەصەووفی هەبێ، بەڵام شەرع زان و شارەزا نەبێ، ئەوە بەرەو بێدینیی چووە، (واتە: هەركەس شارەزا نەبێ لە شەریعەت، ئنجا بشیەوێ نەفسی تەزكیە بكاو بەرەو تەصەووف و عیرفان بچێ، ئەوەش سەری لە زەندەقەو بێ دینیی دەردەچێ)، بەڵام هەركەسێ هەوڵ بدا هەردووكیان پێكەوە كۆ بكاتەوە، (واتە: هەم زاناو بەرچاو ڕوون بێ، هەم كار لەسەر خۆی بكاو، خۆی تەزكیە بكا)، ئەوە حەقیقەتی پێكاوە.

هەڵبەتە لێرەدا بۆیە جەختم لەو خاڵە كرد، چونكە ژمارەیەك لە ئەهلی تەصەووف، هەندێ قسەو قاڵیان هەیە لەو بارەوە بۆ وێنە: گوایە شەریعەت بۆ عەوامە، بەڵام ئەوەی ئەهلی تەصەووف بێ، یەكسەر زانیارییەكانی لەخواوە دەست دەكەوێ، ئەوان حەقیقەتەكان لەخواوە وەردەگردن!!، كە بەدڵنیاییەوە ئەو قسانە لە تەرازووی شەریعەتدا بایی فلسێك نین، چونكە وەك دوایی باسی دەكەین: شەریعەت تاكە سەرچاوەی ڕوونی دینداریی و تەزكیەیەو، هەر كەسێ بیەوێ بە هەر حەقیقەتێك بگات، لە دینداریی و خوا پەرستییدا، دەبێ لە دەریای شەریعەتدا بۆی بگەڕێ، كۆتایی ئەو بابەتەش بە قسەیەكی (ئیبن و لبەنناى سەرقوستیی) دێنین، كتێبێكی هەیە بەناوی: (المباحث الأصلية)، كە

.......................................

(١) إيقاظ الهمم- ج١- ص٩١.

باسی تەزكیەو تەصەووف دەكا، ئنجا سەبارەت بەوە كە زانیاریی پێویستە بۆ هەنگاو نان بەرەو تەزكیەو تەصەووف، دەڵێ:

وشـرطوا العلوم في اصطلاحه ......إذ لا غنىً للباب عن مفتاحه

فــليس للطــامع فيـه مــطمع ......ما لم تكن فيه عــلومٌ أربع

وهي علوم الذات والصفات ......والفقه والحديث والحالات[1].

دەڵێ: پسپۆڕەكانی تەزكیەی نەفس، زانیارییان بە مەرج گرتوە، بۆ ئەوەی ئینسان بەرەو تەزكیەی نەفس و بۆ خوا صوڵحان و بەرەو خوا چوون بچێ، چونكە دەرگا بێنیاز نیە لە كلیلەكەی و، بۆ كردنەوەی دەرگا دەبێ كلیلەكەت پێ بێ، (زانیاریی)یش كردنەوەی دەرگای تەزكیەی نەفس و بەرەو خوا چوونە، وە هەر كەسێك ئومێدێكی هەبێ و لەو بارەوەو بیەوێ پێی بگا، هیچ ئەنجامێكی بۆ نایەتە دی، مادام ئەو چوار زانیارییەی تێدا نەبن، كە بریتین لە:

**یەكەم:** زانیاریی هەبوون بە زات و سیفەتەكانی خوا، واتە: خوا بەیەكگرتن (التوحید).

**دووەم:** شارەزا بێ بە شەریعەت.

**سێیەم:** شارەزا بوون لە سوننەت.

**چوارەم:** شارەزا بێ بە حاڵەتەكانی نەفس، شارەزا بێ بەوەی كە نەفسی بەشەر چۆن دەگوازرێتەوە، لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێكی دیكە: چۆن لە حاڵەتی زۆر فەرمانكەر بە خراپە (الأمارة بالسوء) وە بیگوازیەوە بۆ حاڵەتی سەركۆنەكەر (لوامة) كە حاڵەتێكی نێوەنجییە، وای لێبكەی كە سەركۆنەت بكا لەسەر خراپە، وە سەركۆنەشت بكات لەسەر چاكە، كە بۆچی ئەو چاكەیەی نەكردوە؟، پاشان چۆن لەو حاڵەتەشەوە دەیگۆڕی بۆ حاڵەتی ئارامگرتوو (المطمئنة)ە، كە تەسلیم و ملكەچ بێ بۆ شەریعەتی خواو، لام و جیمی نەمێنێ بەرانبەر بە شەریعەت، بەتەواویی وەك ماستی مەییوی لێبێ، كە ئەوە باشترین حاڵەتە ئینسان پێی بگا، وە ئەو حاڵەتە حاڵەتێكی زۆر بەرزو باڵایە، وەك خوای بەبەزەیی دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ ﴾ الفجر.

(١) إيقاظ الهمم- ج١- ص ١٦٩.

## هۆكاری چوارەم: یادی خوا (ذكر الله):

ئێمە لە زمانی كوردییدا لە شوێنی وشەی (ذكر) وشەی (یاد) بەكار دەهێنین: (ذكر الله) واتە: (یادی خوا)، یاخود وشەی (باس) بەكار دەهێنین: (باسكردنی خوا).

## یـادی خــوا یـانی چی؟

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الذكر ذكران: ذكر بالقلب، وذكر باللسان، وكل واحد منهما ضربان: ذكر عن نسيان، وذكر لا عن نسيان، بل عن إدامة الحفظ)[1].

واتە: زیكر دوو جۆرە: زیكر بە دڵ و زیكر بە زمان، وە هەر كامێكیش لەوانە دوو جۆرە: یادكردنێك دوای لە بیر چوونەوە، وە یاد كردنێك بەبێ لەبیر چوونەوە، بەڵكو بە درێژە پێدانی یادكردنەوەو بەردەوام بوون لەسەری.

## كاریگەریی یادی خوا لەسەر تەزكیە بوونی ئینسان و، صاڵح بوون و بەرەو خوا چوونی، لە قورئاندا:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾﴾ الأحزاب.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە یاد كردنێكی زۆر یادی خوا بكەن، وە بەیانیان و ئێواران بەپاكی بگرن، (خوا) ئەو كەسەیە كە خۆی و فریشتەكان صەڵەواتتان لێ دەدەن، (خۆی ڕەحمەتتان بۆ دەنێرێ پاكو چاكتان دەكات، فریشتەكانیش داوای ڕەحمەت و پاكیی و چاكییتان بۆ لە خوا دەكەن)، بۆ ئەوەی لە تاریكاییەكان دەربازتان بكات بەرەو ڕۆشنایی، وە خوا بەرانبەر ئیمانداران

.......................................

(١) مفردات ألفاظ القرآن- ص٣٢٨.

میهرەبان و بەبەزەییە، ئەو ڕۆژەی کە پێیان دەگات، سەلامیان لێ دەکا، وە پاداشتێکی پڕ سۆزو ڕەحمەتی بۆ داناون.

لەم ئایەتە موبارەکەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کە لەئەنجامی ئەوەدا کە ئینسان زۆر یادی خوا دەکات، خوا صەڵاواتی لەسەر دەدات، وە فریشتەکان صەڵاواتی لێ دەدەن، وە سەرەنجام بەهۆی صەڵەواتی خواو ڕەحمەتی خوا، وە بەهۆی دوعای فریشتەکانەوە، لە تاریکاییەکان دەرباز دەبێ بەرەو ڕۆشنایی، ئەوەش دیارە هاتنە دی حاڵەتی تەزکیەی نەفسەو، هاتنە دی حاڵەتی پاك و چاك بوونی ئینسانە.

٢- لە سوورەتی (العنكبوت)دا خوا بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: ئەوەی لە کتێبی خوا بۆت نێردراوە، (بۆت سرووش کراوە) بیخوێنە، وە نوێژ بەرپا بکە، بێگومان نوێژ (خاوەنەکەی) لە شتی خراپەو ناقۆڵا دەگێڕێتەوە، وە یادی خوا گەورەترە، واتە: یادی خوا لەنوێژ گەورەترە، وە لە قورئان خوێندنیش گەورەترە، چونکە نوێژیش بۆ ئەوەیە تۆ یادی خوا بکەی، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ﴿١٤﴾ ﴾ طه.

واتە: وە بۆ یادکردنی من نوێژ بەپا بکە! وە قورئانیش هەر بۆ ئەوە هاتوە، کە خەڵك یادی خوا بکەن و خوای خۆیان بناسن، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾ التكوير.

پاشان خوا دەفەرموێ:

﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴾

وەخوا ئەوە دەزانێ کە ئێوە ئەنجامی دەدەن، با بەپەنهانییش ئەنجامی بدەن.

٣- لە سوورەتی (الأحزاب)دا خوا دەفەرمویَ:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقییەکی چاك هەیە بۆ ئێوە، (یاخود چاکترین سەرمەشقیی و پێشەوایەتیی هەیە بۆ دینداریی و دنیاداریی) بۆ کەسێك بە ئومێدی خواو ڕۆژی دوایی بێ، وە زۆر یادی خوا بکا، کەواتە: کێن ئەوانەی دەتوانن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەنە سەرمەشقی خۆیان؟

ئەوانەن کە زۆر یادی خوا دەکەن، ئەوانە کە بە ئومێدی بەزەیی خوان و بە ئومێدی ڕۆژی دواییین، کەواتە: زۆر یادی خوا کردن، وا لە ئینسان دەکا، شایستەی ئەوەبێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکاتە سەرمەشقی خۆی، لە هەردو بواری دینداریی و دنیادارییدا.

٤- هەروەها دیسان لە سوورەتی (الأحزاب)دا لە سیاقی خستنە ڕووی دە (١٠) سیفەتی مسوڵماناندا خوا دەفەرمویَ:

﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾ ﴾

کەواتە: زۆر یادی خواکردن بۆ پیاوان و ئافرەتان، لەگەڵ ئەو نۆ سیفەتەی دیکەدا، کە لە ئایەتەکەدا باس کراون، وایان لیَ دەکا، کە خوا پاداشتێکی مەزنیان بداتیَ، وێڕای لێبوردنێکی گەورە.

٥- هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)دا خوا دەفەرمویٚ:

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ ﴾

واتە: بێگومان لە دروست كردنی ئاسمانەكان و زەوی و جیٚ گۆڕكێی شەوو ڕۆژاندا (جیاوازیی شەوو ڕۆژاندا) نیشانەگەل هەن بۆ خاوەن عاقڵان، (ئنجا خاوەن عاقڵان ئاوا پێناسە دەكات) ئەوانەی یادی خوا دەكەن، بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان، وە بیر لە دروستكرانی ئاسمانەكان و زەوی دەكەنەوە، دەڵێن: پەروەردگارمان! ئەو (بوون)ەت بە هەوەنتە دروست نەكردوە، پاكیی بۆتۆ لە سزای ئاگر چەپاڵەمان بدە!

كەواتە: كیٚ دەركی نهێنییەكانی بوونەوەر دەكاو، بوونەوەر دەكاتە نیشانە لەسەر پەروەردگاریتیی خوا، وە بەهۆی بوونەوەرەوە خوای بوونەوەر دەناسیٚ؟ ئەوانەی كە زۆر یادی خوا دەكەن، واتە: هەم عەقڵیان هۆشیارە، هەم دڵیان بێدارە، هەڵبەتە كەسانێك كە عەقڵیان هۆشیارە، بەڵام دڵیان بێدار نەبیٚ، زۆر شت دەزانن، بەڵام زانینەكەیان ناگۆڕیٚ بۆ توانین و، حاڵی بوونەكەیان تێدا نابیٚ بە حاڵ.

## گرنگی یادی خوا لە بواری تەزكیەی نەفسدا، لەبەر ڕۆشنایی هەندێ لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)

١- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلاً قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ شَرَائِعَ الْإِسْلَامِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ فَأَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ، قَالَ: (لاَ يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ)} أخرجه أحمد برقم: (١٧٧١٦) والترمذي برقم: (٣٣٧٥) وقال: حسن غريب. وابن أبي شيبة برقم: (٢٩٤٥٣)، وابن ماجة برقم: (٣٧٩٣)، وابن حبان برقم: (٨١٤)، والحاكم برقم: (١٨٢٢) وقال: صحيح الإسناد. والبيهقي برقم: (٦٣١٨). وأخرجه أيضًا: ابن المبارك برقم: (٩٣٥)، والطبراني في الأوسط برقم: (٢٢٦٨)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، وقال الشيخ الألباني: صحيح.

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی بوسر دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) دەرگاكانی خێر زۆرن، منیش ناتوانم هەموویان جێ بەجێ بكەم، شتێكم پێ بڵێ توند بیگرم (بەڵام با زۆر نەبن نەوەك لەبیرم بچنەوە)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (با بەردەوام زمانت تەڕو پاراو بێ بە زیكری خوا).

٢- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ) قَالُوا: وَمَا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ) أخرجه أحمد برقم: (٩٣٢١)، ومسلم برقم (٢٦٧٦)، وابن حبان برقم (٨٥٨)، وأخرجه أيضًا: الطبراني في الأوسط برقم (٢٧٧٣).

واتە: تاك بووەوان پێشكەوتن، (ئەوانەی كە تاك بوونەوەو لە خەڵك جیان)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! تاك بووەوان كێن؟ فەرمووی: (ئەوانەی كە زۆر یادی خوا دەكەن لە پیاوان و ئافرەتان).

٣- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ تَعَاطِي الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَمِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ غَدًا فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ)قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (ذِكْرُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ). أخرجه أحمد برقم (٢١٧٥٠)، قال المنذري (٢٥٤/٢) والهيثمي (٧٣/١٠): إسناده حسن، والترمذي برقم (٣٣٧٧)، وابن ماجة برقم (٣٧٩٠)، والحاكم برقم (١٨٢٥) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في الشعب برقم (٥١٩)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله رجال الصحيح غير أبي بحرية، قال الشيخ الألباني: صحيح.

ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) {دیارە هاوەڵانی لە دەورەی دانیشتوون} فەرمووی: (ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە چاكترینی كردەوەتان، وە كردەوەیەك ببێتە هۆی بەرز بوونەوەی پلەكانتان، وە لەلای خاوەن و حوكمڕانتان (كە خوای پەروەردگارە) لە هەموو كردەوەیەك زیاتر ببێتە هۆی تەزكیە بوونتان، وە بۆ ئێوە زیاترو باشتر بێ لەوەی زێڕو زیو ببەخشن، (دراوی ئەو كاتە یان دینار بووە، یان درهەم بووە، دینار زێڕ بووە، درهەمیش زیو بووە)، وە باشتر بێ بۆ ئێوە لەوەی بگەنە دوژمنتان، لە گەردنیان بدەن، یان لە گەردنتان بدەن، (واتە: لەوەش چاكتر بێ كە لەڕێی خوادا جەنگ بكەن، بكوژن یان بكوژرێن)، گوتیان: با، (هەواڵمان پێ بدە) ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی: یادی خوا.

یانی: یادكردنی خوا لە هەموو ئەوانە باشترە، بەڵێ ئەو كردەوانەش هەر كامێكیان لە مەقامی خۆیدا، لە هەموو كردەوەكان باشترە، جاری وا هەیە ماڵ بەخشین لە پێناوی خوادا، لە هەموو كردەوەیەك چاكترە، جاری وا هەیە نوێژ كردن لەكاتی خۆیدا (الصلاة علی وقتها)، لە هەموو كردەوەكانی دیكە باشترە، هەروەك لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە[1]،

(١) عَن أَبِي عَبْدالرَّحمن عَبْدِ اللَّهِ بن مَسْعود رَضِيَ الله عَنهُ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى؟ قَالَ: {الصَّلَاةُ عَلَى وَقْتِهَا...} رواه البخاري برقم (٥٢٧)، ومسلم برقم (٨٥).

بەڵام نوێژیش هەر دەبێ بۆ ئەوەبێ کە خوات لەیاد بێ، نوێژیش ئەگەر بە دڵێکی بێئاگاوە بیکەی و پەیوەستت نەکات بەخواوە، ئەوە لە نوێژەکەت بەهرەمەند نەبووی، هەروەها ڕۆژووش ئەگەر بۆ ئەوەت نەبێ، لەخوات نزیك بکاتەوەو ببێتە مایەی یادی خوا، ئەوە هەر تینوێتی و برسێتیت پێ بڕاوە! بۆیە یادی خوا هەوێنی هەموو کردەوەکانەو، ڕووحی هەموو کردەوەکانەو، نوێژو ڕۆژووو جەنگ و جیهاد لە پێناوی خوادا، هەموویان دەبێ بۆ یادی خوابن.

٤- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك بە هاوەڵانی بەڕێزی خوا لێیان ڕازی بێ فەرموو:

(جَدِّدُوا إِيمَانَكُمْ) قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ نُجَدِّدُ إِيمَانَنَا؟ قَالَ: (أَكْثِرُوا مِنْ قَوْلِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) أخرجه أحمد برقم (٨٦٩٥)، قال الهيثمي (٥٢/١): إسناده جيد وفيه سمير بن نهار وثَّقَه إبن حبان. وعبد بن حميد برقم (١٤٢٤)، والحاكم برقم (٧٦٥٧) وقال: صحيح الإسناد. وأخرجه أيضًا: أبو نعيم في الحلية (٣٥٧/٢). قال شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە هاوەڵانی بەڕێزی فەرموو: (ئیمانتان تازە بکەنەوە)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چۆن ئیمانمان تازە بکەینەوە؟ فەرمووی: (زۆر بڵێن: لا إله إلا الله)، واتە: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوی بەهەق نین.

لە فەرمایشتی دیکەدا هاتوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(وَخَيْرُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَه، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْد وَهوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدير) رواه الترمذي برقم: (٣٥٨٥) قال الألباني: حسن.

واتە: باشترین شتێك کە من و پێغەمبەرانی پێش من گوتوومانە: بریتیە لە ڕستەی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَه، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْد وَهوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدير) جگە لە خوا هیچ پەرستراوی بەهەق نین، تاکەو هیچ هاوبەشی نین، موڵك و ستاییش هەر بۆ وییە، وە لەسەر هەموو شتێك توانایە.

٥- بۆ ڕوونكردنەوەی چۆنیەتی زۆر یادی خوا كردن، هەروەها ئەوە كە ئایا زۆر یادی خوا كردن، چ دەگەیەنێ؟! ئەم فەرموودەیە دێنین:

(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ)) رواه مسلم برقم (٣٧٣).

واتە: دایكمان عائیشە سەلامی خوای لێبێ، كە زۆر چاك شارەزای ژیانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووە، چونكە هیچ كەس هێندەی هاوسەر، هاوسەری خۆی ناناسێ، كە هەمیشە لەگەڵیەتی لە هەموو حاڵاندا دەیبینێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا لە هەموو حاڵانیدا باس و یادی خوای بەرزی دەكرد، یانی: لە حاڵەتی خەودا كە كەلەكاو كەلەكەی كردوە، لەكاتی هەستاندا، لەكاتی نان خواردندا، لە كاتی لەماڵ چوونەدەردا، لەكاتی هاتنەوە ماڵدا، لەكاتی خۆشییدا، لەكاتی ناخۆشییدا، لە هەموو حاڵاندا، یادی خوای كردوە. دیارە كتێبی تایبەت هەن لەبارەی یادی خواوە، بۆ وێنە: كتێبی (الأذكار)ی نەوەویی، وە (تحفة الذاكرين)ی شەوكانیی، وە (الحصن الحصين) وە گەلێ كتێبی دیكە، ئەو زیكرانەی كە وا لە ئینسان دەكەن پەیوەست بێ بە خوای پەروەردگارەوە، ئەوانەی كە وا دەكەن لە هەموو حاڵاندا ئینسان خوای لەیاد بێ، ڕۆژانە هەموو ئەو زیكرانە دیاریی كراون.

لە كتێبەكاندا زانایان باسیان كردوە، منیش لە كۆتایی بەرگی (٤)ی (خوا پەرستیی ئیسلامیی)دا بە تەفصیل باسم كردوون، هەروەها لە بەرگی شەشەمی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا.

كەواتە: ئەگەر ئینسان زۆر یادی خوا بكا، وەك ئەوە كە خوا فەرموویەتی و بەو شێوەیەی كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دیاریی كردوە كە چۆن یادی خوا بكەین، ئەوە بێگومان: هەمیشە دڵەكەی هۆشیارو بێدار دەبێ و، شەیتان ناتوانێ زەفەری پێ ببا، چونكە شەیتان لە حاڵەتی غەفڵەت و بێ ئاگاییدا زەفەر بە ئینسان دەبا، خوای بەبەزەیی لەو كەسانەمان بگێڕێ، كە زۆر یادی خوا دەكەن و، لە هەموو حاڵاندا خوای بەرزو مەزنیان لە یاد دەبێ.

## هۆكاری پێنجەم: قورئان خوێندن و گوێ بۆ گرتنی

دیارە ئێمە لە باسی پێشوودا باسی یادی خوامان كرد، كە هۆكارێكی گەورەو گرنگی تەزكیەی نەفسە، قورئان خوێندنیش بێگومان لە هەموو جۆرەكانی دیكەی یادی خوا (ذكر الله) گەورەترە، چونكە قورئان فەرموودەی خوایە، فەرموودەی خواش لە قەدەر خوایە سبحانە و تعالی، وە پاشان قورئان هەموو جۆرەكانی یادی خوای گرتوونەتە نێو خۆی، بۆیە ئەگەر ئینسان مامەڵەیەكی ڕاست و دروست لەگەڵ قورئاندا بكاو قورئان باش بخوێنێ و باش گوێی بۆ بگرێ و كارلێكی لەگەڵدا بكا، ئەوە قورئان گەورەترین و بەرزترین هۆكاری بەرەو خوا چوون و صالح بوونە، وە ئەگەر تەماشا بكەین هۆكارەكانی دیكە هەموویان دێنەوە نێو قورئان، چونكە: قورئانە فەرمان بە ئیمان دەكا، فەرمان بە ئیسلام دەكا، فەرمان بە دروشمەكانی خوا پەرستیی دەكا، فەرمان بە نوێژ دەكا، فەرمان بە ڕۆژوو گرتن و زەكات و حەج و عومرە دەكا، وە هەر قورئانە فەرمان دەكا بە لەخوا پاڕانەوە، بە ئیعتیكاف بە موجاهەدەی نەفس، وە هەموو ئەو هۆكارانەی دیكەش كە لە داهاتوودا باسیان دەكەین، ئنجا با تەماشای قورئان بكەین، بزانین خوای پەروەردگار دەربارەی قورئان خوێندن و گوێ بۆ گرتنی، چیمان پێ دەفەرموێ؟.

## گرنگیی قورئان خوێندن و گوێ بۆ گرتنی، لە قورئانی بەرزو بە پێزدا

١- لە سوورەتی (الزمر)دا خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ٢٣﴾

خوا سبحانه و تعالى پێناسەی قورئانمان بۆ دەكا دەفەرموێ: خوا باشترین فەرمایشتی ناردۆتە خوار، (ئنجا پێناسەی ئەو فەرمایشتەمان بۆ دەكا كە دیارە مەبەست پێی قورئانە)، كتێبێكە ئایەتەكانی وێك چوون، مەبەستەكانی تێدا دووبارە دەبنەوە، بە شێوازی دەربڕینی جۆراو جۆر، (ئنجا باسی كەسانێكمان بۆ دەكا كە تەفاعولی چاك لەگەڵ قورئاندا دەكەن) ئەوانەی كە لە پەروەردگاریان دەترسێن، پێستیان ڕێك دێ، تەزوویان پێدا دێ، سەرەتا تەزوویان پێدا دێ و موچوڕكەیان پێدا دێ، بەڵام دوایی دڵیان وە پێستیان نەرم دەبێ بەرەو یادی خوا، ئەوە ڕێنمایی خوایە، هەركەسێكی بوێ، پێی ڕێنمایی دەكا، وە هەر كەسێك خوا گومڕای بكا، تۆ هیچ ڕێنماییكەرێكت بۆی چنگ ناكەوێ[1].

٢- لە سووڕەتی (المزمل)دا خوا سبحانه و تعالى دەربارەی ئەوە كە قورئان دەبێ جوان بخوێنرێ، دەفەرموێ:

﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ ﴾ المزمل.

واتە: وە قورئان بخوێنە بە ڕێك و پێكیی، لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێ: (ثغر مرتل) ئەگەر كەسێ ددانەكانی ڕێك و پێك و بەسەر یەكەوە بن، دەگوترێ: (له ثغر مرتل) یانی: ئەو كەسە ددانەكانی ڕێك و پێكن، كەواتە: (ترتیل) ئەوەیە كە

.........................................

(١) دیارە خوای پەروەردگاریش لە گۆترە كەس هیدایەت نادا، وە لە گۆترەش كەس گومڕا ناكا، لە هەندێ شوێنی قورئاندا كە خوای پەروەردگار بە ڕەهایی (إطلاق) دەفەرموێ: ﴿ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ ﴿٩٣﴾ ﴾ النحل، ئەوانەی كە بەشێوەیەكی هەمەلایەنە تەماشای قورئان ناكەن، لە تێگەیشتنیدا بەهەڵەدا دەچن، دەڵێن: دیارە خوا بە گۆترە هەركەسێ بیەوێ هیدایەتی دەداو، هەركەسێ بیەوێ گومڕای دەكا! بەڵام نەخێر، لە شوێنی دیكەدا خوا بۆمان ڕوون دەكاتەوە كێ هیدایەت دەدا؟ ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الرعد، هەركەسێ بۆ لای خوا بگەڕێتەوە، خوا هیدایەتی دەدا، ئەدی خوا كێ گومڕا دەكا؟ ﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم، واتە: وە خوا ستەمكاران گومڕا دەكات، كەواتە: نەهیدایەت دان، نە گومڕا كردنی خوا، هیچیان لەگۆترە نین، بەڵكو وەك خوا باسی یاسای خۆی دەكا: هەركەسێ ستەم بكا، بەرەو گومڕایی دەچێ، هەركەسێ بەرەو خوا بگەڕێتەوە، بەرەو هیدایەت دەچێ.

تۆ بەشێوەیەك قورئان بخوێنی، هەر پیتەی هەقی خۆی پێ بدەی، بەو شێوەیە بیخوێنی کە ماناکەی ڕوونتر بەدەستەوە بدا[1].

٣- لە سوورەتی (الأعراف)دا خوا سبحانە و تعالی دەربارەی ئەوە کە ئەگەر قورئان بەسەر ئینساندا بخوێنرێ، گوێی بۆ بگرێ، دەبێتە هۆی ئەوە کە خوا بەزەیی پێدا بێ، بەمەرجێ چاك گوێی بۆ بگرێ، دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾

واتە: وە کاتێك قورئان خوێنرا، گوێی بۆ هەڵخەن وە بێدەنگ بن، (فَٱسْتَمِعُوا۟)، (سمع) واتە: گوێی گرت، (إستمع) واتە: بە گرنگیی پێدانەوە گوێی بۆ گرت[2]، چونکە شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن:

(زیادة المبنی تدل علی زیادة المعنی)، وشەیەك كە پیتەكانی زیاتر بن، ماناكەشی بەهێزتر دەبێ، (وَأَنصِتُوا۟): واتە: هەر بەوەندە ئیكتیفا نەكەن كە گوێ بگرن، بەڵكو بێدەنگیش[3] بن و، قسە نەكەن، لە نێوان خۆتاندا، بۆ ئەوەی هیچ وشەیەكتان لێ زایە نەبێ، (لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ) بەڵكو بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنرێ، كەواتە: بەهۆی گوێ گرتنەوە لە قورئان، خوا ڕەحم بە گوێگرانی دەكا.

٤- لە سوورەتی (یونس)دا خوا سبحانە و تعالی بانگی مرۆڤایەتیی دەكا، دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾

واتە: ئەی خەڵكینە! لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگارییتان بۆ هاتوە، وە شیفایە بۆ ئەوەی كە لە سینەكاندا هەیە، وە دەبێتە ڕێنمایی و بەزەیی بۆ ئیمانداران.
تەماشا بكەین! قورئان هەموی خێرو بەرەكەتە، خوا سبحانە و تعالی بە چوار سیفەت وەسفی قورئان دەكا:

(١) مختار الصحاح، ص ٢١٤. (الترتيل في القراءة: الترسل فيها والتبين بغير بغي).
(٢) مختار الصحاح، ص ٢٨٢، (إستمع له: أصغى).
(٣) مختار الصحاح، ص ٥٦٩ (الإنصات: السكوت والإستماع).

**یەكەم:** (مَّوۡعِظَةٞ)، ئامۆژگاریی، ئامۆژگارییەك كە هەم عەقڵی ئینسان هۆشیار دەكا، هەم دڵی ڕادەچڵەكێنێ و بێداری دەكا، ئنجا ئەو ئامۆژگارییە لە كێوە هاتوە؟ (مِّن رَّبِّكُمۡ) لە پەروەردگارو خاوەن و مشوور خۆری خۆتانەوە.

**دووەم:** (وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ)، وە لە پەروەردگارو لە مشوور خۆرتانەوە، شیفاو چارەسەری ئەوەی كە لە سینەتاندایە، لە گومان و شیرك و ئارەزووی خراپە، ئەگەر ئەو قورئانە لە عەقڵتاندا جێگیر بێ، شیفای هەموو دەردەكانتان دەداو، سەرو سینەتان ساف و ساغ دەكا.

**سێیەم و چوارەم:** (وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ)، وە ڕێنمایی و بەزەییە بۆ بڕوا داران.

## گرنگیی قورئان خوێندن و گوێ بۆ گرتنی، لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)

١- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمْ السَّكِينَةُ وَغَشِيَتْهُمْ الرَّحْمَةُ وَحَفَّتْهُمْ الْمَلَائِكَةُ وَذَكَرَهُمْ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ)، رواه مسلم برقم (٢٦٩٩)، وأبو داود برقم (٤٩٤٦).

واتە: هەر كاتێك كۆمەڵە كەسێك لە ماڵێك لە ماڵەكانی خوادا كۆببنەوە: كتێبی خوا بخوێننەوە، وە لەبەینی خۆیاندا لێی بكۆڵنەوە، ئەوە سەكینەت دادەبەزێتە سەریان و، بەزەیی خوا بەسەریان دادێ و، فریشتەكان دەوریان دەدەن، وە خوا باسیان دەكا لە لای ئەوانەی لە خزمەتی دان.

كێن ئەوانەی لە خزمەتی خوادا؟ بێگومان فریشتە زۆر نزیكەكان، كەواتە: سەرگەرم بوون بە قورئانەوە: بە خوێندنەوەی، گوێ بۆ گرتنی، تێگەیشتنی، دەبێتە هۆی ئەوە كە ئینسان:

* سەكینەتی داباریتە سەر دڵ.
* ڕەحمەتی خوا دایپۆشێ.

* فریشتە دەوری بدەن.
* خوا یادی بكا.

ئنجا كەسێك هەموو ئەوانەی دەست گیر بێ، چۆن نەفسی تەزكیە نابێ، چۆن پاك و چاك نابێ؟!.

٢- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەخواوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ:

(مَنْ شَغَلَهُ القُرْآن وَذِكْري عَنْ مَسْأَلتي، أَعْطَيْتُهُ أَفْضَلَ ما أُعْطيَ السّائِلِين، وَفَضْلُ كَلامِ اللهِ عَلَى سائِرِ الكَلامِ كَفَضْلِ اللهِ عَلى خَلْقِهِ )، أخرجه الدارمي برقم (٣٣٥٦) والترمذي برقم (٢٩٢٦) وقال: حسن غريب، والحاكم (٢٥٩/٣) والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٢٠١٥)، قال الألباني: ضعيف.

واتە: خوا فەرموویەتی: هەركەسێ قورئان خوێندن و یاد كردنم، لە داوا كردن لەمن بێئاگای بكا، (واتە: قورئان خوێندن و زیكر وای لێبكا نەیپەرژێتە سەر ئەوەی لێم بپاڕێتەوە) باشتر لەوەی كە دەیدەم بەوانەی لێم دەپاڕێنەوە، دەیدەم بەو، وە پلەو پایەو بەرزیی فەرمایشتی خوا بەسەر قسەی دیكەدا، وەك پلەو پایەو بەرزیی خوا وایە، بەسەر دروستكراوەكانیدا.

٣- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی پاداشتی ئەو كەسانەی كە قورئان دەخوێنن، دەفەرموێ:

(مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لَا أَقُولُ (ألم) حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ وَلَامٌ حَرْفٌ وَمِيمٌ حَرْفٌ) أخرجه البخاري في التاريخ الكبير (٢١٦/١) والترمذي برقم (٢٩١٠) وقال: حسن صحيح غريب، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١٩٨٣)، قال الألباني: صحيح.

واتە: هەر كەسێ پیتێك لە كیتابی خوا بخوێنێ، چاكەیەكی بۆ دەنووسرێ، وە چاكەش یەك بە دەیە، وە ناڵێم ئەلیف لام میم، یەك پیتە، بەڵكو ئەلیف پیتێكە، لامیش پیتێكە، میمیش پیتێكە.

كەواتە: ئەلیف لام میم، سێ چاكەی لە بەرانبەردا دەنووسرێ، هەر چاكەیەكیش یەك بەدە، ئەوە دەكاتە سی (٣٠)، ئەدی ئەگەر ئەو هەزار پیتانەی كە قورئانیان

لیَ پیَك هاتوه، ئینسان بیانخویَنیَ، چەند ملیۆن چاكەی بۆ دەنووسریَ؟ كە چاكە یەك بەدەیە، بەڵكو جاری وا هەیە بەرەو سەرتریش دەچیَ.

ئنجا بیَگومان وەك پیَشتریش باسمان كرد، قورئان خویَندن و گویَ لیَگرتنی، لەیەك كاتدا، هەموو جۆرەكانی زیكرو پاڕانەوە دەگریَتە نیَو خۆی، جگە لە بەرچاو ڕوون كردنی ئینسان لە هەموو بوارەكانی دینداریی و دنیادارییدا، بۆیە ئەو بەرەكەتەی لە قورئاندا هەیە، لە هیچ شتیَكی دیكەدا نیە.

قورئان گەورەترین زیكرە، وە یەكیَ لە ناوەكانی قورئان (ذكر)ە، وەك خوا دەفەرمویَ:

﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل

هەروەها دەفەرمویَ:

﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ وَسَوۡفَ تُسۡـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ الزخرف

كەواتە: قورئان بریتیە لە زیكر، چونكە ئەو ڕاستییانەی كە خوا لە فیترەتی ئینساندا دایناون، دەیانخاتەوە بیری، وە قورئان پڕە لە باس و یادی خوای بەرزو مەزن، ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا كە قورئان گەورەترین زیكرە، وە هەموو زیكرەكانی دیكەی گرتوونەتە خۆی، بەڵام ئینسان نابیَ بەس بە قورئان ئیكتیفا بكا، بەڵكو وەك زانایان ڕەحمەتی خوایان لیَبیَ دەڵیَن: زیكرو یادی خوا كردنەكان، بەپیَی حاڵ و مەقام دەگۆڕیَن:

١- لە حاڵیَكدا كە ئینسان بیەویَ خوا بەیەكگرتن (توحید) لە دڵی خۆیدا بچەسپیَنیَ و ئیمانی تازە بكاتەوە، ئەوە وەك پیَغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: با زۆر (لا إله إلا الله) بكا[1].

٢- بەڵام لە كاتیَكدا ئینسان هەست بە گوناهو تاوانبارییەك دەكاو، هەڵەو پەڵەیەك لیَی ڕوویداوە، ئەوە زیكری داوای لیَبوردن كردن لەخوا (الإستغفار) بۆ ئەو موناسیبە.

٣- لە كاتیَكدا ئینسان گویَی لە شتیَ دەبیَ و پیَی سەرسام دەبیَ، با زیكری:

(١) وەك لە باسەكانی پیَشتردا فەرموودەكەمان هیَنا.

(لا حول ولا قوة إلا بالله) بڵێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ ﴾ الكهف.

٤- كاتێ كە ئینسان سواری وەسیلەی سەفەر دەبێ، چ وڵاخە، چ سەیارەیە، چ تەیارەیە، ئەوە زیكری تایبەت هەیە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كردوویەتی:

(سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ)، أخرجه أحمد برقم (٦٣١١)، ومسلم برقم (١٣٤٢)، والترمذي برقم (٣٤٤٧)، وە هەروەها لە هەموو حاڵەتە جۆراو جۆرەكاندا، بەپێی حاڵەتەكە، زیكرەكان دەگۆڕێن.

بە نسبەت قورئان خوێندن، یاخود گوێلێگرتنی قورئان، ئینسان كاتێك لێی بەهرەمەند دەبێ، كە بەدڵەوەو بەهۆشیاریی و بێدارییەوە لەگەڵ قورئاندا مامەڵە بكا، وەك خوا سبحانه و تعالى لە سوورەتی (ص)دا دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ ص

واتە: ئەمە كتێبێكی پڕ پیت و پێزە {(مُبَٰرَكٌ) واتە: پڕ پیت و پێز، بەرهەمدار، زۆر بەفەڕ}، ناردوومانەتە خوارێ (لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ) بۆ ئەوەی لە ئایەتەكانی ورد بنەوە، وە سەرەنجام خاوەن عەقڵان پەندی لێوەربگرن، كەواتە: بەئەندازەی ئەوە كە ئینسان لە قورئان ورد دەبێتەوەو پێیدا قووڵ دەبێتەوەو سەرنجی دەدا، دەتوانێ نهێنییەكانی دەست بخات، دەتوانێ لە ئاماژەكانی تێ بگا، وە دەتوانێ لێی بەرهەمەند بێ، ئەوانەش كێن؟ (وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ) (ألباب) كۆی (لب)ە واتە: كاكڵ، خاوەن عەقڵان، عاقڵ مەندان، پەندی لێ وەردەگرن، كەواتە: بەئەندازەی ئەوە كە ئینسان عەقڵی خۆی بەكار دەهێنێ، لە كتێبی خوا بەهرەمەند دەبێ، دیارە ئەوەش بۆخۆی بابەتێكی سەربەخۆیە، من كتێبێكم لەو بارەوە نووسیوە، بە ناوونیشانی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟) لەو كتێبەدا حەوت قۆناغم داناون، كە مامەڵەیان پێ لەگەڵ قورئاندا بكرێ، (خوێندنی، بەسەردا خوێنرانەوەی، لێوردبوونەوەی، تێگەیشتنی، پەند لێ وەرگرتنی، پێ تەزكیە بوونی، پاكسازیی و چاكسازیی پێكردنی).

## هۆکاری شەشەم: پاڕانەوە (الدعاء)

ئەمەش هۆکاری شەشەمە لە هۆکارەکانی نەفس تەزکیە بوون و، بەرەو خوا چوون و صالّح بوون، دیارە پاڕانەوە لە خوا بەگشتی، دوو جۆرە:

**جۆری یەکەم:** پاڕانەوە داوا کردن لە خوا (دعاء المسألة).
**جۆری دووەم:** پاڕانەوەی مەدح و سەناو ڕازو نیاز کردن لەگەڵ خوادا (دعاء العبادة).

مەرج نیە پاڕانەوە هەمووی بۆ داوا کردن بێ، هەرکات پاڕایەوە، شتێك لە خوا داوا بکەی! بەڵکو هەندێ دوعای پێغەمبەران کە لە قورئاندا هاتوە، ڕازو نیازو موناجات و گفت و گۆیە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، مەرج نیە هەموو جارێ شتێکی دیاریی کراو، لەخوا داوا بکرێ، مەدح و سەناو ستایشی خوا بۆخۆی گەورەترین دوعایە، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ الْحَمْدُ لِلَّهِ) أخرجه الترمذي برقم (٣٣٨٣) وقال: حسن غريب. والنسائي في الكبرى برقم (١٠٦٦٧)، وابن ماجة برقم (٣٨٠٠)، وابن حبان برقم (٨٤٦)، والحاكم برقم (١٨٣٤) وقال: صحيح الإسناد، وأخرجه أيضاً: الديلمي برقم (١٤١٤)، قال الشيخ الألباني: حسن، واتە: ستایش کردنی خوا، باشترین پاڕانەوەیە لەخوا.

## چەند ئایەتێك لە قورئانی بەرزو بە پێز ، سەبارەت بە کاریگەریی پاڕانەوە لەسەر نەفس پاك و چاك بوون و، بەرەو خواچوون

خوای پەروەردگار لە زۆر شوێنان لە قورئاندا فەرمانی کردوە: لێی بپاڕێینەوەو ڕازو نیازی لەگەڵدا بکەین، وە بەندایەتیی بۆ بنوێنین، بۆ ئەوەی شایستە بین کە خوا تەقوا لەدڵماندا جێگیر بکا، وە ئیمانێکی کامڵ لەدڵماندا جێگیر بێ، با سەرنجی چەند ئایەتێك بدەین لە قورئان، سەبارەت بە دوعاو پاڕانەوە، پاشان

باسی ئەوە دەكەین، كە چۆن دوعاو پاڕانەوە كاریگەریی دەبێ لەسەر ئەوەی ئینسان نەفسی تەزكیە ببێ:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾ غافر

واتە: وە پەروەردگارتان فەرمووی: لێم بپاڕێنەوە، وەڵامتان دەدەمەوە، بێگومان ئەوانەی لەبەرانبەر بەندایەتیی كردن بۆ مندا، خۆ بەزل دەگرن، بە زەبوونیی دەچنە دۆزەخەوە. ئەم ئایەتە موبارەكە چەند شتێكی لێ وەردەگیرێن لە بواری لەخوا پاڕانەوەدا:

**یەكەم**: كێتان بینیوە بۆخۆی داوا لە خەڵك بكاو بە خەڵكی بڵێ: وەرن داوای شتم لێ بكەن؟ بۆیە خوا سبحانە و تعالی خۆی بە بەخشندەترین (أكرم) ناو بردوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴿٣﴾ ﴾ العلق

واتە: بخوێنەو پەروەردگارت هەرە بەخشندەیە، بێگومان هەموو ئەوانەی كە بەخشندەن، بەخشندەكەیان زەڕڕەیەكە لە بەخشندەیی خوای پەروەردگار، لێرەدا دەفەرموێ: پەروەردگارتان فەرمووی: لێم بپاڕێنەوەو داوام لێ بكەن، وەڵامتان دەدەمەوە.

**دووەم**: خوای بێ هاوتا ڕایدەگەیەنێ: ئەوانەی لەخوا ناپاڕێنەوە، خۆ بەزل دەگرن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي ﴾، واتە: ئەوانەی لەبەرانبەر عیبادەت و بەندایەتیی كردن بۆ مندا، خۆ بەزل دەگرن، لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كە هەر كەسێ لە خوا نەپاڕێتەوەو، چاوەڕوانی لەخوا نەبێ و، داوا لە خوا نەكا: خۆ بەزل گرە، چونكە هەندێ لە خەڵكی نەزانی بواری تەصەووف گوتوویانە: ئێمە پێویست ناكات، داوا لە خوا بكەین، خوا بۆخۆی دەزانێ چیمان لەدڵدایە!!، نا، داواكردن لە خوا بۆخۆی عیبادەتە، خوا

بۆخۆی پێی خۆشە داوای لێبكەی، لە سورەتی (الفاتحە)دا ئێمە دەخوێنین:

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾ الفاتحة

واتە: بەس تۆ دەپەرستین، وە داواش بەس لەتۆ دەكەین، داوا كردن لە خوا، بەشێكە لە عیبادەت و بەندایەتیی كردن بۆ خوا.

**سێیەم:** دوعاو پاڕانەوە عیبادەتە، چونكە خوا پێشیی دەفەرمویّ: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ واتە: پەروەردگارتان فەرمووی: لێم بپاڕێنەوە، وەلامتان دەدەمەوە، دوایی دەفەرمویّ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي﴾، (عَنْ عِبَادَتِي: أي عن دعائي)، ئەوانەی كە لێم ناپاڕێنەوە واتە: من ناپەرستن. كەواتە: دوعاو پاڕانەوە واتە: پەرستن، مەبەستم ئەوەیە كە كەسانێك دەچن لە كەسێك یان قەبرێك یان مەزارگەیەك دەپاڕێنەوە، ئنجا پێشیان وایە ئەوەی دەیكەن عیبادەت نیە!، نەخێر، ئەوەتا بەدەقی ئایەت بۆمان ڕوون بۆوە، كە پاڕانەوە عیبادەتە.

٢- لە ئایەتێكی دیكەدا خوای تاك و پاك دەفەرمویّ:

﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ۝٥٥ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ ۝٥٦﴾ الأعراف

واتە: لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە بە كڕووزانەوەو لالانەوەو بە پەنهانیی، بێگومان خوا سنوور شكێنانی خۆشناوێن، وە بەترس و ئومێدەوە لە خوا بپاڕێنەوە، بێگومان بەزەیی خوا لە چاكەكارانەوە نزیكە.

## لێرەدا خوای پەروەردگار چوار ئەدەبی پاڕانەوەمان فێر دەكا:

**ئەدەبی یەكەم:** خوا عز وجل فەرموویەتی: بە لاڵانەوەو كڕووزانەوەوە لە خوا بپاڕێنەوە، نەك بە فیزو كەشخەوە، بەڵكو بە مل كەچیی و خۆ بچووككردنەوەوە بەرانبەر خوای بەخشەر، پاشان با بەپەنهانیی بێ و پێویست ناكا لەنێو خەڵكدا هاوار بكەن.

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ كۆمەڵێك لە هاوەڵانی لە سەفەرێك بوون، بەدەنگی بەرز دوعایان دەكرد، فەرمووی:

(إِرْبَعُوا عَلى أَنْفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لَا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلَا غَائِبًا) أخرجه البخاري برقم (٢٨٣٠)، ومسلم برقم (٢٧٠٤)، وأبو داود برقم (١٥٢٦)، وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (١٩٥٣٨)، والنسائي في الكبرى برقم (٧٦٧٩)، وأبو يعلى برقم (٧٢٥٢)، وابن أبي عاصم برقم (٦١٨).

واتە: خۆتان ئەزیەت مەدەن، ئێوە ئەوەی لێی دەپاڕێنەوە، نە كەڕەو نە نادیاریشە، (ئاگای لێتان نەبێ).

ئنجا كە هەندێ بەو بۆنەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كرد: ئایا پەروەردگارمان دوورە بانگی لێ بكەین، یاخود نزیكەو لەبەر خۆمانەوە داوای لێ بكەین؟ خوای پەروەردگار لەو بارەوە فەرمووی:

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾ البقرة.

واتە: وە ئەگەر بەندەكانی من پرسیاری منیان لێكردی (ئایا دوورم یا نزیك؟) با دڵنیابن: من لێیان نزیكم، هەركەسێ بانگم بكا، وەڵامی دەدەمەوە، با ئەوان بەدەم بانگی منەوە بێن، وە با ئیمانم پێ بێنن بۆ ئەوەی ڕێی ڕاست بگرن، یانی: ئەگەر یەكێ ئیمانی هەبێ و بەدەم بانگەوازی خواوە بچێ، شایستەی ئەوە دەبێ داواكارییەكانی وەڵام بدرێنەوە.

**ئەدەبی دووەم:** كە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾

بێگومان خوا دەست درێژكاران و تێپەڕێنەرانی خۆش ناوێن. ئەمە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە، كە دەگونجێ هەندێ جار ئینسان زێدەڕۆیی بكاو سنوور ببەزێنێ، لە دوعادا، وەك دوایی باسی دەكەین.

**ئەدەبی سێیەم و چوارەم:** كە دەفەرموێ:

﴿ وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾

واتە: لە خوا بپاڕێنەوە بە ترس و ئومێدەوە، هەم ترستان هەبێ لە سزای خوا، هەم ئومێدتان هەبێ بە ڕەحمی خوا، بێگومان ڕەحمی خوا لە چاكەكارانەوە نزیكە.

٣- وە لە سوورەتی (الكهف)دا ئایەتەكانی (٢٧- ٢٨)دا خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ وَٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ ۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَـٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٧﴾ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ ﴾

بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ئەوەی لە كتێبی خوا بۆت سروش كراوەو بۆت دابەزێنراوە، بیخوێنەوە، گۆڕەر نیە بۆ وشەكانی خوا، وە لەجیاتی خوا، هیچ پەنات نین، وە خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەوانەدا كە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، ڕەزامەندیی خوایان دەوێ، {یاخود ڕووو دیداری خوایان دەوێ} وە چاوت لەسەریان لامەدە (واتە: چاوت هەر لەسەریان بێ و ئاگات لێیان بێ)، بە هۆی ویستنی جوانیی دنیاوە ئاگات لەو ڕەش و ڕووتانە نەبڕێ، وە بەقسەی ئەوانە مەكە كە دڵیانمان بێ ئاگا كردوە لە یادی خۆمان،

وە بەدوای ئارەزووی خۆی کەوتوەو سەرەنجامی بریتییە لە سەر بەفەتارەت چوون و تێدا چوون.

کەواتە: لێرەدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێکراوە کە کتێبی خوا بخوێنێتەوە، وە ئەو کەسانەش کە بەیانیان و ئێواران لە خوا دەپاڕێنەوە، ئاگای لێیان بێ چاوی لەسەریان بێ، وە نەکەوێتە ژێر کاریگەریی دنیاپەرستان.

## کاریگەریی پاڕانەوە لەسەر تەزکیەی نەفس و، پاك و چاك بوون و، بەرەو خوا چوون، لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)

١- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ)، أخرجه أحمد برقم (١٨٤١٥)، وابن أبي شيبة برقم (٢٩١٦٧)، والبخاري في الأدب المفرد برقم (٧١٤)، وأبو داود برقم (١٤٧٩)، والترمذي برقم (٢٩٦٩) وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى برقم (١١٤٦٤)، وابن ماجة برقم (٣٨٢٨)، وإبن حبان برقم (٨٩٠)، والحاكم برقم (١٨٠٢) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١١٠٥)، وأخرجه أيضًا: الطبراني في الصغير برقم (١٠٤١) ، والقضاعي برقم (٢٩). قال الشيخ الألباني: صحيح، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

واتە: لەخوا پاڕانەوە بریتیە لە عیبادەت و بەندایەتیی بۆ خوا.

٢- عَنْ أَبِي كَعْبٍ صَاحِبِ الْحَرِيرِ حَدَّثَنِي شَهْرُ بْنُ حَوْشَبٍ قَالَ قُلْتُ لِأُمِّ سَلَمَةَ يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ! مَا كَانَ أَكْثَرُ دُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَانَ عِنْدَكِ؟ قَالَتْ كَانَ أَكْثَرُ دُعَائِهِ {يَامُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ} قَالَتْ: فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَكْثَرَ دُعَاءَكَ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ! قَالَ: {يَا أُمَّ سَلَمَةَ إِنَّهُ لَيْسَ آدَمِيٌّ إِلَّا وَقَلْبُهُ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللَّهِ، فَمَنْ شَاءَ أَقَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَزَاغَ}. أخرجه الترمذي برقم (٣٥٢٢) وقال: حسن، وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (٢٦٦١٨)، قال الشيخ الألباني: صحيح، وقال شعيب

الأرنؤوط: حديث صحيح بشواهده، وهذا إسناد ضعيف لضعف شهر بن حوشب.

ئوممو سەلەمە یەكێكە لە هاوسەرە بەڕێزەكانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دایكانی بڕواداران خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كاتێك لە لای ئوومم سەلەمە دەبوو لە ماڵەكەی ئەودا دەبوو، بەزۆریی ئەو دوعایەی دەكرد دەیفەرموو: (ئەی هەڵگێڕەوەی دڵان! دڵم بچەسپێنە لەسەر دینەكەت)، ئوممو سەلەمە دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا! زۆر ئەو دوعایە دەكەی: ئەی هەڵگێڕەرەوەی دڵان! دڵم لەسەر ئایینەكەت بچەسپێنە! پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەی ئوممو سەلەمە! هیچ دڵێك نیە لە دڵی ئینسانەكان، مەگەر لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەكانی خوادایە، ئنجا هەر كەسێكی بیەوێ، دڵی ڕادەگرێ لەسەر دینەكەی و، هەر كەسێكیشی بوێ دڵی لادەدا)[1].

..............................................

(١) هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوە نیە خوای بەرز لە بەندەكانی لە بەهانەبێ، یاخود لە گۆترە هەندێكیان بچەسپێنێ لەسەر دین و هەندێكیشیان لابدا، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە دەبێ ئینسان هەمیشە بەخواوە پەیوەست بێ و، هەمیشە ئاگای لەخۆی بێ و بە دوو ڕۆژوو و چوار ڕكات نوێژ لە خۆی بایی نەبێ، پێی وابێ لە هەموو ئاوان پەڕیوەتەوە! هەمیشە لەو ڕووەوە لەخۆی وریا بێ و، ئاگای لەخۆی بێ، وە بزانێ كە ئەگەر چاكەیەكیشی لەدەست هاتوە، بە چاكەو یارمەتیی و هیدایەتی خوایە، وە پێی لەخۆ بایی نەبێ و لەخۆی دەرنەچێ، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە ئینسان بە گومانەوە لەگەڵ خوای خۆیدا مامەڵە بكا، بێگومان خوا لەكەس لە بەهانە نیە گومڕای بكاو، سەری لێ بشێوێنێ، وە خوا لە گۆترە سەر لەكەس ناشێوێنێ، بەڵكو خوا سبحانه و تعالى بۆخۆی دەفەرموێ:

﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾ ﴾ النساء.

واتە: خوا چیداوە لە سزادانی ئێوە، ئەگەر ئێوە سوپاسگوزارو ئیماندار بن؟!، بێگومان خوا بۆخۆی سوپاسگوزار (سوپاسی بەندەكانی دەكا)ی زانایە. وە خوای بەبەزەیی ڕەحمەتی پێش تووڕە بوون و غەزەبی كەوتۆتەوە، وەك فەرموویەتی: (إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي) البخاري برقم: (٦٩٦٩)، ومسلم برقم: (٢٧٥١)، وە خوا سەدو بیست و چوار هەزار (١٢٤٠٠٠) پێغەمبەری ناردوە، وە ئەو هەموو كتێبەی ناردوون، بۆ ئەوەی بەندەكانی هیدایەت وەربگرن

ئنجا كاریگەریی دوعا لە تەزكیەی نەفسدا، لەوەدا دەردەكەوێ، كە تۆ كاتێ لە خوا دەپاڕێیەوە: چ بۆ ئەوەی بەڵایەكت لێ لابدا، چ داوای لێبكەی بۆ ئەوەی ئاواتێكت بۆ بێنێتەدی، یاخود هەر ڕازو نیازی لەگەڵدا بكەی، بێ ئەوەی شتێكی لێ داوا بكەی، كە بێگومان ئێمە هەمیشە پێویستمان بە خوای پەروەردگارەو نیازمەندی خوای پەروەردگارین، وەك دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ١٥﴾ فاطر

واتە: ئەی خەڵكینە! ئێوە نیازمەندی خوان (ئێوە پێویستتان بەخوایە)، وە خوا دەوڵەمەندی ستایش كراوە، واتە: خوای بێنیاز پێویستی بە ئێوە نیە، ئەگەر ئێوەش ستایشی خوا نەكەن، خوای بەرزو مەزن هەر ستایش كراوە، بەڵام ئێوە پێویستتان بە خوای پەروەردگارە، ئنجا كاتێك كە ئینسان لە خوا دەپاڕێتەوە، بێگومان ئەو پەیوەندییە گەرم و توندو تۆڵە لەگەڵ خواوە ئەو ڕازو نیاز كردنە لەگەڵ خوادا، كاریگەریی دەبێ، لەسەر ئەوەی ئەو نەفسە پاك و چاك بێ، وە شەیتان لێی دوور بكەوێتەوە.



---

و بیانباتە بەهەشتەوە، كەواتە: دەبێ ئێمە ئاگاداربین، ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كە جاری وا هەیە ڕەنگە گێڕەرەوە (راوي) فەرموودەكە بە كورتیی هێنابێ و، ڕەنگە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) درێژتر ئەمەی فەرموو بێ، یان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاوای فەرمووە، بۆ چارەسەری نەخۆشییەك كە بریتیە لە نەخۆشیی لەخۆبایی بوون، (الغرور) بەڵام لە شوێنێكی دیكەدا ئەو مەبەستە تەواو بكا.

## چەند ئەدەبێكی دوعا كردن

### یەكەم:

لە فەرمایشتێكی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، كە ڕۆژێك یەكێ دوعای كردو پاڕایەوە، یەكسەر دوعایەكەی كرد، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەو كابرایە پەلەی كرد، دەبوو پێشێ ستایش و سەنای خوا بكاو، صەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بدا، ئنجا دوعاكەی بكات[1].

### دووەم:

دەبێ ئینسان بە دڵنیاییەوەو بە متمانە بەخۆ بوونەوەو بە بڕوا بە خوا بوونەوە دوعاكەی بكا، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(ادْعُوا اللَّهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالْإِجَابَةِ) أخرجه الترمذي برقم (٣٤٧٩) وقال: حديث غريب، والحاكم برقم (١٨١٧)، وقال: مستقيم الإسناد، وتعقبه الذهبي في التلخيص بأن فيه صالح المري متروك، وأخرجه أيضًا: ابن أبي حاتم كما في تفسير ابن كثير (٧٥/٤)، والطبراني في الأوسط برقم (٥١٠٩)، قال الألباني: حسن.

واتە: لە خوا بپاڕێنەوەو یەقینتان هەبێ كە خوا وەڵامتان دەداتەوە.
بەڵام دەبێ بزانین كە دەفەرموێ: وەڵامتان دەداتەوە، مەرج نیە یەكسەر ئەو شتەت بۆ جێبەجێ بكا، چونكە لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە (صلى الله عليه وسلم) هەر كەسێ دوعا بكاو دەست بۆ خوا بەرز بكاتەوە، خوا یەكێ لەو سێیانەی بۆ دەكا:

١- یان شتەكەی بۆ جێبەجێ دەكا.
٢- یان بەقەدەر ئەوە پاداشتی دەداتەوە.
٣- یان بەقەدەر ئەوە بەڵای لێ لادەدا.

.......................................

(١) عَجِل هذا . . .

بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو دوعایە زایە نابێ، چونکە خوا بەخشندەیە، وەك لە فەرموودەدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(إِنَّ رَبَّكُمْ حَيِيٌّ كَرِيمٌ يَسْتَحْيِي مِنْ عَبْدِهِ أَنْ يَرْفَعَ إِلَيْهِ يَدَيْهِ فَيَرُدَّهُمَا صِفْرًا، أَوْ قَالَ: خَائِبَتَيْنِ) أخرجه أبو داود برقم (١٤٨٨)، وابن ماجة برقم (٣٨٦٥)، وابن عساكر (٤٦٥/٥٨) قال الشيخ الألباني: صحيح.

واتە: خوا بەشەرم و بەڕێزە، شەرم دەکا بەندەکەی دەستی بۆ لا بەرز بکاتەوە، دەستەکانی بە خاڵیی بەڕێ بکاتەوە، یان فەرمووی بێ ئەنجام.

بەڵێ بێگومان خوای پەروەردگار داوای لێبکرێ، وەڵام دەداتەوە، بەڵام مەرج نیە ئەوەی تۆ بتەوێ، بیکات، جاری وایە ئەوەی تۆ داوای دەکەی بۆتۆ خراپە، خوای پەروەردگار شتێکی باشترت بۆ دەکا، وە جاری وا هەیە ئێستا بۆت ناکاو دواتر بۆت دەکا، وە ئەگەر دواتر بۆت بکا، باشترە لەوەی ئێستا بیکا، من ئەوەم لە ژیانی خۆمدا زۆر بینیوە، جاری وایە تۆ بەپەلەی داوایەکت بۆ بێتە دی، بەڵام نەخێر ئەگەر بێتە دی زەرەری لێ دەکەی، یان جاری وا هەیە کەسێك لە کەسێك تووڕە دەبێ، دایک و باب، لە ڕۆڵەیان، برا لە برای و، تووکی لێ دەکا، ئەگەر تووکەکەی[1] گیرا بێ، زەرەر دەکا.

## سێیەم:

هەڵبژاردنی کات و شوێنی گونجاو بۆ دوعا کردن، بۆ وێنە: پرسیار لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کراوە:

(قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الدُّعَاءِ أَسْمَعُ؟ قَالَ: {جَوْفَ اللَّيْلِ الْآخِرِ، وَدُبُرَ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ}) أخرجه الترمذي برقم (٣٤٩٩) وقال: حسن، والنسائي في الكبرى برقم (٩٩٣٦)، قال الشيخ الألباني: حسن.

گوتراوە ئەی پێغەمبەری خوا! کامە دوعا گیرا دەبێ؟ فەرموویەتی: (لە قووڵایی شەوێداو، دوای نوێژە فەرزەکان (ئەو دوعایانەی لە تەحییاتدا دەخوێنرێن)).

........................................

(١) تووك: نزای خراپ.

هەروەها دوعا كردن لەو كاتەدا كە ئینسان لە سەجدە دایە، وەك دەفەرموێ:

(أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ) أخرجه مسلم برقم (٤٨٢)، وأبو داود برقم (٨٧٥)، والنسائي برقم (١١٣٧). وأخرجه أيضاً: أحمد برقم (٩٤٤٢)، وابن حبان برقم (١٩٢٨)، والبيهقي برقم (٢٥١٧).

واتە: كاتێك كە بەندە لە كڕنووش و دایە، لە هەموو كاتان لە پەروەردگاری نزیكترە، دوعای زۆر تێدا بكەن.

ئنجا شوێنەكانی تر وەك: تەواف، مزگەوت، مەقامی ئیبراهیم، لە نێوان ڕوكنی یەمان و بەردە ڕەشەكە (حجر الأسود)، ئینسان دەبێ ئەو كات و شوێنانە هەڵبژێرێ بۆ دوعایەكانی.

## چوارەم:

دوعا دەبێ بەپێی پێویستی بێ و ئینسان تەماشا بكا بزانێ: چ شتێكی زۆر پێویستە، ئەوە لە خوا داوا بكات و بپاڕێتەوە.

من تێبینیم هەیە لەسەر هەندێ لە مامۆستایان، بە تایبەت لە ڕەمەزانان لە دوعای نوێژی وەتردا دوای تەڕاویح، دێنن چارەگێك بیست دەقە، تا نیو سەعات، دوعا دەكەن خەڵك هەمووی دەست و پێیەكانی شل دەبن، هەرچی دوعا هەیە دەیهێنێ! كە من پێم وایە ئەوە لاسایی كردنەوەی هەندێ لەو مەلاو شێخانەی عەرەبستانی سعودیەیە، وە پێشم وایە ئەوە لەگەڵ سوننەت نایەتەوە، چونكە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەرگیز ئەو هەموو دوعایەی بەیەكەوە نەكردوون، دوعایەكانی دیارن، بۆیە دەبێ بەپێی حاڵ و مەقام، لە كاتێكی دیاریی كراودا، بۆ چەند مەبەستێكی دیاریی كراو چەند دوعایەك بكرێ، بەڵام هەرچی دوعا كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كردوونی، هەموویان لەیەك كاتدا بكرێن، پێم وایە ئەوە لە سوننەت دوور دەكەوێتەوە، ناڵێم ناشەرعییە، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو هەموو دوعایانەی بەیەكەوە نەكردوون، ئێمەش پێویستە خوا بەو شێوەیە بپەرستین كە خۆی بۆی دیاریی كردووین، لە ڕێی پێغەمبەرەكەیەوە (صلى الله عليه وسلم).

## پێنجەم:

ئینسان دەبێ لە پاڕانەوەکەیدا خۆی دوور بگرێ لە گوناح، وە لە پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتی، وە دەبێ حەڵاڵ خۆر بێ و خۆی لە حەڕام بپارێزێ.

## شەشەم:

دوعا کردن بەدیلی هۆکارەکان نیە، ئینسان دەبێ پێشێ هۆکارەکان دابین بکاو هەرچی لە دەستی دێ بیکا، ئنجا دوایی پاش ئەوەی هۆکارەکانی گرتنە بەر ووزەی خۆی سەرف کرد، ئنجا لە خوا بپاڕێتەوەو بڵێ: خوایە! ئەوەی پێم کراوە کردوومە، ئنجا نۆرەی تۆیە، ئەو جۆرە دوعایە زۆر پێدەچێ قبووڵ بێ، بەڵام ئینسان هیچ هۆکارێك نەگرێتە بەرو هەموو شتەکان لە خوا داوا بکا، ئەدی خوا، تۆی بۆچی خوڵقاندوە؟ خوای گەورە مەدحی (ذو القرنين) دەکاو دەفەرموێ:

﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾﴾ الكهف

واتە: بۆ هەموو شتێك هۆکارێکمان پێدا بوو، بەدوای هۆکارەکە کەوت، وە پێی دەگەیشتە ئامانج. کەواتە: دەبێ لە ڕێی هۆکارەکانەوە بۆ ئامانجەکان بچین، بەڵام لە پشت هۆکارەکانەوە خوای باڵادەست هەیە، وە ئەگەر خوا بیەوێ ئەو هۆکارانە بەرهەم بەدەست دێنن و، ئەگەر نەشیەوێ، ئەو ئامانجەی تۆ دەتەوێ، لێیان ناکەوێتەوەو نایەتە دی.

## هۆكاری حەوتەم: خەڵوە كێشان - الإعتكاف

كوردەواریی خۆمان بە چوونە ئیعتیكاف دەڵێن: خەڵوە كێشان، پسپۆڕان و شارەزایانی بواری تەزكیەی نەفس، چوونە ئیعتیكاف بە هۆكارێكی گرنگ و كاریگەری تەزكیە بوونی نەفس دەزانن، سەرەتا با بزانین ئیعتیكاف لە ئەصڵی زمان و زاراوەی شەرعدا واتای چییە؟

١- (راغب الأصفهانی) گوتوویەتی:

(العُكُوف: الإقْبالُ عَلى الشَّيءِ وَمُلازَمَتُهُ عَلى سَبيلِ التَّعْظِيمِ لَهُ، وَالإِعْتِكافُ في الشَّرعِ: هوَ الإحْتِباسُ في المَسْجِدِ عَلى سَبيلِ القُرْبة)[1].

واتە: (العكوف) لە ئەصڵی زمانی عەرەبیدا بریتیە لەوە كە ئینسان ڕوو بكاتە شتێك و خوو بداتە شتێك، وە پێیەوە پەیوەست بێ، بەشێوەیەك ئەو شتەی بەلاوە گەورەو گرنگ بێ.

بەڵام لە زاراوەی شەرعدا، ئیعتیكاف بریتیە لە مانەوە لە مزگەوتدا بەمەبەستی لەخوا نزیك بوونەوە.

٢- (الجرجاني) دەڵێ:

(الإعْتِكافُ: تَفْرِيغُ القَلْبِ عَن شُغْلِ الدُّنيا وَتَسْليمُ النَّفْسِ إلى المَوْلى)[2].

واتە: ئیعتیكاف بریتیە لە: دڵ خاڵی كردنەوە لە سەرگەرم بوون بە دنیاوە، وە خۆ سپاردن بە سەرپەرشتیار، كە دیارە مەبەست پێی پەروەردگارە.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن- راغب الأصفهاني- ص ٥٧٩.

(٢) التعریفات- ص ٢٣.

٣- (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) دەڵێ:

(الإِعْتِكاف: وَهُوَ لُزومُ المَسْجِدِ لِطاعَةِ اللهِ تَعالى، وَانْقِطاعاً إِلَيْهِ)[1].

واتە: ئیعتیکاف بریتیە لە مانەوە لە مزگەوت، بەمەبەستی فەرمانبەریی خوای بەرز، وە خۆدابڕین بەلای خوادا، واتە: خۆ یەکلاکردنەوەو خۆ ساغ کردنەوە بۆ خوا، وەك خوا سبحانە و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ﴿٨﴾ ﴾ المزمل (أَيْ: وَانقَطِع إِلَيْهِ انْقِطاعاً)

واتە: خۆت بەلای خوادا دابڕەو دەست لە شتی دیکەدا بەردە، کە لەو حاڵەتی ئیعتیکافە دای، با هەموو تەرکیزت هەموو دڵ و دەروونت، هەموو فیکرو هۆشت، سەرگەرمی یادی خواو تێکەڵ بوون بێ لەگەڵ تاعەتی خوادا.

٤- دیارە لە قورئاندا لەچەند شوێنێکدا باسی ئیعتیکاف کراوە، بەڵام بە وشەی: (العاكف)، یان (العاكفون)، وەك خوای پەروەدگار دەفەرموێ:

﴿ سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِۚ ﴿٢٥﴾ ﴾ الحج

کە باسی مزگەوتی حەرام دەکا خوا سبحانە و تعالى دەفەرموێ: ئەوەی کە تێیدا دەمێنێتەوە (واتە: تێیدا نیشتەجێ دەبێ)، وە ئەوەشی لە دەرەوە دێ، یەکسانن، واتە: هەموویان ئەرك و مافیان وەك یەك وایە لە مزگەوتی حەرامدا. هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا خوای پەروەردگار لە سیاقی ئایەتێکدا کە باسی چەند حوکمێکی ڕۆژووەوانان دەکا، کە دەبێ چۆن مامەڵ بکەن لەگەڵ ماڵ و خێزانیاندا؟ دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمۡ عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِۗ ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقرة

واتە: مەچنە لای هاوسەرەکانتان لە کاتێکدا ئێوە لە مزگەوتدا ماونەوە، بەمەبەستی خوا پەرستیی (واتە: چوونەتە حاڵەتی ئیعتیکافەوە)، وەك زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ، بەڵکو نەمبینیوە

........................................

(١) تيسير الكريم المنان في تفسير كلام الرحمن، ص٨٧.

هیچ زانایەك پێچەوانەی ئەو ڕایەی هەبێ، كە ئیعتیكاف تەنیا لە مزگەوتدا دروستە.

٥- (إبن كثير) لە تەفسیرەكەی خۆیدا دوای ئەوەی قسەی هەندێ لە زانایان دێنێ لەسەر ئەوەی كە بابای خەڵوە كێش (معتكف) دەبێ چۆن ڕەفتار بكا؟ دەڵێ:

(وَهذا الَّذي حَكَاهُ عَن هؤُلاءِ العُلَماء، هوَ الأَمْرُ المُتَّفَقُ عَلَيْهِ عِندَ العُلَماء، أَنَّ المُعْتَكِفَ يَحْرُمُ عَلَيهِ النِّساءُ، مادامَ مُعْتَكِفًا فِي مَسْجِدِه، وَلَوْ ذَهَبَ إِلى مَنْزِلِهِ لِحاجَةٍ لا بُدَّ لَهُ مِنْها، فَلا يَحِلُّ لَهُ أَن يَتَلَبَّثَ فِيه إِلاَّ بِمِقْدارِ ما يَفْرُغُ مِن حاجَتِهِ تِلْكَ، مِن قَضاءِ الغائِطِ، أَوِ الأَكْلِ)[1].

واتە: ئەوەی كە لەو زانایانەوە گێڕاویەتەوە، ئەوە شتێكە كە هەموو زانایان لەسەری كۆدەنگن، كە كەسێك چۆتە ئیعتیكافەوە، ئافرەتی لێ قەدەغەن (واتە: نابێ بچێتە لای هاوسەری) تاكو ئەو كاتەی لە مزگەوت لە ئیعتیكاف دایە، (وە لە دڵی خۆی گرتوەو نیەتی لێ هێناوە، تاكو ئەو كاتە تەواو دەبێ، بۆی نیە بچێتە لای هاوسەری و لەگەڵی جووت بێ، یاخود ماچی بكا)، وە ئەگەر بۆ كارێكیش كە پێویست بێ، بچێتەوە ماڵێ، بۆی نیە بمێنێتەوە، مەگەر بە ئەندازەی ئەوە كە كارەكەی تەواو دەكا، وەك تارەت گرتن و نان خواردن.

(ئەمەش ئەوەی) لێ وەردەگیرێ كە مەرجی چوونە ئیعتیكاف بەڕۆژوو بوون نیە، واتە: بەڕۆژوو بوون لە كاتی ئیعتیكافدا مەرج نیە، بەڵام زۆرێك لە زانایان وایان پێ باش بووە كە بابای دەچێتە ئیعتیكافەوە، وا باشە بەڕۆژووش بێ.

........................................

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير- ص ١٣٦.

## چەند ڕوونكردنەوەیەك دەربارەی ئیعتیكاف

### ڕوونكردنەوەی یەكەم:

دەبێ ئینسان لە كاتی ئیعتیكافدا، بێجگە لە یادی خواو، قوڕئان خوێندن و، نوێژو تاعەت و، بیركردنەوەو سەرگەرم بوون بەو شتانەی كە پەیوەندییان بەخوای پەروەردگارەوە هەیە، نابێ بەهیچ شتێكی دیكەوە سەرقاڵ بێ، مەگەر شتێك كە زۆر پێویست بێ، بۆ وێنە: كەسێك پرسیارێكی لێ دەكا، یان كارێكی زۆر پێویست دێتە پێشێ، ئەگەرنا بەپێی توانا دەبێ خۆی یەكلا بكاتەوە، بۆ ئەو مەبەستەی كە بۆی چۆتە ئیعتیكافەوە، كە بریتیە لە یادی خواو، نزیك كەوتنەوە لە خوا سبحانه و تعالی، تەنانەت هەندێ زانایان دەڵێن: كاتێك كە لە ئیعتیكافدایە، سەردانی نەخۆش و، چوونە تەعزیەو، سەردانی خزمان، كە ئەوانە هەموویان شتی گرنگن، لە كاتی چوونە ئیعتیكافدا، نابێ ئەوانەش بكا، مادام نیەتی ئیعتیكافی هێناوە، هەندێكیش دەڵێن: ئەو شتانەی لە خودی خۆیاندا خێرن، پێچەوانەو دژ نین لەگەڵ ئیعتیكافدا، بەمەرجێ ئەوەندە كاتیان نەوێ كە وای لێبكا، مانەوەكە لە مزگەوت، شتێكی وای لێ نەمێنێتەوە.

### ڕوونكردنەوەی دووەم:

واباشترە ئیعتیكاف لە مانگی ڕەمەزاندا بێ، زۆربەی زانایان وایان گوتوە، بەتایبەت لە دە (١٠) شەوی كۆتایی مانگی ڕەمەزان، لەو بارەشەوە چەند فەرموودەیەك هەن، بۆ وێنە:

(عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ {كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ}. رواه أبو داود برقم (٢٤٦٤)، وابن ماجة برقم (١٧٧٠) والترمذي برقم (٧٩٠)، قال الشيخ الألباني : صحيح.

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری

خوا (صلى الله عليه وسلم) عادەتی وابوو (دە) شەوی كۆتایی مانگی ڕەمەزان دەچووە ئیعتیكافەوە.

## ڕوونكردنەوەی سێیەم:

هەر چەندە لەنێو ئەهلی تەریقەت و تەصەووفدا (چل)ە كێشان هەیە، واتە: چوونە ئیعتیكافێك كە چل (٤٠) شەو بخایەنێ، كە ئەوە پێی دەڵێن: چلە كێشان، وە هەرچەندە هەندێ شت بەبەڵگە دەهێننەوە، وەك ئەوە كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ﴾ البقرة: ٥١

واتە: بەڵێنمان بە مووسادا بۆ ماوەی چل شەو.

هەروەها دەقێك بەناوی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەبەڵگە دێننەوە، كە مەدحی ئەوانە دەكا كە چل ڕۆژ، نوێژەكانیان بە كۆمەڵ دەكەن[1]، بەڵام لەڕاستیدا ئەوەی من ئێستا قەناعەتم پێیەتی، ئەوەیە كە: چلە كێشان بەو واتایە كە ئینسان چل (٤٠) شەو بچێتە ئیعتیكافەوە، بەڵگەیەكی وای لەسەر نیە، پشتی پێ ببەسترێ، هەرچەندە وەك گوتم: زۆر لە ئەهلی تەصەووف و تەریقەت كار بەوە دەكەن، بەتایبەت تەریقەتی قادریی، بەڵام ئەو شتانەی باسیان كردوون، بەبەڵگە ناشێن و، بایی ئەوە نین ئەو مەسەلەیان پێ ئیسپات بێ، چونكە:

١- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو پەڕی (٢٠) شەو چۆتە ئیعتیكافەوە، ئەویش لە مانگی ڕەمەزاندا.

٢- پاشان بەڵگە هێنانەوە بەوە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێش وەحی بۆ هاتن و هەڵبژێررانی بە پێغەمبەری كۆتایی، لە ئەشكەوتی

---

(١) كە زۆربەی زانایانی فەرموودە ناس، یان بە هەڵبەستراو (موضوع)، یان زۆر بە بێهێزی دادەنێن و، بەچەند بێژەیەك هاتوە، بۆ نموونە: {مَنْ أَدْرَكَ التَّكْبيرَةَ الأُولى مَعَ الإمامِ أَرْبَعُونَ صَباحاً كَتَبَ اللهُ لَهُ بَراءَتَيْن: بَراءة مِنَ النَّار، وَبَراءَة مِنَ النِّفاق} رواه أبو الشيخ، بڕوانە: (كشف الخفاء ومزيل الألباس...} للعَجلُوني: ٢٣٦١.

حيرادا مانگێك چۆتە ئیعتیكافەوە، ئەوەش بەبەڵگە ناشێ، چونكە ئەوە پێش پێغەمبەرایەتیی بووە، خوای زاناش بەدەقی قورئان دەفەرموێ:

﴿وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٥٢﴾ الشورى

خوا سبحانه و تعالی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: بەو شێوەیە (كە وەحییمان بۆ پێغەمبەران ناردوە) وەحییمان بۆتۆش نارد، ڕووحێكمان بۆ ناردی لەلایەن خۆمانەوە، كە پێشتر (پێش ئەوەی ئەو ڕووحەت بۆ بێ) نەتدەزانی نە كتێب چییە، نە ئیمان چییە، بەڵام ئێمە ئەو ڕووحەمان كردە ڕۆشناییەك كە هەر كام لە بەندەكان بمانەوێ، پێی ڕێنمایی دەكەین و هیدایەتی دەدەین، وە تۆ بێگومان خەڵك ڕێنمایی دەكەی بۆ ڕێگای ڕاست.

كەواتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەو كاتەوە كە وەحی بۆ هاتوە سەرمەشقی ئێمەیە، خوای بێ هاوتاش دەفەرموێ:

﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا ٢١﴾ الأحزاب

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە، باشترین سەرمەشق و پێشەوا هەیە، بۆ هەر كەسێ ئومێدی بە خواو بەڕۆژی دوایی بێ، وە زۆر یادی خوا بكا، كەواتە: پێغەمبەری خوا (رسول الله) بۆ ئێمە سەر مەشقە، نەك موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا، پێش ئەوەی خوای بەرز وەحی بۆ بنێرێ و هەڵی بژێرێ بە پێغەمبەری خۆی، هەرچەندە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا (صلی الله علیه وسلم) پێش پێغەمبەرایەتییش، خاوەنی باشترین مەعدەن و باشترین ڕەوشت بووە، وە دوور بووە لەو شتانەی كە خەڵكی سەردەمی نەفامی پێیەوە گیرۆدە بوون، بەڵام بەدەقی ئایەت خوای كاربەجێ دەفەرموێ: بەر لەوەی وەحییت بۆ بێ، نەتدەزانی نە كتێب چییەو، نە ئیمان چییە؟، كەواتە: وەك گوتراوە:

وَكُلُّ خَيْرٍ فِي اتِّبَاعِ مَن سَلَفْ ...... وَكُلُّ شَرٍّ فِي ابْتِدَاعِ مَنْ خَلَفْ

واتە: هەموو چاكەو خێرێك لە شوێن كەوتنی پێشینی چاك دایە، وە هەموو خراپەیەك (لە دینداریيدا) لەو داهێنان و پەیداكردنە دایە كە هەندێ لەوانەی دوایی پەیدایان كردوە.

چونكە لە بواری بەندایەتیی كردن بۆ خوادا، شەریعەت نوختەی خستۆتە سەر پیت و، بۆیە پێویستە پابەند بین بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، بە پێچەوانەی بواری هەڵسوكەوتەكانەوە، كە دەستمان كراوەیەو دەتوانین داهێنان بكەین، بەمەرجێ لەگەڵ یاساكانی شەریعەتدا تێك نەگیرێ، وە بەو شێوەیە بێ، كە بەرژەوەندییەكانمان دێنە دی.

## هۆكاری هەشتەم: لەگەڵ خۆدا تێكۆشان - (مجاهدة النفس )

مەبەستمان لە: لەگەڵ خۆدا تێكۆشان، ئەوەیە كە ئینسان دەبێ لەگەڵ خۆیدا خەریك بێ، خۆی لەگەڵ خۆیدا ماندوو بكا، نابێ نەفسی شوێن ئارەزووەكانی بخا، بەڵكو دەبێ سەری نەفسی بشكێنێتەوە، جڵەوی نەفسی توند بكا، لەبەردەم ئارەزووە ناشەرعییەكانیدا، لەو بارەوە هەم ئایەتی خوای بەخشەر، هەم فەرمایشتی پێغەمبەری سەروەر (صلى الله عليه وسلم) زۆرن، كە ئینسان بەبێ لەگەڵ خۆدا تێكۆشان و، خۆماندوو كردن لەگەڵ نەفس و، سەرشكاندنەوەو جڵەو توندكردنی نەفس بەرانبەر ئارەزووە ناشەرعییەكان، هەروەها بەبێ پاكسازیی و چاكسازیی تێدا كردنی، ئینسان ناتوانێ نەفسی خۆی تەزكیە بكا.

## گرنگیی لەگەڵ خۆدا تێكۆشان و، كاریگەریی لەسەر تەزكیەی نەفس لە قورئانی بەرزو بەپێزدا

١- ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾ النازعات

واتە: بەڵام هەر كەسێ لە پایەی پەروەردگاری بترسێ، وە نەفسی لە ئارەزووەكانی بگێڕێتەوە، ئەوە بێگومان بەهەشت جێ و مەئوایەتی.

٢- ﴿ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ ﴾ العنكبوت

واتە: وە هەركەسێك تێكۆشا (واتە: لەگەڵ خۆیدا خەریك بوو بۆ ئەوەی كە نەفسی پاك و چاك بكا) بێگومان سوودەكەی بۆ خۆیەتی، وە بێگومان خوا بێنیازە لە جیهانییان، واتە: كەسێك كە خۆی باش دەكا، خۆی لە باش بوونەكەی

بەهرەمەندە، ئەگەرنا خوا سبحانه و تعالى لەوە بەرزترە كە ئێمە بتوانین قازانج و سوودێكی پێ بگەیەنین، هەروەها بە پێچەوانەشەوە، هەركەسێ بەرەو خراپە دەچێ و خۆی خراپ دەكا، بێگومان خۆی لە خراپییەكەی خۆی زەرەرمەندە، ئەگەرنا خوا لەوە بەرزترە كە بەندەكانی بتوانن زیانی پێ بگەیەنن.

٣- ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾العنكبوت

واتە: ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا تێدەكۆشن (هەوڵ دەدەن و خۆ ماندوو دەكەن)، ئێمە بەرەو ڕێبازەكانی خۆمان ڕێنماییان دەكەین، وە بێگومان خوا لەگەڵ چاكەكارانە.

ئەهلی عیرفان گوتوویانە: (الطُرُقُ إلى الخالِق، بِعَدَدِ أَنْفُسِ الخَلائِق) واتە: ڕێگاكان بەرەو خوا، بە ئەندازەی نەفسی دروستكراوەكانن، واتە: ڕێ بەرەو خوا زۆرن، هەڵبەتە بەو مانایە نا، كە هەركەسە بە شیوو دۆڵێكدا بڕوا، بەڵكو هەموویان دەبێ بە ڕێگای شەریعەتدا بڕۆن، بەڵام مەبەستی ئەوەیە كە هەركەسە ئارەزووی لە تاعەتێك زیاترە، هەر كەسە بە شێوازی خۆی بەندایەتیی دەكا، لە چوار چێوەی شەریعەتدا، واتە: مەرج نیە ئەوانەی بەندەی بۆ خوا صوڵحاون و خوا پێداون، هەموویان یەك كار بكەن، دەبینی یەكێ زیاتر ڕەغبەتی بەلای عیلمدا هەیە، یەكێ زیاتر ڕەغبەتی بەلای عیبادەتی شەخصییدا هەیە، یەكێ بەلای ماڵ بەخشیندا، یەكێ بەلای جەنگ و جیهاددا.. هتد.

## كاریگەریی لەگەڵ خۆدا تێكۆشان لەسەر تەزكیەی نەفس، لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)

١- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ فِي اللَّه) أخرجه الترمذي برقم (١٦٢١) وقال: حسن صحيح، وابن حبان برقم (٤٦٢٤)، وأخرجه أيضًا: ابن المبارك في الجهاد برقم (١٧٥)، وأحمد برقم (٢٣٩٩٧)، والطبراني برقم (٧٩٧)، والبيهقي في كتاب الزهد الكبير برقم (٣٦٩)، والقضاعي

برقم (١٨٤)، والديلمي برقم (٦٦٢٩)، قال الشيخ الألباني: صحيح، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح..

واتە: تێکۆشەر کەسێکە لەگەڵ نەفسی خۆیدا تێدەکۆشێ لەپێناوی خوادا، واتە: لەگەڵ نەفسی خۆیدا خەریك دەبێ کە بژاری بکا لە سیفەتە خراپەکان واتە لە : (فجور)، وە بیڕازێنێتەوە بە سیفەتە باش و پەسندەکان واتە: بە (تقوى)، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾ الشمس

بێگومان نەفس بەتەقوا گەشە دەکاو لەخوا نزیك دەبێتەوەو پاك و چاك دەبێ، هەروەك بە تاوانیش دەکەوێتە بن کەمرەو ژەنگی چڵك و گوناح، وە لەخوا دوور دەکەوێتەوە.

**٢- لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:**

(الْكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ، وَالْعَاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا وَتَمَنَّى عَلَى اللَّهِ) أخرجه ابن المبارك برقم (١٧١)، والطيالسي برقم (١١٢٢)، وأحمد برقم (١٧١٦٤)، والترمذي برقم (٢٤٥٩) وقال: حسن، وابن ماجة برقم (٤٢٦٠)، وأبو نعيم في (الحلية) (٢٦٧/١)، والبيهقي برقم (٦٣٠٦)، والطبراني برقم (٧١٤١)، والحاكم برقم (١٩١) وقال: صحيح على شرط البخاري، وأخرجه أيضًا: البزار برقم (٣٤٨٩)، والقضاعي برقم (١٨٥)، وابن أبي عاصم في الزهد (٣٨/١)، والديلمي برقم (٤٩٣٠)، قال الألباني: ضعيف، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف لضعف أبي بكر بن أبي مريم وباقي رجال الإسناد ثقات.

واتە: ئینسانی عاقڵ و زیرەك و هۆشیارو بیرمەند، کەسێکە کە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا دەکا، وە کار بۆ دوای مەرگ دەکا، بەڵام دەستە پاچەو کەودەن و نەفام، کەسێکە نەفسی دەخاتە شوێن ئارەزووەکانی، دواییش خۆزگە دەخوازێ لەخوا.

کەواتە: لێپرسینەوە لەگەڵ خۆدا کردن، پێویستە بۆ ئەوەی ئینسان لە خوا نزیك ببێتەوە، وە بۆ ئەوەی نەفسی تەزکیە بێ، هەروەك چۆن نەفس شوێن ئارەزوو خستن، وە دوایی خۆزگە خواستن، ئینسان لە خوا دوور دەخاتەوە.

یەكێ لە عاریف و خواناسان لە شیعرێكدا دەڵێ:

وَمَن أَباحَ النَّفْسَ ما تَهْواهُ ...... فَإِنَّما مَعْبُودُه هَواهُ.

واتە: هەر كەسێ هەرچی نەفسی ئارەزووی كرد بۆی ڕەوا بكا، ئەوە بێگومان ئارەزووی خۆی كردوە بە پەرستراوی خۆی.

كە بە حەقیقەت ئەو ڕاستییە لە قورئاندا هاتوە، بەڵام ئەو شاعیرە كردوویەتی بە شیعر، چونكە خوا دەفەرموێ:

﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴿٢٣﴾ ﴾ الجاثية

واتە: ئایا سەرنجی ئەو كەسە نادەی، كە ئارەزووی خۆی كردوە بە پەرستراوی خۆی؟ كەواتە: دەگونجێ ئینسان ئارەزووی خۆی بكاتە پەرستراوی خۆی، پەرستن: واتە ئەو پەڕی: ملكەچیی و خۆشویستن و، بە گەورە گرتن و شوێن كەوتن[1]، ئەمە ئەگەر بۆ نەفست بوو، ئەوە تۆ نەفسی خۆتت پەرستوە، وە ئەگەر بۆ شەیتانت بوو، ئەوە شەیتانت پەرستوە، وە ئەگەر بۆ كەسێكت بوو، ئەوە ئەو كەسەت پەرستوە، وە ئەگەر بۆ حیزبێكت بوو، ئەوە ئەو حیزبەت پەرستوە، مادام ئەو پەڕی: ملكەچیی و خۆشویستن و، بە گەورە گرتنت بۆی هەبێ، كەواتە: ئەو شتە بووەتە پەرستراوی تۆ.

هەروەك لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا (صلى الله علیه وسلم) هاتوە:

(تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ وَالْقَطِيفَةِ) أخرجه البخاري برقم (٢٧٣٠)، وابن ماجة برقم (٤١٣٥)، وأخرجه أيضًا: ابن حبان برقم (٣٢١٨)، والبيهقي برقم (١٨٢٧٩).

واتە: بەدبەختە ئەوەی دەبێتە بەندە (یاخود كۆیلە)ی زێڕ، وە ئەو كەسەی دەبێتەی بەندە (یان كۆیلەی) زیو، (ئەو كاتە دیارە دوو جۆرە دراو هەبوون، دینارو درهەم، دینارەكە ڕۆمیی بووەو مەعدەنەكەی زێڕ بووە، وە دیرهەمەكەش هی فارسەكان بووەو، زیو بووە)، وە بەدبەختە ئەو كەسەی دەبێتە كۆیلەی بەرگ و پۆشاك. كەواتە: دەگونجێ ئینسان ببێتە كۆیلەی پارەو سامان، بەرگ و

.........................................

(١) غاية الذل والحب والتعظيم والإنقياد.

پۆشاك، سەیارە، ...هتد، هەركات ئینسان نەفسی چی پێ خۆش بوو، بۆی بكا، مانای وایە بۆتە كۆیلەو ژێر دەستی نەفسی خۆی، تەزكیەی نەفس كاتێ دەبێ، كە ئینسان تەنیا بەندەی خوا بێ، یانی: ئەو پەڕی: خۆشویستنی، لێ ترسانی، بە گەورە گرتنی، مل كەچ كردنی، سام و هەیبەت و، شەرم و ڕێز نواندنی، تەنیا بۆ خوا سبحانە و تعالی بێ.

٣- ئنجا لەو بارەوەش كە ئینسان دەبێ لەگەڵ خۆیدا خەریك بێ و تێكۆشان بكا، ئەم فەرمایشتەش هەیە كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دەفەرموێ:

(إِنَّمَا العِلْمُ بالتَّعَلُّم وَإِنَّمَا الحِلْمُ بِالتَّحَلُّم)، أخرجه الطبراني في "الأوسط" برقم (٢٦٦٣)، والخطيب (٢٠١/٥)، وابن عساكر (٩٧/١٨)، قال الشيخ الألباني: حسن.

واتە: بێگومان زانیاریی بە فێر بوونە، وە هێدیی و مەندیی بەخۆڕاهێنانە. یانی: ئەگەر بتەوێ زانا بی، دەبێ فێر بی، وە ئەگەر بتەوێ ئینسانێكی هێدیی و مەند بی، دەبێ ڕاهێنان و مەشق بەخۆت بكەی، دیارە هەردوو وشەی: (تَعَلُّم و تَحَلُّم) لەسەر كێشی (تفعُّل)ن، كە ئەو كێش (وزن)ە بۆ تەكەللوف و زەحمەت و مەشەققەتە، واتە: بەبێ ئەوە كە ئینسان خۆی ئەزیەت بدا، فێری زانست نابێ، وە بێ ئەوەی كار لەسەر خۆی بكا، ئینسان سیفەتی هێدیی و مەندیی تێدا پەیدا نابێ.

٤- هەروەها لە فەرموودەیەكی دیكەدا كە ئێمە بەشێكی لێ دەهێنین، كە شوێنی مەبەستە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دەفەرموێ:

(وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفُّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً خَيْرًا وَأَوْسَعَ مِنْ الصَّبْرِ) أخرجه أحمد برقم (١٥٦١٦)، والبخاري برقم (١٣٦١)، وأخرجه أيضًا: الطبراني برقم (٣٠٩٢)، ومسلم برقم (١٠٥٣).

واتە: هەر كەسێ خۆی لەسەر پاكیی ڕابێنێ، خوا پاكیی پێ دەبەخشێ، (عیففەت بریتیە لە نەفس پاكیی، ئنجا چ لەڕووی خواردن و خواردنەوە، چ لە ڕووی جنسیی، چ لە ڕووی ماڵ و سامان، لە هەموو ڕووەكانەوە)، وە هەر

كەسێ خۆی لەسەر بێ نیازیی و دڵ دەوڵەمەندیی ڕابێنێ، خوای دەوڵەمەندو بێ نیازی دەكا، وە هەركەس خۆی لەسەر خۆڕاگریی ڕابێنێ، خوا خۆڕاگری دەكات، وە هیچ كەس بەخششێكی لە خۆڕاگریی، باشترو فراوانتری پێنەدراوە. وە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە دەفەرموێ:

(لَيْسَ الْغِنَى عَن كَثْرَةِ الْعَرَضِ وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ) أخرجه أحمد برقم (٧٣١٤)، والبخاري برقم (٦٠٨١)، ومسلم برقم (١٠٥١)، والترمذي برقم (٢٣٧٣) وقال: حسن صحيح، وابن ماجة برقم (٤١٣٧).

واتە: دەوڵەمەندیی ئەوە نیە ئینسان شمەكی زۆر بێ، {(عرض) واتە: شمەك و كەل و پەل و سامان}، بەڵكو دەوڵەمەندیی، دەوڵەمەندیی دڵە.

ئنجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: هەر كەسێ خۆی لەسەر دەوڵەمەندی و بێنیازیی و چاوتێریی ڕابێنێ، خوای پەروەردگار ئەو سیفەتەی پێ دەبەخشێ، كەواتە: دەبێ كار لەسەر خۆت بكەی، بۆ ئەوەی ئەو سیفەتەت پێ ببەخشرێ، چونكە پیتی (س)ی سەر (يَسْتَعْفِفْ) بۆ (طَلَب)ە، واتە: ئەگەر داوای عیففەت و پاكیی بكەی، هەوڵی بۆ بدەی و كاری بۆ بكەی، خوا پێت دەبەخشێ، وە ئەگەر داوای بێ نیازیی و دڵ دەوڵەمەندیی و چاوتێریی بكەی، خوا ئەو سیفەتەت پێ دەبەخشێ، وە هەر كەسێ خۆی لەسەر خۆڕاگریی (صَبر) ڕابێنێ، خوای بەخشەر ئەو سیفەتەی پێ دەبەخشێ، دیسان لێرەدا (تَصَبر)یش لەسەر كێشی (تَفَعُّل)ەو ئەویش بۆ تەكەللوفە، واتە: دەبێ خۆت ڕابێنی و كار لەسەر خۆت بكەی و زەحمەت بدەیە بەر خۆت، ئنجا سیفەتی صەبرت پێ دەبەخشرێ، هەیە پێی وایە چۆنە، دەبێ هەر وابێ، دەڵێ: خوا وای دروست كردووم، دەڵێ: من هەر سروشتم وایە زوو تووڕە دەبم، یان دەڵێ: من هەر سروشتم وایە وشەی ناشیرینم بەدەمدا دێ، یان دەڵێ: من نەوسنم[1]، بەڵام نا، ئینسان دەتوانێ نەوسن نەبێ، بەڵكو عەفیف و نەفس بەرز بێ، وە لەبەرانبەر خواردندا چڵێس نەبێ، وە دەتوانێ تەنگە پرێسكەو چیكڵدانە

(١) وشەی (نەوسن) مانای (الشراهة)ی عەرەبییە، واتە: خۆ پێ نەگیران لەبەرانبەر شتی خۆشدا، كە پێم وایە نەوسن لە (نەفسن)ەوە هاتوە، یانی كەسێك كە لەژێر كاریگەریی و كۆنترۆڵی نەفسی دایە، دیارە وشەی (چڵێس)یش مانایەكەی لە (نەوسن)ەوە نیزیكە.

بچووك نەبێ، سینەی خۆی فراوان بكاو، خۆڕاگرو بە تەحەممول بێ، وە دەتوانێ زمانی خۆی پاك ڕابگرێ و، دووربێ لە وشەی ناڕێك و بێ نەزاكەت، بۆیەش خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردوون، وە كتێبی پێدا ناردوون، لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئینسان دەگونجێ لە كوفرەوە بگوازێتەوە بۆ ئیمان، وە لە گوناهەوە بگوازێتەوە بۆ فەرمانبەریی، وە لە سیفەتی خراپەوە بگوازێتەوە بۆ سیفەتی باش، وەك ئەبو حامیدی غەززالیی زۆر جوان دەڵێ: هەندێ كەس دەڵێن: خوا ئینسانی چۆن دروست كردوە هەر وادەبێ، بەڵام وا نیە، تەنانەت ئاژەڵ و دڕندەكانیش مەشق دەدرێن و دەگونجێ ڕابهێنرێن[1].

وەك دەشبینرێ حووت لە دەریادا ڕادەهێنرێ، پڵنگ و شێر، سەگ و تاژی، ئەدی مرۆڤێك كە جێنشینی خوایە، مرۆڤێك كە بەباشترین شێوە خوڵقاوە، مرۆڤێك كە هەڵگری پەیامی خوایە، چۆن توانای خۆ چاك كردن و خۆ گۆڕینی نیە؟، بێگومان هەیەتی، بەبەڵگەی ئەوە كە خوا سبحانە و تعالی ئەو هەموو پێغەمبەرانەی (علیهم الصلاة والسلام)، ناردوون، وە ناوونیشانی پێغەمبەران ئەوەیە كە خوای زاناو توانا دەفەرموێ:

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء

واتە: پێغەمبەرانێكی دڵ خۆشكەرو ترسێنەر، موژدەدەرو وریا كەرەوە، بۆ ئەوەی خەڵك دوای هاتنی پێغەمبەران بەڵگەو بیانووی لەسەر خوا نەبێ، بەڵێ، پێغەمبەران، هاتوون خەڵك بیانوو بڕ بكەن، هاتوون بەڵگەی خوا لەسەر خەڵك دابنێن، وە دوای ئەوەی كە هیدایەتی خوا بەخەڵك ڕادەگەیەنن، خەڵك بیانوو بڕ دەبێ، وە ئینسانیش توانای هەیە هیدایەتی خوا وەربگرێ، ئەوە شتێكی سەلمێنراوە، خەڵكێك كافر بووە، دوایی بۆتە مسوڵمان، یان گوناهبار بووە، بووەتە چاكەكار، مرۆڤ هەیە كت و پڕ وەرچەرخانێكی گەورەی بەسەردا دێ.

---

(١) بروانە: (إحياء علوم الدين) ج٨ ص١٤٤٤- ١٤٤٥، ربع المهلكات: (كتاب رياضة النفس وتهذيب الأخلاق) بيان قبول الأخلاق للتغير بطريق الرياضة.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە درێژەی فەرموودەکەدا دەفەرموێ:
وە هیچ کەسێ بەخششێکی پێ نەبەخشراوە، باشترو فراوانتر لە خۆڕاگریی، چونکە بەهۆی خۆڕاگرییەوە ئینسان دەتوانێ تاعەت بکا، وە دەتوانێ لە گوناهو تاوانان دوور بێ، وە هەر بەهۆی خۆڕاگرییەوە، دەتوانێ لەبەرانبەر بەڵاو موصیبەتەکاندا خۆڕاگر بێ، چونکە خۆڕاگریی و ئارام گرتن (صبر) بە گشتی سێ جۆرە: (الصَّبر عَلى الطّاعة، و الصَّبْرُ عَنِ المَعْصية، والصَّبْر عَلى المُصيبة)،

١- خۆ ڕاگریی لە بەرانبەر تاعەتدا، کە ئەنجامی بدەی.

٢- خۆڕاگریی لە بەرانبەر گوناهدا، کە نەیکەی.

٣- خۆڕاگریی لەبەرانبەر بەڵاو موصیبەتدا، کە ئینسان کارێك نەکا شەرمەزاری لای خوا بێ، هەر لەگەڵ ناڕەحەتییەکی تووش هات، گلەیی لە خوا بکا!.

٥- هەر لەو بارەوە فەرموودەیەکی دیکە دێنین کە بەڕاستیی زۆر جێی سەرنجە، فەرمایشتەکە لەلایەن خواوەیە واتە: فەرمایشتێکی قودسییە، خوای مەزن پێمان دەفەرموێ کە چۆن لەگەڵ نەفسی خۆماندا خەریك بین، وە چۆن لەو نزیك ببینەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەخواوە بۆمان دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ:

(إِنَّ اللَّهَ قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ، حَتَّى أُحِبَّهُ فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ)، أخرجه البخاري برقم (٦١٣٧)، وأخرجه أيضًا: ابن حبان برقم (٣٤٧)، والبيهقي برقم (٢٠٧٦٩)، وأبو نعيم في الحلية (٤/١).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە خوای بەرزو مەزن دەگێڕێتەوە دەفەرموێ:
(خوای بەرز فەرموویەتی: هەرکەسێك دژایەتیی دۆستێکی من بکا، ئەوە من ئاگادارم کردۆتەوە، کە جەنگەکەی لەگەڵ منە، وە بەندەی من بە هیچ شتێك لەوانەی لەسەرم فەرز کردوون، خۆشەویستتر لەلام، لەمن نزیك نەبۆتەوە، (واتە: ئینسان بەهۆی ئەنجام دانی فەرزەکانەوە، لەهەموو شتێك زیاتر لە خوا

نزيك دەبێتەوە)، وە بەردەوام بەندەكەم لەمن نزيك دەبێتەوە، بەو شتانەی پەسندم كردوون، {واتە: لەسەرم فەرز نەكردوون، بەڵكو بەچاكم داناون، كە (مندوبات) وە (نوافل)يان پێدەگوترێ}، بەردەوام لێم نزيك دەبێتەوە تاكو خۆشم دەوێ، ئنجا ئەگەر خۆشمويست: دەبمە ئەو بيستنەی پێی دەبيستێ، وە ئەو ديتنەی كە پێی دەبينێ، وە ئەو دەستەی كە شتی پێ دەگرێ، وە ئەو پێيەی كە پێی دەڕوا، وە ئەگەر داوای لێكردم پێی دەبەخشم، وە ئەگەر پەنای پێ هێنام پەنای دەدەم.
ديارە زانايانی فەرموودە ناس لەو بارەوە كە ئايا مانای ئەم فەرموودەيە چۆنە؟ زۆر قسەيان كردوە، پوختەی قسەكانيان ئەوەيە كە خوا سبحانە و تعالی دەيەوێ ئێمە حاڵی بكا كە: بەچی لێی نزيك دەبينەوە؟!، كەواتە:

## ئـايـا ئێمە بەچی لە خوا نزيك دەبينەوە؟

**يەكەم**: ئێمە بەهۆی ئەنجامدانی فەرزەكانەوە، لە هەموو شتێك زياتر لە خوا نزيك دەبينەوە.

**دووەم**: بەهۆی ئەنجامدانی سوننەتەكانەوە، زۆر لە خوا نزيك دەبينەوە، تاكو وامان لێ دێ خوای پەروەردگار ئێمەی خۆش بوێ.

**سێيەم**: كە ئێمەی خۆشويست: گوێ و چاوو دەست و پێمان واتە: هەموو ئەندامەكانی لەشمان، وايان لێدێ، تەنيا لە ڕەزامەنديی خوادا ئيش دەكەن.

واتە: گوێ هەوڵ دەدا تەنها ئەو شتانە ببيستێ، كە خوا لێيان ڕازييە، وە چاو هەوڵ دەدا تەنها سەرنجی ئەو شتانە بدا، كە بۆی ببنە پەندو لە خوای نزيك بخەنەوە، هەروەها دەست هەوڵ دەدا تەنها بۆ ئەو شتانەی بچێ كە ڕەزامەنديی خوايان تێدايە، هەروەها پێ تەنها بۆ لای ئەو شتانە دەڕوا، كە ڕەزامەنديی خوايان تێدايە.

لێرەدا مەبەستی فەرموودەكە بەو شێوەيە، ئەگەرنا خوا نابێتە دەست و قاچ و گوێ و چاوی خەڵك، بەڵام ماناكەی ئەوەيە كە ئەو ئەندامانەی ئەو ئينسانە

كە فەرزەكان جێبەجێ دەكا، وە شتە پەسندەكان ئەنجام دەدا، وايان لێدێ: كە لە شيرازەی ئايينی خوا دەرناچن و، لە چوارچێوەی شەريعەت دەرناچن، وە لە فەرمانی خوا دەرناچن، ئنجا هەر كەسێكيش وا بوو، ئەوە خوای بەخشەر دەفەرموێ: ئەگەر داوام لێبكا، بەردەوام پێی دەبەخشم، وە ئەگەر پەناشم پێ بێنێ پەنای دەدەم، جا بەڕاستی ئەوە موژدەيەكی زۆر گەورەو خۆشە.

**چوارەم:** بەوە لەخوا نزيك دەبينەوە كە نەفسی خۆمان لەسەر ئەنجامدانی ئەركە شەرعييەكان ڕابهێنين، چ ئەوانەی كە ئەگەر ئەنجاميان نەدەين، گوناهمان دەگاتێ، كە بريتيين لە فەرزەكان، وە چ ئەوانەی كە هەرچەشەو لێپرسينەوەيان لەسەر نيە، بەڵام بە چواندنيان خێرێكی گەورەمان لەكيس دەچێ، كە پێيان دەگوترێ، شتە پەسندەكان، ياخود سوننەتەكان، كە ئەگەر بيانكەی خێرت دەگاتێ، وە ئەگەر نەيان كەی گوناهت ناگاتێ.

٦- هەر لەو بارەوە لە فەرموودەيەكی ديكەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(حُجِبَتْ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ وَحُجِبَتْ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ) أخرجه البخاري برقم (٦١٢٢).

واتە: ئاگر، بە ئارەزووان دەورە دراوە، بەهەشتيش بە ناڕەحەتييان، واتە: هەركەسێ بەدوای ئارەزووان بكەوێ، سنوورو شوورەی دۆزەخ دەبڕێ و دەچێتە نێويەوە.

## كەواتە: بەرەو خوا چوون پێويستی بەچی هەيە؟

هەركەسێ بيەوێ بەرەو خوا بچێ و بچێتە بەهەشت، دەبێ سەختيی و ناڕەحەتييەكان ببينێ و بيانبڕێ، (مَكارِه) واتە: ئەو شتانەی كە ناڕەحەتن و زەحمەتيان دەوێ، دەبێ ئەو ڕێگايە ببڕێ و بە هەورازی تاعەت هەڵگەڕێ، بەرەو خوا چوون پێويستی بە تەحەممول كردنی ناڕەحەتييان دەكا، پێويست بە تەحەممول كردنی ئەزيەت و ماندوبوون دەكا، بەڵام كەسێ بيەوێ بەرەو دۆزەخ بچێ، ئەوە خۆی بە سەرەو لێژی ئارەزووەكاندا خلۆر دەكاتەوەو، بەرەو دۆزەخ دەچێ!.

٧- كۆتا فەرموودە كە لەو بارەوە بیهێنین، ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەفەرمویٚ:

(عن أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عن النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فيما يَرْوِيهِ عن رَبِّهِ قَالَ: (إِذَا تَقَرَّبَ الْعَبْدُ إِلَيَّ شِبْرًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِذَا تَقَرَّبَ مِنِّي ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وَإِذَا أَتَانِي مَشْيًا أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً)) رواه البخاري برقم (٧٠٩٨).

ئەنەس ڕەزای خوای لێبیٚ لە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خواش لە خوای پایە بەرزو مەزن دەگێڕێتەوە، كە خوا فەرموویەتی: (ئەگەر بەندەی من بستێك بۆ لای من بیٚ و لێم نزیك بێتەوە، من باسكێك بۆ لای دەچم، وە ئەگەر ئەو باسكێك لێم نزیك بێتەوە، من باڵێك بۆ لای دەچم، وە ئەگەر ئەو بە ڕۆیشتن بۆ لام بیٚ، من بەڕاكردن بۆی دەچم.

لێرەدا ئەم نزیك بوونەوەیە تەعبیرێكی مەجازییە، واتە: دەبیٚ تۆ پێشیٚ بەرەو خوا بجووڵێی، وەك دەڵیٚ: (لەتۆ حەرەكەت و لە خوا بەرەكەت) كەواتە پێشیٚ دەبیٚ بجووڵێی لە فەرموودەكەدا دەفەرمویٚ: (تَقَرَّبَ)، دیسان ئەمەش لەسەر وەزنی (تَفَعَّل)ەیە واتە: دەبیٚ خۆت ئەزیەت بدەی، تاكو لەخوا نزیك بكەویەوە، بە پەیڕەی شەریعەتدا و لەڕێگای تاعەتەوە، دەبیٚ كار لەسەر خۆت بكەی، بۆ ئەوەی لێی نزیك ببیەوە، واتە: هەمیشە خوا پێی خۆشە بەندەكەی بۆ لای بیٚ، بەڵام بەندە دەبیٚ حەرەكەت بكا، تاكو خواش بەرەكەت باوێتە حەرەكەتەكەی و، لەخۆی نزیك بخاتەوە.

## هۆكاری نۆیەم: چاكەكاری و سوود بە خەڵك گەیاندن

هۆكارێكی دیكەی تەزكیە بوونی نەفس ئەوەیە كە: ئینسان چاكەكار بێ و سوودی بۆ خەڵك هەبێ، وە ببێتە مایەی بەختەوەرییان، وە ببێتە مایەی لە خوا نزیك بوونیان و پاك و چاك بوونیان، ئەوەش دیسان كاریگەرییەكی زۆری هەیە لەسەر ئەوە كە نەفسی ئینسان تەزكیە بێ و لەخوا نزیك بێ، لەو بارەوە هەم ئایەتی خوای كاربەجێ، هەم فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆرن.

## گرنگیی چاكەكاریی و سوود گەیاندن بە خەڵك، لەسەر تەزكیەی نەفس لە قورئانی بەرزو بەپێزدا

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥﴾ البقرة.

واتە: وە چاكە بكەن، بێگومان خوا چاكەكارانی خۆش دەوێ.

دیارە خوا سبحانە و تعالى بە ڕەهایی (مطلق)ی فەرموویەتی چاكە بكەن، نەیفەرمووە لەگەڵ مسوڵمانانداا، یان لەگەڵ كێ و كێ، بەڵكو بەگشتی فەرموویەتی چاكە بكەن، بگرە نەشیفەرمووە بەس لەگەڵ ئینسان، بەڵكو دەگونجێ لەگەڵ ئاژەڵیشدا چاكە بكەی و، لەگەڵ درەختیشدا چاكە بكەی، وەك لە فەرمایشتێكی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، كە پیاوێك بەهۆی ئەوەوە دەچێتە بەهەشت، كە سەگێكی تینوو دەبینێ، دوای ئەوەی كە خۆی ئاو دەخواتەوە، سەگە تینووەكەش ئاو دەدا، خوای بەخشندە بەهۆی ئەوەوە دەیباتە بەهەشت[1]، وە لە فەرموودەیەكی دیكەدا هاتوە كە بە پێچەوانەوە: ئافرەتێك بەوە دەچێتە دۆزەخ، كە پشیلەیەك حەپس دەكات لە ماڵێ،

(١) رواه البخاري : ٦٠٠٩، ومسلم: ٢٢٤٤.

بۆخۆی هیچی ناداتێ و ئازادیشی ناكا لە زەویدا بگەڕێ و شت بخوا، تاكو وای لێدێ پشیلەكە لە برسان و تینووان دەمرێ و، بەهۆی ئەوەوە خوای دادگەر سزای دەدا بەدۆزەخ[1].

كەواتە: چاكە كردن لەگەڵ هەموو دروستكراوەكانی خوادا، دەبێتە هۆی ئەوەی خوا خۆشی بوێین، دیارە خواش كەسێكی خۆش دەوێ، كە نەفسێكی پاك و چاكی هەبێ.

٢- ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا ﴿٨٣﴾﴾ البقرة

واتە: وەشتی چاك بە خەڵك بڵێن، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ) أخرجه أحمد برقم (٨١٦٨)، والبخاري برقم (٢٨٢٧)، ومسلم برقم (١٠٠٩)، وابن حبان برقم (٣٣٨١).

واتە: وە قسەی باش چاكەیەو خێرەو (پاداشتی هەیە).

٣- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٧٧﴾﴾ الحج.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕكووع بەرن و كڕنووش بەرن و پەروەردگارتان بپەرستن، وە چاكە بكەن، بەڵكو سەرفراز بن. دیارە ڕكووع و سەجدە واتە: نوێژ، هەڵبەتە (وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ) پەروەردگارتان بپەرستن، نوێژیش دەگرێتەوەو دوعاش دەگرێتەوە، زیكرو یادی خواش دەگرێتەوە، وە هەموو ئەو پەرستنانەی لە نێوان بەندەو خوادا ئەنجام دەدرێن، دەگرێتەوە، (وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ) واتە: چاكە بكەن، لەگەڵ خەڵكی خوادا چاكە بكەن، كەواتە: خوا پەرست بن و، خەڵك دۆست بن بەڵكو سەرفراز بن.

---

(١) رواه البخاري: ٣٤٨٢، ومسلم: ٢٢٤٢.

٤- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ النحل

واتە: بێگومان خوا لەگەڵ ئەو كەسانەدایە كە پارێز دەكەن، وەلەگەڵ ئەوانەدایە كە چاكەكارن، كەواتە: بەهۆی چاكەكارییەوە، دوای پارێزكاریی، شایستەی ئەوە دەبین، خوا لەگەڵمان بێ، ئنجا كە خوا لەگەڵتدا بوو، دیارە خاوەن نەفسێكی پاك و چاكی، لە ئەنجامی ئەوەوە كە تۆ خاوەن پارێزكاریی و چاكەكاریی، تەقوا لەگەڵ خواو، چاكە لەگەڵ خەڵكی خوا.

## كاریگەریی چاكەكردن لەگەڵ خەڵك، لەسەر تەزكیەی نەفس، لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)

١- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ) رواه البخاري برقم: (٢٩٨٩)، ومسلم برقم: (٢٠٠٩). قسەی چاك صەدەقەیەو خێرو چاكەیە.

٢- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(لَا تَحْقِرَنَّ مِنْ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ)، أخرجه أحمد برقم (٢١٥٥٩)، ومسلم برقم (٢٦٢٦)، والترمذي برقم (١٨٣٣) وقال: حسن صحيح، وأخرجه أيضًا: ابن حبان برقم (٥٢٣) والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٣٤٦٠).

واتە: هیچ شتێك لە چاكە بەكەم مەگرە، ئەگەر هەر ئەوەندە بێ، بە ڕووێكی خۆشیشەوە بگەیە برایەكەت، (یان خوشكی مسوڵمانت)، ڕووت لەگەڵیان خۆش بێ، قسەت لەگەڵیان خۆش بێ، گفت و لفتت لەگەڵیان شیرین بێ، ئەوەش بەشێكە لە چاكە.

٣- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ) أخرجه أحمد برقم (١٧٦٦٨)، والبخاري في الأدب المفرد برقم (٢٩٥)، ومسلم برقم (٢٥٥٣)، والترمذي

برقم (٢٣٨٩) وقال: حسن صحيح، وأخرجه أيضًا: الحاكم برقم (٢١٧٢) وقال: صحيح الإسناد.

واتە: چاكەكاریی بریتیە لە ڕەوشتی جوان، وە گوناهیش ئەوەیە كە لەدڵتدا بێت و بچێت و پێی مورتاح و ئاسوودە نەبی، وە پێشت ناخۆش بێ خەڵك بیزانێ.

بەڵام كە دەفەرموێ: هەر شتێ دڵت پێی مورتاح نەبوو، گوناهە، دیارە مەبەست دڵێكی پڕ لە ئیمانە، دڵی ئینسانێكی ئیماندار، ئەگەرنا دڵی خراپەكارێك، بە گوناح موڕتاحە، شەڕاب دەخواو، زینا دەكاو، قومار دەكاو دزیی و گەندەڵیی و زوڵم دەكا، پێشی موڕتاحە، لەبەر ئەوەی دڵەكەی نەخۆشە، بەڵام ئەوەی لە فەرموودەكەدا ئاماژەی پێدەكا، مەبەستی دڵێكی ساغە.

٤- هەر لەو بارەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێكی دیكەدا دەفەرموێ:

(الخَلْقُ كُلُّهُم عِيالُ الله فَأَحَبُّ الخَلْقِ إِلى اللهِ أَنْفَعُهُم لِعِيالِهِ) أخرجه أبو يعلى برقم (٣٣١٥)، وأخرجه أيضًا: البيهقي شعب الإيمان برقم (٧٤٤٥)، والطبراني في المعجم الكبير برقم (١٠٠٣٣)، قال الهيثمي (١٩١/٨): رواه أبو يعلى والبزار، وفيه يوسف بن عطية الصفار، وهو متروك، وقال الألباني حديث ضعيف في السلسلة الضعيفة برقم (١٩٠٠).

واتە: خەڵك هەموویان ژیێنراوی خوان، سەرپەرشتیكراوانی خوان، {(عیال) ئەوانەن سەرپەرشتیان دەكرێ و نەفەقەیان دەكێشرێ}، وە خۆشەویستترینیان لەلای خوا، ئەو كەسەیە كە بۆ بەندە مشور لێخوراوەكانی بەسوودتر بێ.

ئەم دەقە هەر چەندە سەنەدەكەی كە دەیباتەوە سەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بێهێزە، بەڵام ماناكەی ڕاست و دروستەو، لەگەڵ باقی ئایەت و فەرمایشتەكانی دیكەدا تێك دەكاتەوە.

٥- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(لَأَنْ يَمْشِيَ أَحَدُكَم مَعَ أَخِيهِ فِي قَضاءِ حاجَتِهِ، أَفْضَلُ مِن أَن يَعْتَكِفَ فِي مَسْجِدِي هذا شَهْرَيْن، وَأَشارَ بِإِصْبَعَيْه) أخرجه الحاكم في المستدرك برقم (٧٧٠٦)، قال الألباني في ضعيف الترغيب والترهيب: ضعيف جداً.

واتە: ئەگەر یەكێ لە ئێوە سەعاتێك بڕوا لەگەڵ برایەكەیدا، بۆ ئەوەی كارێكی بۆ جێبەجێ بكا، {سەعات مەرج نیە مەبەستی لە بەشێك بێ لە بیست و چوار (٢٤) بەشی شەوو ڕۆژ، بەڵكو مەبەستی ماوەیەكە هەروەها كەسەكە برابێ، یان خوشكێكی مسوڵمان بێ، زۆر جار كە باسی پیاو دەكرێ لەبەر ئەوە بووە، ئەوانەی لە مەجلیسەكەدا بوون لە گەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیە وسلم) زۆربەیان لە ڕەگەزی پیاو بوون} بۆی باشترە لەوەی دوو مانگ لە مزگەوتی مندا بچێتە ئیعتیكافەوە، وە ئاماژەشی كرد بە دوو پەنجە موبارەكەكەی.

ئەوەش بەڕاستی موژدەیەكی زۆر گەورەیە، بەڵام دیارە ئیشێكی سادەو ئاسان نا، بەڵكو ئیشێك كە زەحمەتییەك بكەوێتە سەر ئەو كەسە كە ئەنجامی دەدا، یان مەترسییەكی تێدا بێ، یاخود سوودێكی وا بگەیەنێ بەبەرانبەرەكەی، زیاتر بێ لە خێری دوو مانگ چوونە ئیعتیكاف، لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیە وسلم)، كە نوێژێك لەو مزگەوتەدا بە (١٠٠٠) نوێژە، كەواتە: چوونە ئیعتیكافیش لە وێدا بەقەد (١٠٠٠) ئیعتیكافە، لە مزگەوتەكانی دیكەدا، ئەو هەموو خێرو چاكەیە بەرانبەر بەوە، كە بەدەم ئیشی مسوڵمانێكەوە بچی و، كارێكی بۆ تەواو بكەی و، خەمێكی لێ بڕەوێنیەوە، خێری ئەوە لە خێری ئەو عیبادەتە زیاترە.

٦- دیسان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دەفەرموێ:

(الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لَا يَظْلِمُهُ وَلَا يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ، كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَنْهُ بِهَا كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) أخرجه أحمد برقم (٥٦٤٦) والبخاري برقم (٢٣١٠)، ومسلم برقم (٢٥٨٠)، وأبو داود برقم (٤٨٩٣)، والترمذي برقم (١٤٢٦) وقال: حسن صحيح غريب، والنسائي في الكبرى برقم (٧٢٩١)، وإبن حبان برقم (٥٣٣)، وأخرجه أيضًا: القضاعي برقم (١٦٩)، والبيهقي برقم (١١٩٠٨).

واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە، ستەمی لێ ناكا، وە تەسلیمیشی ناكا، (واتە:

نە زوڵمی لێ دەكا، نە تەسلیمی كەسێكیشی دەكا ئەو كەسە زوڵمی لێ بكا)، وە هەر كەسێ بەدەم كاری برایەكیەوە بچێ، خوا بەدەم كاریەوە دێ، وە هەر كەسێ خەمی مسوڵمانێك بڕەوێنێ، خوا بەهۆی ئەوەوە خەمێكی لە خەمەكانی قیامەتی لێ دەڕەوێنێ، وە هەر كەسێ (عەیبی) مسوڵمانێك داپۆشێ خوا لە قیامەت (عەیبەكانی) بۆ دەپۆشێ.

٧- هەر لەو بارەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ ، أَعْظَمُ أَجْرًا مِنَ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يُخَالِطُ النَّاسَ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ) أخرجه أحمد برقم (٢٣١٤٧)، والبيهقي برقم (١٩٩٦٢)، وأخرجه أيضًا: ابن أبي شيبة برقم (٢٦٢٢٠)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

واتە: ئەو ئیماندارەی كە لەگەڵ خەڵك تێكەڵ دەبێ و خۆڕاگریش دەبێ لەسەر ئەزیەت و ئازاریان (قسەی ناڕێك دەكەن، هەڵوێستی ناڕێكی بەرانبەر دەنوێنن، بەڵام خۆڕاگر دەبێ و، وەك ئەوان ناكا)، باشترە لەو مسوڵمانەی تێكەڵیان نابێ و، لەسەر ئەزیەت و ئازارەكانیان خۆڕاگر نابێ.

٨- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(الْمُؤْمِنُ آلِفٌ مُؤْلِفٌ، وَلَا خَيْرَ فِيمَنْ لَا يَأْلَفُ وَلَا يُؤْلَفُ) أخرجه أحمد برقم (٢٢٨٩١)، وأخرجه أيضًا: الطبراني برقم (٥٧٤٤)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن

واتە: ئیماندار خەڵكیش هۆگری خۆی دەكا، هۆگری خەڵكیش دەبێ، (لەگەڵ خەڵكی دەگونجێ و خەڵكیش لەگەڵ خۆی دەگونجێنێ)، وە هەر كەسێ نەتوانێ خەڵك هۆگریی خۆی بكاو، هۆگریی خەڵك بێ، ئەوە خێری پێوە نیە. ئەوانەی سەرەوە چەند بەڵگەیەكی قورئان و سوننەت بوون، لەسەر ئەوە كە چاكە لەگەڵ خەڵك كردن و سوود پێ گەیاندنیان پێیان، لەخوامان نزیك دەخاتەوە، وە ئەو كردەوانە دەمانكەن بە خۆشەویستی خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بێگومان ئەوانیش كەسانێكیان خۆش دەوێ كە خاوەن نەفسێكی پاك و چاك بن.

## هۆكاری دەیەم: داوای لێبوردن لە خوا كردن و، بۆ لای خوا گەڕانەوە (الإستغفار و التوبة)

ئەمیش دیسان هۆكارێكی گەورەو گرنگی تەزكیەی نەفسە، لەو بارەشەوە هەم ئایەتی خوا سبحانه و تعالی، هەم فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زۆرن، كە ئینسان بەهۆی داوای لێبوردن كردنەوە لە خوا، بۆ هەڵەو گوناهێك كە كردوویەتی، وە بەبێ هەڵەو تاوانیش، وەك دوایی باسی دەكەین، وە بەهۆی بەردەوام گەڕانەوەوە بۆ لای خوا، زیاتر نەفسی تەزكیە دەبێ و، پاك و چاك دەبێ و، زیاتر لە خوا نزیك دەبێ.

## كاریگەریی داوای لێبوردن لە خوا كردن و گەڕانەوە، لەسەر تەزكیەی نەفس لە قورئانی بەرزو بەپێزدا

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ النور

واتە: وە تێكڕاتان ئەی ئیماندارینە! بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، بەڵكو سەرفراز بن. وشەی (تاب) لە زمانی عەرەبیدا یەعنی (عاد - رجع)، كەواتە: (تاب إلی الله- یانی: بۆ لای خوا گەڕایەوە)[1]، وە كە دەگوترێ: فلان كەس تەوبەی كردوە یانی: گەڕاوەتەوە، كەواتە: تەوبە كردن بۆ لای خوا، مایەی سەرفرازییە، خوای زاناش دەفەرموێ:

﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ ﴾ الأعلى

واتە: ئەو كەسە سەرفرازە كە نەفسی خۆی تەزكیە كردوە، لە ئایەتەكەی دیكەشدا دەفەرموێ: بەهۆی گەڕانەوەوە بۆ لای خوا، سەرفراز دەبن، كەواتە: گەڕانەوە بۆ لای خوا یەكێكە لە هۆیەكانی تەزكیە بوونی نەفس.

(١) مختار الصّاح ، ص ٨٣ .

٢- لە ئایەتێكی دیكەدا دەفەرموێ:

﴿ وَأَنِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴿٣﴾ ﴾ هود

واتە: وە داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بكەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای.

٣- هەروەها دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ ﴿٨﴾ ﴾ التحريم

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بە گەڕانەوەیەكی ساغ بگەڕێنەوە لای خوا، نزیكە خوا خراپەكانتان لێ بسڕێتەوە (بەهۆی گەڕانەوەیەكی ڕاست و ساغەوە). (نَّصُوحًا) لە (نصح)ەوە هاتوە، (نّاصح: الخالص من كل الشيء)[1] واتە: كرۆكی، یاخود شیلەی شتێك، (تَوۡبَةً نَّصُوحًا) واتە: گەڕانەوەیەكی ساغ و بێ خلّتە، تەوبەیەك كە پێویست نەكات تەوبەی لێ بكەیەوە، كەسێك كە دەڵێ: تەوبەم لە گوناهان كردوە، كەچی لەسەر گوناهەكانی بەردەوام دەبێ، لە ڕاستیدا دەبێ تەوبە لەو تەوبەیە بكا، وەك هەندێ لە ئەهلی عیرفان و تەصەووف ئەو تەعبیرەیان بەكار هێناوە.

٤- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَعۡفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۚ ﴿٢٦﴾ ﴾ الشورى

واتە: خوا ئەو زاتەیە كە گەڕانەوە لە بەندەكانی وەردەگرێ، وە لە خراپەكان دەبووریّ، وە دەزانێ چی دەكەن، وە وەڵامی ئەوانە دەداتەوە كە بڕوایان هێناوە، وە كردەوە باشەكانیان ئەنجام داوە، وە لەچاكەی خۆی بۆیان زیاد دەكا.

لە ئەنجامی داوای لێبوردن كردن و گەڕانەوەیاندا بۆ لای خوا، خوا وەڵامیان دەداتەوە، وە لە خراپەكانیان دەبووریّ، وە لەچاكەی خۆی بۆیان زیاد دەكا، كە دیارە ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوە كە: هەم بژار بكرێین هەم بڕازێینەوە، كە دیارە ئەوەش كاكڵەی تەزكیە نەفسە.

................................

(١) مختار الصحاح، ص ٥٦٩.

## کاریگەریی داوای لێبوردن لە خوا کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا، لەسەر تەزکیەی نەفس، لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ أَحَدِكُمْ إِذَا اسْتَيْقَظَ عَلَى بَعِيرِهِ قَدْ أَضَلَّهُ بِأَرْضِ فَلَاةٍ)، أخرجه البخاري برقم (٥٩٥٠).

واتە: خوا خۆشحاڵ ترەو شادمان ترە بە گەڕانەوەی بەندەکەی بۆ لای، لە یەکێکتان کە وڵاخەکەی دەدۆزێتەوە، لە کاتێکدا کە لە بیابانێکدا ونی کردوە، لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە:

(لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ حِينَ يَتُوبُ إِلَيْهِ مِنْ أَحَدِكُمْ كَانَ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِأَرْضِ فَلَاةٍ فَانْفَلَتَتْ مِنْهُ وَعَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ فَأَيِسَ مِنْهَا، فَأَتَى شَجَرَةً فَاضْطَجَعَ فِي ظِلِّهَا، قَدْ أَيِسَ مِنْ رَاحِلَتِهِ، فَبَيْنَا هُوَ كَذَلِكَ إِذَا هُوَ بِهَا قَائِمَةً عِنْدَهُ فَأَخَذَ بِخِطَامِهَا، ثُمَّ قَالَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ: اللَّهُمَّ أَنْتَ عَبْدِي وَأَنَا رَبُّكَ أَخْطَأَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ) رواه مسلم برقم (٢٧٤٧).

واتە: خوا شادمان ترە بە گەڕانەوەی بەندەکەی بۆ لای، کاتێک دەگەڕێتەوە بۆ لای لە یەکێکتان کە خواردن و خواردنەوەو پێویستیەکانی هەموویان لەسەر پشتی وڵاخەکەیتی، کەچی لە دەشتێکی چۆڵدا لێی بەرهەڵدا دەبێ، ونی دەکات، ئنجا پاش ئەوەی بێئومێد دەبێ لە دۆزینەوەی، دەچێتە ژێر سێبەری درەختێك و دەخەوێ (بۆ ئەوەی لەوێدا بمرێ) دوایی هەر هێندە دەزانێ: وشترەکەی دێتە بەردەمی، لە خۆشیادا دەڵێ: ئەی خوایە! تۆ بەندەی منی، من پەروەردگاری تۆم!!، لەزۆر خۆشحاڵیان بەهەڵەدا دەچێ، ئنجا ئەو بەندەیە چەند دڵ خۆشە خوا سبحانە و تعالى لەو شادمانترە کە بەندەکەی دەگەڕێتەوە لای، ئنجا تەماشای ئەو بەخشش و کەرەمەی خوا بکەن!!.

ئەو بەندەیە دەزانێ ئەگەر وشترەکەی نەدۆزێتەوە، تێ دەچێ، بەڵام خوا سبحانە و تعالى بێ نیازە لە بەندەکانی، کەچی هێندەش خۆشحاڵ و شادمانە کە بەندەکانی بگەڕێنەوە بۆ لای !.

# بـــاسـێك دەربــارەی تــەوبــە[١]

دێینە سەر باسی تەوبەو پێناسەی تەوبە، تەوبە یانی چی؟ مەرجەكانی چین؟ وە ئایا هەموو كەس پێویستی بە تەوبە هەیە؟ وە پاشان بزانین خوای بەبەزەیی تا چ كاتێك تەوبەو گەڕانەوە لە بەندەكانی قەبووڵ دەكا؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە ئێمە لە سێ خاڵدا باسی تەوبە دەكەین:

١- پێناسەی تەوبەو مەرجەكانی.

٢- هەموو كەس پێویستیی بەتەوبەو گەڕانەوە هەیە بۆ لای خوا، نەك ئەوەی باوە لە نێو خەڵكدا، كە گوایە كە تەنیا ئەو كەسەی گوناح دەكا، پێویستە بگەڕێتەوە لای خوا!!.

٣- ئایا چ كاتێك خوا تەوبەی بەندەكانی وەردەگرێ؟!: باسی ئەوە دەكەین كە تەوبە كردن بۆ لای خوا، خوا هەر وەری دەگرێ بە لوتف و كەرەمی خۆی، مادام ئینسان لە ژیان نائومێد نەبووبێ و دەستی لە هەموو پچكان نەپچڕابێ.

## ١- پێنـاسـەی تەوبەو مەرجـەكانی:

### یەكەم: پێنـاسـەی تەوبە:

أ- لە ئەصڵی زماندا: وەك پێشتریش باسمان كرد: (تابَ يَتُوبُ تَوْبَةً: رَجَعَ يَرْجِعُ رُجوعاً)[٢]، كەواتە: (توبة) یانی گەڕانەوە.

ب- لە زاراوەی شەرعدا: بریتیە لەوە كە ئینسان بەرەو خوا بگەڕێتەوەو لەخوا نزیك بێتەوە، ئنجا كە بەرەو لای خوا دەگەڕێتەوە، مەرج نیە هەر لە گوناهەوە

.........................................

(١) كتێبێكمان لە بارەی (توبة) وە نووسیوە كە تا ئێستا پێنج جار چاپ كراوە، هەروەها لە تەفسیری سووڕەتی (النساء) یشدا باسێكمان لەو بارەوە كردووە.

(٢) مختار الصحاح، ص ٨٣.

بەرەو لای خوا بگەڕێتەوە، بەڵكو جاری وایە لە كوفرەوە بەرەو ئیمان دەگەڕێتەوە، وە جاری وایە لە گوناهەوە بەرەو گوێڕایەڵیی دەگەڕێتەوە، وە جاری وا هەیە لە جۆرێك لە فەرمانبەریی ساردو سڕ بۆ خوا، دەگەڕێیەوە بۆ جۆرێكی دیكەی باشتر لە فەرمانبەریی بۆ خوا، كە وەك دوایی باسی دەكەین: گەڕانەوەی پێغەمبەری خواو، هەموو پێغەمبەرانی دیكە (علیهم الصلاة والسلام) لەو جۆرەیان بووە.

## دووەم: مەرجەكانی تەوبە:

زانایان دەڵێن: ئەگەر تەوبەكە بۆ ئەو گوناهانە بێ، كە لەنێوان بەندەو خوادا كراون، سێ مەرجی پێویستن:

١- دەست هەڵگرێ لەو گوناهە.

٢- لێی پەشێمان بێ.

٣- بڕیار بدا نەگەڕێتەوە سەری.

بەڵام ئەگەر ئەو گوناهو سەرپێچییە، لەنێوان خۆی و خەڵكدا بێ، وێڕای ئەو سێ مەرجەی سەرەوە، مەرجێكی دیكەشی پێویستە:

٤- هەقی خاوەن هەقەكان بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەكانیان.

كە خوای بەخشندە دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ ﴿٨﴾﴾

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە گەڕانەوەیەكی ساغ بگەڕێنەوە لای خوا، نیزیكە خوا خراپەكانتان لێ بسڕێتەوە.

بێگومان مەبەست لە (تَوْبَةً نَّصُوحًا) گەڕانەوەی ڕست و ساغ، ئەوەیە كە لەو ئایەتەدا هاتوە، ئەو مەرجانەی تێدا بن، كە باسمان كردن.

## گوناح و تاوانی سادە تەوبەو گەڕانەوەی سادەی دەوێ، بەڵام گوناهـ و تاوانی ئاڵۆز، تەوبەكەشی دەبێ وەك خۆی بێ

## بـۆ وێنـە:

١- ئەگەر كەسێ ماڵی كەسێكی دیكەی خواردبێ بە ناهەق، یان جنێوی بە كەسێك دابێ:

ماڵەكەی بۆ دەگێڕێتەوە، دیارە ئەگەر مابێ، ئەگەرنا دەبێ بیدات بە میراتگرەكانی، ئەگەرنا بیگێڕێتەوە بۆ بەیتولمال، بەڵام ئەگەر حەقەكە نەتوانرێ بگێڕرێتەوە، دەبێ گەردنی خۆیان پێ ئازاد بكات و داوای لێبوردنیان لێ بكا، بۆ وێنە: ئەگەر زەمی كردبوون، لەمەودوا هەوڵ بدا مەدحیان بكا، وە ئەگەر عەیب داری كردبوون، لەمەودوا هەوڵ بدا جوانیان بكات.

٢- بەڵام ئەگەر كەسێ حاڵەتی نیفاقی بووبێ:

ئەو جۆرە كەسانە خوای دادگەر تەوبەكەیانی بەچەند شتێ مەرج دار كردوە، بۆ وێنە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ ﴾ النساء

واتە: مونافیقەكان لە پلەی ژێرەوەی ئاگردان، وە هیچ پشتیوان و یارمەتی دەرێكت بۆ ئەوان چنگ ناكەوێ، جگە لەوانەی كە دەگەڕێنەوە، ئنجا ئایا كە گەڕانەوە تەواو؟ نەخێر، بەڵكو دوای گەڕانەوەیان، دەبێ ئەو مەرجانە لە خۆیاندا بێننە دی:

**مەرجی یەكەم:** (وَأَصۡلَحُواْ ) كە هەتا ئێستا خراپەیان كردوە، ئێستا دەبێ چاكسازیی بكەن و، هەرچی تێكیان داوە، هەوڵ بدەن چاكی بكەنەوە.

**مەرجی دووەم:** (وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ ) كە هەتا ئێستا بە دووڕوویی خۆیان بەمسوڵمان پێشان داوەو دینداریيان كردوە، لەمەودوا بەڕاستیی و ساغیی دینداریی بكەن.

**مەرجی سێیەم:** (وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ ) وە دەست تەنیا بەخوا بگرن، ئەگەر هەتا ئێستا كەین و بەینیان لەگەڵ ئەهلی كوفردا بووە، لەمەودوا دەست بە ڕێسمانی خوا بگرن و، تەنیا پەیوەندییان لەگەڵ ئەهلی ئیماندا بێ.
ئنجا كە ئەو سێ مەرجەیان لێ هاتنە دی، ئنجا دەفەرموێ: ئا ئەوانە لەگەڵ ئیمانداران دان، وە خوا پاداشتێكی مەزن دەداتەوە بە ئیمانداران.

٣- دەربارەی ئەو زانایانەی كە ئایەتەكانی خوایان شاردۆتەوە لە خەڵكی: سەریان لە خەڵك شێواندوە: ئەمانەش هەر بەوەندە تەوبەكانیان قبووڵ نابن، كە تەوبەیەكی سادەو ساكار بكەن، بەڵكو خوا تەوبەی ئەوانیشی مەرج دار كردوە، بەچەند شتێك، وەك دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ ﴾ البقرة

واتە: بێگومان ئەوانەی بەڵگە ڕۆشنەكانمان و ڕێنماییەک كە دامانبەزاندوون، پاش ئەوەی بۆ خەڵكیمان ڕوونكردوونەوە لە كتێب (ی خۆمان)دا، دەشارنەوە، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێ دەكا، وە هەرچی نەفرینكەریشە نەفرینیان لێ دەكا، (كەواتە: حاڵیان زۆر خراپە)، زانای خراپ كە ئایەتەكانی خوا دەشارێتەوەو ژێر لێویان دەخاو بەجۆرێك باسی ئیسلام دەكا كە خەڵكی خراپ و لادەر پێیان خۆش بێ، ڕاستییەكانی دین ناخاتە ڕوو لەبەر بەرژەوەندی دنیایی، لەبەر زار چەوركرانێك و ئافەرین بۆ كرانێك، ئەوانە خواو لەعنەتكەرەكان لەعنەتیان لێ

دەكەن، ئنجا باسی تەوبەیان دەكاو مەرج داری دەكاو دەفەرموێ تەنیا ئەوانە نەبێ كە دەگەڕێنەوە (تەوبە دەكەن) بەڵام لەگەڵ تەوبە كردنەكەیان، ئەو مەرجانەیان بۆ دادەنێ:

**مەرجی یەكەم:** (وَأَصۡلَحُواْ) پاش گەڕانەوەیان دەبێ چاك سازیی بكەن.

**مەرجی دووەم:** (وَبَيَّنُواْ) ئەگەر تاكو ئێستا ڕاستییەكانی دینیان شاردۆتەوە، لەمەودوا ڕوونیان بكەنەوە، پاش ئەو دوو مەرجە ئنجا دەفەرموێ: من لێیان خۆش دەبم، وە من لێبوردەی بەبەزەییم.

## ٢- هەموو كەس پێویستی بە تەوبە هەیە:

هەموو كەس پێویستی بەوە هەیە بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، نەك هەر گوناهباران، وەك زۆربەی خەڵكی وای لێ حاڵی بوون، هەر بۆیە خوا سبحانە و تعالى باسی لێبوردن لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەكات:

﴿ لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴿٢﴾ ﴾ الفتح

پێغەمبەری خواش كە باسی تەوبەو داوای لێبوردن كردن دەكا، لە فەرموودەكانیدا، هەندێ كەس وای تێدەگەن كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك خەڵكی دیكە گوناهی كردوە! بەڵام نەخێر، بەڵكو ئەوە چەمك و واتایەكی دیكەی هەیە، وەك ئێستا ڕوونی دەكەینەوە، گرنگ ئەوەیە بزانین هەموو مرۆڤەكان پێویستییان بە گەڕانەوە هەیە بۆ لای خوا سبحانە و تعالى، لەبەر ئەوەی گەڕانەوە بۆ لای خوا چەند پلەیەكی هەیە:

١) **پلەی یەكەمی تەوبە:** ئەوەیە كە ئینسان لە كوفرەوە بگەڕێتەوە بۆ ئیمان و، داوای لێبوردن لەخوا بكا، لەو كوفرو شیرك و نیفاقەی لەسەری بووەو، بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام و تەنها خواپەرستیی.

٢) **پلەی دووەمی تەوبە:** ئەوەیە ئینسان لە گوناهو تاوان و سەرپێچییەوە بگەڕێتەوە بۆ تاعەت و فەرمانبەریی کردن.

٣) **پلەی سێیەمی تەوبە:** ئەوەیە کە ئینسان بگەڕێتەوەو داوای لێبوردن لە خوا بکا لە تاعەت و گوێڕایەڵیی و چاکەیەکی کەم، بۆ تاعەت و گوێڕایەڵیی و چاکەیەکی زیاتر، کە شایستەی خوای پەروەردگارە.
ئنجا لێرەدایە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسی تەوبەی خۆی دەکاو دەفەرموێ:

(وَاللَّهِ إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً) أخرجه البخاري برقم (٥٩٤٨)، وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (٨٤٧٤)، والنسائي في الكبرى برقم (١٠٢٧٠)، وابن حبان برقم (٩٢٥)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٦٣٩)، والديلمي برقم (٧٠٢٤).

واتە: سوێند بەخوا، من داوای لێبوردن لەخوا دەکەم، وە دەگەڕێمەوە بۆ لای، لە ڕۆژێکدا زیاتر لە حەفتا جار. وە لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە سەد (١٠٠) جار[١]، گەڕانەوەو داوای لێبوردن لەخوا کردنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەبەر ئەوە بووە کە ئەو تاعەت و چاکەیەی خۆی کە لە لووتکەی هەرە بەرزی دابووە، کاتێك بەراوردی کردوە لەگەڵ پایەی بەرزی خوا، لەگەڵ بەرزیی و مەزنیی و ناوو سیفاتە بەرزەکانی خوادا، تاعەتەکەی خۆی هەرچەندە باشترین تاعەت بووە، بەڵام بە شایستەی خوای بێ وێنەی نەزانیوەو، فەرمووپەتی: خوایە! داوای لێبوردنم هەیە، ئەوە شایستەی پایەی بەرزی تۆ نیە! بۆیە ئینسان تاکو لە خوا نزیکتر بێ، تاعەتەکانی خۆی پێ بچووکترن، وە بە پێچەوانەوە تاکو لە خوا دوورتر بێ، ئەو تاعەت و چاکانەی دەیانکا پێی گەورەترن، کەواتە: هەموو کەس پێویستیی بە گەڕانەوەو داوای لێبوردن کردن لە خوا سبحانه وتعالى هەیە.

........................................
(١) رواه مسلم: ٢٧٠٢.

## ٣- ئـــایا تــا چ كاتێك خـــوای پــەروەردگار گەڕانەوەی بەندەكانی وەردەگرێ ؟

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمایشتێكی خۆیدا، وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەداتەوەو دەفەرموێ:

(إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ) أخرجه أحمد برقم (٦٤٠٨)، والترمذي برقم (٣٥٣٧)، وقال: حسن غريب، وابن ماجة برقم (٤٢٥٣)، وابن حبان برقم (٦٢٨)، والحاكم برقم (٧٦٥٩) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٧٠٦٣)، وأبو يعلى برقم (٥٧١٧)، والبغوي في الجعديات برقم (٣٤٠٤)، قال الألباني: حسن، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

واتە: خوای پەروەردگار گەڕانەوەی بەندەكەی وەردەگرێ، مادام ڕووح نەگەیشتبێتە گەرووی. كەواتە: تاكو پێش گیان سپاردن، خوای بەبەزەیی تەوبەی بەندەكەی وەردەگرێ.

## دواندنی گوناهباران و هاندانیان بۆ گەڕانەوە، لەلایەن خوای بەبەزەییەوە:

كۆتا دەق لە بواری تەوبەدا كە بیهێنین، دووانن:

### یەكەمیان:

ئەو ئایەتەیە كە زۆربەی زانایان بە موژدەبەخشترین ئایەتی دادەنێن، بۆ گوناهباران و خراپەكاران، ئەوانەی دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، خوای بەبەزەیی پێیان دەفەرموێ:

﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥٣﴾ الزمر

واتە: بڵێ ئەی ئەو بەندانەم كە بەرانبەر بەخۆتان زێدەڕۆییتان كردووە! لە ڕەحمەت و بەزەیی خوا نائومێد مەبن، بێگومان خوا لەهەموو گوناهان دەبووری، بەدڵنیاییەوە هەر ئەو لێبوردەی بەبەزەییە. كەواتە: لێبوردن و بەزەیی خوا سنووری

نیەو گوناهەكانی ئێمە هەر چەند زۆر بن، هەر كەم و بچووك و نابووتن بەرانبەر بەبەزەیی خوا، بەمەرجێك ئێمە لێیان پەشێمان ببینەوە، وە دەستیان لێ هەڵبگرین و نەگەڕێینەوە سەریان.

بەڵێ ئەم ئایەتە زۆر دڵخۆشكەرە بۆ بەندەكان، چونكە لەگەڵ ئەوەشدا كە گوناهی زۆریشیان كردوون، بەڵام خوای میهرەبان دەیاندوێنێ و بانگیان دەكا بە وشەی: ئەی بەندەكانم (يَٰعِبَادِيَ )!!.

## دووەمیان:

ئەو فەرموودە قودسیەیە كە بەڕاستیی ئەویش زۆر دڵخۆشكەرە:

(عن أَنَس بْنُ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ مَا دَعَوْتَنِي وَرَجَوْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ فِيكَ وَلَا أُبَالِي، يَا ابْنَ آدَمَ لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ وَلَا أُبَالِي، يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ لَوْ أَتَيْتَنِي بِقُرَابِ[1] الْأَرْضِ خَطَايَا ثُمَّ لَقِيتَنِي لاَ تُشْرِكُ بِي شَيْئًا لَأَتَيْتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً) أخرجه الترمذي برقم (٣٥٤٠)، وقال: حسن، قال الألباني: صحيح.

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو، دەیفەرموو: خوا تبارك و تعالی فەرموویەتی: ئەی ڕۆڵەی ئادەم! دڵنیابە تۆ هەرچەندە لێم وەپاڕێی و ئومێدەوارم بی، هەرچیەكت هەبێ لێت دەبوورم و بێباكم، ئەی ڕۆڵەی ئادەم! ئەگەر گوناهەكانت بگەنە هەوری ئاسمانێ، پاشان داوای لێبوردنم لێبكەی، لێت دەبوورم و بێباكم، ئەی ڕۆڵەی ئادەم! ئەگەر تۆ نزیكەی پڕاو پڕی زەمین گوناهم بۆ بێنی، پاشان پێم بگەی بێئەوەی هیچ شتێك بكەیە هاوبەشم، منیش بە نیزیكەی پڕاو پڕی زەمین لێبوردنت بۆ دێنم.

خوای پەروەردگار بە لوتف و كەرەمی خۆی لەو كەسانەمان بگێڕێ كە بەردەوام دەگەڕێنەوە لای خوا، چ لە گوناح و تاوانەوە بۆ تاعەت، چ لە تاعەتێك بۆ تاعەتێكی باشتر، وە خوا بەلوتف و كەرەمی خۆی بەهۆی زۆر گەڕانەوەمانەوە بۆ لای، بمانكاتە خاوەن نەفسێكی باشترو چاكتر.

.........................................

(١) قُراب الأرض: ما يقارب ملأها. رياض الصالحين، للنووي، ص ١٩٥.

# هۆکاری یازدەیەم: ئاکارو ڕەوشتی بەرزو جوان (حسن الخلق)[1]

بێگومان ئاكارو ڕەوشتی جوان و خووی بەرزو پەسند، بەرهەمی تەزكیەی نەفسە، واتە: دوای ئەوە كە ئینسان نەفسی تەزكیە دەبێ ڕەوشتی بەرزو جوان دەبێ، بەڵام هەم ڕەوشتی جوان و، هەم هۆكارەكانی دیكەش كە باسمان كردن، لەگەڵ تەزكیەی نەفسدا كارلێكی دووسەرەیان هەیە، واتە هەتا ڕەوشتت بەرزو جوانتر بێ، نەفست تەزكیەتر دەبێ، وە هەتا نەفسیشت تەزكیەتر بێ، ئاكارو ڕەوشتت بەرزو جوانتر دەبێ، هەڵسوكەوتت شیرنترو دڵگیرتر دەبێ، هەموو هۆكارەكانی دیكەش كە پێشتر باسمان كردن، بەهەمان شێوە لەگەڵ تەزكیەی نەفسدا، كارلێكی دووسەرەیان هەیە.

## كاریگەریی ڕەوشتی بەرزو جوان لەسەر تەزكیەی نەفس، لە قورئانی بەرزو بەپێزدا

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ نٓ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم

لێرەدا ڕووی دواندن (خطاب) لە پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: نوون (یەكێكە لەو پیتانەی كە قورئانیان لێ پێكهاتوە)، سوێند بە قەڵەم و بەو دێڕەی كە بەقەڵەم دەنووسرێ، تۆ سوێند بە نیعمەتی پەروەردگارت، شێت نی، ئەمە واتایەكی، واتایەكی دیكەی: تۆ بەهۆی نیعمەت و چاكەی پەوەردگارتەوە (كە پێغەمبەرایەتیی بەتۆ بەخشیوە) شێت نی، (وەك كافرەكان

.............................................

(١) كتێبی: (ئاكارو ڕەوشتی ئیسلامی) كە تێیدا (١٥٥) ئاكار و ڕەوشتی بەرزو پەسند خراونە ڕوو، لە ژێر چاپە.

پڕو پاگەندەیان دەكرد)، نەك هەر شێت نی، بەڵكو (خوا پەرستێكی زۆر گەورەی، وە) پاداشتێكی نەبڕاوەشت هەیە[1]، وە بێگومان تۆ لەسەر ڕەوشتێكی مەزنی. دیارە ئێمە مەبەستمان ئەم ئایەتە موبارەكەیە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هیچ گومانی تێدا نیە كە لەسەرووی ڕەوشتە بەرزەكانە، خاوەنی چاكترین خوا پەرستیی بووەو، لە لووتكەی هەموو سیفەتە بەرزو پەسندەكاندا بووە، ئنجا ئەو پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) خوای زانا پێی دەفەرمویێ: تۆ لەسەر ڕەوشتێكی مەزنی، كەواتە: ئەو ڕەوشتە پاك و چاك و بەرزەی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) كە وای لێكردوە، ئەو نەفسە پاك و چاكەی هەبێ، وە ئەو نەفسە پاك و چاكەیەتی، كە وای كردوە كە ئەو ڕەوشتە بەرزو مەزنەی هەبێ.

٢- لە ئایەتەكانی كۆتایی سوورەتی (الفرقان)دا خوای شارەزا، ئەو بەندانەی كە بۆ خوا صوڵحاون و هەڵبژاردوون و خۆشی دەوێن و، بە بەندەكانی خاوەن بەزەیی (عباد الرحمن) ناوی بردوون، كۆمەڵێك سیفەتیان لێ هەڵدەدا، كە هەموویان دەچنە نێو بازنەی ڕەوشتی بەرزو جوانەوە، دەفەرمویێ:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ
سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا
ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا
وَمُقَامٗا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ
قَوَامٗا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ
إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ

.................................................

(١) غير ممنون: غير مقطوع، أو غير منقوص. مختار الصحاح، ص ٥٤٩. منەت كردن (مَنّ، مِنَّةً) بۆیە وای پێگوتراوە، چونكە مایەی بڕینی خێرو پاداشتی چاكەیە، یان مایەی شكاندنی پشتی بابای چاكە لەگەڵ كراوە، هێندە پێی ناڕەحەت دەبێ كە بابای چاكەكار منەتی لەسەر دەكات و بەچاویدا دەداتەوە، یان لەملاولا باسی دەكات، بۆیە گوتراوە: (المِنَّةُ تَهْدِمُ الصَّنيعة) یانی: منەت كردن چاكە دەڕووخێنێ.

ٱلْقِيَـٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟
كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا
﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّـٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا
لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾

خوا سبحانە و تعالی لەو چەند ئایەتە موبارەكەدا، بەندە دانستەكانی خۆی، بەندە هەڵبژێرراوەكانی خۆی، بە دوازدە (١٢) سیفەت و ڕەوشت وەسف دەكا:

**سیفەتی یەكەم:** ( وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا ) واتە: بەندەكانی خوای خاوەن بەزەیی ئەوانەن كە بەئارامیی بەڕێدا دەڕۆن.

**سیفەتی دووەم:** (وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَـٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا ) واتە: وە ئەگەر نەفامەكان قسەیان لەگەڵدا بكەن، دەڵێن: سەلام، یاخود قسەی سەلامەت دەكەن، واتە خۆیان نابەنە ڕیزی هەموو كەس.

**سیفەتی سێیەم:** ( وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَـٰمًا ) دوو سیفەتەكەی سەرەوە سیفەتی ڕۆژێیان بوون، ئنجا دێتە سەر سیفەت و ڕەوشتی شەوگاریان وە دەفەرموێ: وە ئەوانەی كە لەشەودا ماوەیەكی زۆر بۆ پەروەردگاریان دەمێننەوە بە كڕنووش براویی و بە ڕاوەستاویی، واتە: قورئان دەخوێنن و كڕنووش دەبەن.

ئنجا بەو تاعەت و عیبادەتەشیان لەخۆیان بایی نابن، بەڵكو لەخوا دەپاڕێنەوە بیانبووریَ، وەك لە ڕەوشتی چوارەمیاندا باسیان دەكا.

**سیفەتی چوارەم:** لەخۆبایی نابن بە عیبادەتەكانیان و دەڵێن: (رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ) واتە: پەروەردگارمان! ئازاری دۆزەخمان لیَ لابدە.

**سیفەتی پێنجەم:** ئنجا یەكیَ لە ڕەوشە بەرزو پەسندو بەرزەكانیان، بریتیە لە بەخشین لەپێناوی خوادا، وەك دەفەرمویَ: ( وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ) واتە: ئەوانەی كاتیَ دەبەخشن، نە زێدەڕۆیی دەكەن، نەدەستیش دەقووچێنن، بەڵكو خەتی نێوەڕاست دەگرن.

**سیفەتی شەشەم:** دوایی باسی ڕەوشتێکی دیکەی بەرزو پەسندی ئەو کەسانە دەکاو دەفەرموێ: (وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ) واتە: وە ئەوانەی لە جگە لەخوا لە هیچ پەرستراوێکی دیکە ناپاڕێنەوە.

**سیفەتی حەوتەم:** (وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ) وە ئەو نەفسەی خوا قەدەغەی کردوە، نایکوژن، مەگەر بەهەق.

**سیفەتی هەشتەم:** (وَلَا يَزۡنُونَ) وە زینا ناکەن.

**سیفەتی نۆیەم:** (وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ) وە ئەوانەی کە لە کۆڕو مەجلیسی درۆو گوناهو لاداندا ئامادە نابن.

**سیفەتی دەیەم:** (وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامًا) وە هەرکات بەلای قسەو کردەوەی پووچ و بێ سووددا گوزەریان کرد، بەڕێزەوە ڕادەبرن.

**سیفەتی یازدەیەم:** (وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمًّا وَعُمۡيَانًا) وە ئەوانەی کاتێ ئایەتەکانی پەروەردگاریانیان بۆ خوێندرانەوە، کەڕو کوێرانە ناکەونە سەریان.

**سیفەتی دوازدەیەم:** (وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا) وە ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان! لە هاوسەران و وەچەماندا مایەی دڵخۆشییمان بۆ بڕەخسێنەو، بمانگێڕە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران.

کەواتە: بە ڕەوشتی بەرزو جوان، ئینسان دەبێە بەندەی هەڵبژێرراوی خوا، وە بێگومان خوای بەرزو پاکیش تەنها ئەو بەندانە بەبەندەی هەڵبژێرراوی خۆی دەزانێ، کە خاوەنی نەفسێکی بەرزو جوان بن و، مەعدەنێکی پاکیان هەبێ و، ڕووحێکی بەرزو چاکیان هەبێ.

## كاریگەریی ڕەوشتی بەرزو پەسند لەسەر تەزكیەی نەفس، لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)

لەو بارەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموودەی زۆرن، كە ئێمە هەندێكیان لێ دەهێنین:

١- (عن أَنَسٍ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْسَنَ النَّاس خُلُقًا)، أخرجه البخاري برقم: (٥٨٥٠)، و مسلم برقم (٦٥٦).

واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ كە دە (١٠) ساڵان خزمەتی پێغەمبەری خوای كردوە (صلى الله عليه وسلم) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو كەس ڕەوشتی بەرزو جوانتر بوو.

٢- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(إِنَّ مِنْ خِيَارِكُمْ أَحْسَنَكُمْ أَخْلَاقًا) أخرجه البخاري برقم: (٣٣٦٦)، ومسلم: (٢٣٢١).

واتە: بێگومان لە باشترینتان، ئەوانەتانن كە ڕەوشتیان جوانترە، ئاكارو ڕەوشتیان پەسندترو باشترە.

٣- لە فەرمایشتێكی دیكەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِهِمْ) أخرجه الترمذي برقم (١١٦٢) وقال: حسن صحيح، وابن حبان برقم (٤١٧٦) والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٢٧)، قال الألباني: حسن صحيح.

واتە: ئیمان تەواوترینی بڕواداران، ڕەوشت جوانترینیانە، وە باشترینتان باشترینتانن بۆ هاوسەرەكانتان. یانی: بەو شێوەیە كە شەریعەت دەڵێ، مامەڵەیان لەگەڵدا بكەن: ڕێزیان بگرن، چاو پۆشیی لە كەم و كوڕییەكانیان بكەن.

چونكە لە ڕاستییدا ئینسان ئیمانێكی چاكی نەبێ، ناتوانێ وەك شەرع دەڵێ مامەڵە لەگەڵ ماڵ و خێزانیدا بكات، لەبەر ئەوەی ئافرەت بەهۆی زاڵ بوونی عاتیفەو سۆز بەسەریدا، وەك پیاو بیر ناكاتەوە، وەك پیاو مامەڵە ناكا، بۆیە پیاو دەبێ هەمیشە دڵی گەورەبێ و ئامادەیی چاوپۆشیی و لێبوردەیی هەبێ لەگەڵیدا.

٤- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ) (١)

واتە: بێگومان ئیماندار بە ڕەوشتی بەرزو جوانی دەگاتە پلەی كەسێك كە هەمیشە بە ڕۆژوویە (ڕۆژووی سوننەت)، وە شەویش هەمیشە شەونوێژ دەكا، واتە: ڕۆژوو گرو شەونوێژكەرێكی زۆر باش، ئینسان بەهۆی ڕەوشتی جوانەوە، دەگاتە ئەو پلەیە، كەواتە: با وا نەزانین كە تاعەت و بەندایەتیی بۆ خوا، تەنها نوێژو ڕۆژوویە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ئیماندار بەهۆی ڕەوشتی بەرزو جوانی، دەگاتە پلەی كەسێك كە هەمیشە ڕۆژانە بە ڕۆژوویە، وە شەویش لە نوێژدایە.

بۆیە من جارێك لە كۆبوونەوەیەكدا برایەكی خۆمان بە ڕۆژوو بوو، ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممەی دەگرتن، بەڵام بەجۆرێك قسەی كرد، كە ئەوانەی لەوێ دانیشتبوون، هەموویانی لەخۆی نیگەران كرد، منیش گوتم: برایەكەم! ڕۆژووەكەت نەگری و برایەكانت نیگەران نەكەی، خێرت زیاترە، لەوەی بەڕۆژوو بی و برایەكانت نیگەران بكەی، وە لەوانەیە ڕۆژووەكەشت بكەیە بیانووی ئەوە كە تەنگەپرێسكە بی و دڵت بچووك بێ(٢)، چونكە ڕۆژوو گرتنەكەت، خێرەكەی تەنیا بۆخۆتە، بەڵام ڕازی كردنی مسوڵمانان لە سنووری شەرعداو ڕێز لێگرتن و دڵ ڕاگرتنیان، خێرێكی گشتگیرە، پاشان ڕۆژوو گرتن بۆ ئەوەیە

(١) أخرجه أبوداود برقم ٤٧٩٨ و، ابن حبال برقم ٤٨٠ و، أخر أيضا أحمد ٢٤٦٣٩، قال شعيب صحيح لغيره.

(٢) واتە: برسیبوون و تینوو بوونەكەت بكەیە پاساوی زوو تووڕە بوون و هەڵچوونت.

ئینسان پەروەردە بکا، وەك مەشق و ڕاهێنانێکە بۆ ئینسان، کە ئینسان چۆن خواردن و خواردنەوە لەخۆی دەگرێتەوە، دەبێ قسەو هەڵسوکەوتی نارێکیش لەخۆی بگرێتەوە، وەك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خواشدا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە[1].

٥- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَنْ يَحْرُمُ عَلَى النَّارِ أَوْ بِمَنْ تَحْرُمُ عَلَيْهِ النَّارُ، عَلَى كُلِّ قَرِيبٍ، هَيِّنٍ، لَيِّنٍ، سَهْلٍ) رواه الترمذي برقم (٢٤٨٨) وقال: حديث حسن، قال الألباني: صحيح.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕوو لە هاوەڵانی دەکاو دەفەرموێ: ئایا هەواڵتان پێ بدەم کێ قەدەغەیە لە ئاگر؟ یاخود کێ ئاگری لێ قەدەغەیە؟ ئنجا بۆخۆی وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: ئاگری دۆزەخ قەدەغەیە لە هەر کەسێکی نزیکی، ئارامی، نەرمی، ئاسان.

ئەوانە هەموویان ڕەوشتی بەرزو جوانن، (قَرِيب) ئەوەیە کە ئینسان لەخەڵك نزیك بێ و دوور نەبێ، خۆیان لێ دوور نەگرێ مۆن و مرچ نەبێ لەگەڵیان، ڕووخۆش و قسە خۆش و نزیك بێ لێیان، (هَيِّن) واتە: هێدیی و مەندو ئارام بێ[2]، (لَيِّن) نەرم و نیان بێ و زبرو سەخت نەبێ[3]، (سَهْل) ئاسان بێ و قورس و بە زەحمەت نەبێ، ئینسان نەزانێ چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکا؟ وەك بەردی خڕ نەبێ، کەواتە: خاوەنی ئەو سیفەتانە ئەگەر ئاگریان لێ قەدەغە بێ، مانای وایە بەهەشتیین، دیارە کەسێکیش بەهەشتییە کە نەفسی خۆی پاك و چاك کردبێ.

.............................................

(١) {...والصِّيامُ جُنَّة، وإذا كان يوم صوم أحدكم، فلا يَرْفَثْ، وَلا يَصْخَبْ، فَإِن سابَّه أحدٌ أو قاتَلَهُ فَلْيَقُل: إِنِّي صائِم...} أخرجه البخاري برقم: (١٧٩٥)، ومسلم برقم: (١١٥١)، والنسائي برقم: (٢٢١٧)، وابن حبان برقم: (٢٠٥).

(٢) مختار الصحاح، ص ٦٠٣.

(٣) مختار الصحاح، ص ٥٢٧.

٦- كۆتا فەرمووده لەوبارەوه كه بیهێنین، ئەو فەرموودەیه كه پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ) رواه أبو داود برقم: (٤٨٠١) والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٨٠٠٣)، قال الألباني: صحيح.

واته: هیچ شتێك له تەرازووی بەندەی بڕواداردا له ڕۆژی قیامەتدا، له ڕەوشتی جوان و ئاكاری پەسند قورس تر نیه.

دیاره شتێكیش هێنده قورس و گران بێ، دیاره پاداشتی زۆر گەورەیه، كەواته: لێرەدا بۆمان دەردەكەوێ كه مرۆڤ به ئاكارو ڕەوشتی پەسەندو جوان -كه ئەمیش بەبێ خۆ ئەزیەت دان و، بەبێ كار لەسەر خۆكردن بۆ ئینسان دەستەبەر نابێ- بەڵێ بەڕەوشتی پەسندو جوان، نەفسی تەزكیه دەبێ و، بۆ خوا صوڵحاو دەبێ.

## هۆكاری دوازدەیەم: هاوەڵایەتیی كردنی صاڵحان (مصاحبة الأخیار)

هاوەڵایەتیی كردنی صاڵحان و لەخوا نزیكان، هۆكارێكی كاریگەرە بۆ ئەوەی كە ئینسان نەفسی تەزكیە ببێ، عەرەب گوتوویانە: (الرفیق ثم الطریق) پێشێ هاوەڵ، ئنجا ڕێگا، هەروەها گوتوویانە: (الجار ثم الدار) پێشێ دراوسێ، ئنجا خانوو، واتە: بزانە دراوسێكەت كێیە؟ ئنجا خانووەكەت بكڕە، وە بزانە ڕەفیقەكەت كێیە؟ ئنجا ڕێگاكەت بگرە بەر، وە وەك گوتراوە: (المجاورة مؤثرة) واتە: دراوسێیەتیی كاریگەرە، تەنانەت لە كوردەواریی خۆماندا گوتوویانە: (ئەگەر گا لەلای گا ببەسترێتەوە، ئەگەر ڕەنگی نەگرێ خووی دەگرێ)، بەتەئكید ڕەنگی ناگرێ، بەڵام مەبەستیان ئەوە بووە، خووی دەگرێ، بەڵێ نزیكیی لەیەكدی، كاریگەریی هەیە، چ بەباری خراپە، چ بەباری چاكەدا، ئینسان ئەگەر لەگەڵ چاكاندا تێكەڵ بێ، چاكەیان لێ وەردەگرێ، وە ئەگەر لەگەڵ خراپاندا تێكەڵ بێ، خراپەیان لێ وەردەگرێ، زانایانی بواری تەزكیەو تەصەووف، لەو بارەوە هەندێ وێنە دەهێننەوە، شتی خۆش و سوود بەخشن، بۆ وێنە:-

١) تەماشای مانگ بكەن! مانگ بۆخۆی خڕۆكەیە واتە: ڕووناكیی و شۆقی نیە، بەڵام بەهۆی نزیكیی لە خۆرەوە، شوعلەوەر بووە، كەواتە: ئەگەر ئینسان لەگەڵ خەڵكی باش تێكەڵ بێ، بێگومان لێیان بەهرەمەند دەبێ.

٢) هەروەها سەگەكەی هاوەڵانی ئەشكەوت (أصحاب الكهف) خوا سبحانه و تعالى لە قورئاندا ناوی هێناوە، ئەوەش لەبەرەكەتی هاوەڵێتیی كردنی لەگەڵ ئەو حەوت هەشت گەنجەدا كە ئامادە نەبوون، دەست بەرداری دینەكەیان ببن، لەبەرانبەر حوكمڕانی ستەمكاری ڕۆژگاری خۆیانداو، ژیانی چیاو چۆڵیان هەڵبژارد، ئنجا لەبەرەكەتی ڕەفاقەتی ئەو پیاو چاكانەوە، خوا باسی سەگەكەشیانی كردوە.

بەڵێ ئینسان لەگەڵ چاكاندا بەهرەمەند دەبێ و، چاكەیان لێ وەدەست دەهێنێ، وە بە پێچەوانەشەوە: لەگەڵ خراپاندا زەرەرمەند دەبێ و، خراپەیان لێ وەردەگرێ، وەك لە فەرمایشتێكی پێغەمبەری خوادا (صلى الله علیه وسلم) هاتوە:

(إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً، وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً) أخرجه البخاري برقم (٥٢١٤)، ومسلم برقم (٢٦٢٨).

واتە: وێنەی هاوەڵی باش و هاوەڵی خراپ، وەك عەتر فرۆش و كورەچیی (ئاسنگەر) وایە، بابای عەتر فرۆش، یان لێی دەكڕی، یان دەتداتێ، یان بۆنی خۆشت بۆدێ، بەڵام بابای كوورەچیی (ئاسنگەر) ئەگەر جل و بەرگەكانیشت نەسووتێنێ بە پریشكەكانی، بێگومان جاڕس دەبی بەبۆنی ناخۆشی.

## كاریگەریی هاوەڵی كردنی صاڵحان، لەسەر تەزكیەی نەفس، لە قورئانی بەرزو بەپێزدا

بێگومان ئایەتی زۆر هەن لەسەر ئەو بابەتە، بەڵام ئێمە ئاماژە بە هەندێكیان دەكەین:

١- خوا سبحانە و تعالى لە سوورەتی (الكهف)دا لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەر مووسادا، سەلامی خوای لێبێ، كە دەیەوێ بچێ ئەو بەندە صاڵحە ببینێ كە زانیارییەكی پێدراوە، مووسا پێی نەدراوە، دوای ئەوەی كە مووسا بەو پیاوە صاڵحە دەگا، پێی دەفەرموێ:

﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ٦٦ ﴾ الكهف

واتە: مووسا پێی فەرموو: ئایا شوێنت بكەوم، بۆ ئەوەی لەو زانیارییە بەسوودەی كە فێر كراوی شارەزام بكەی؟ یانی: ڕێگا دەدەی ببمە قوتابیی و هاوەڵت؟

پێغەمبەرێكی پایەبەرزی وەك مووسا سەلامی خوای لێبێ كە ئاخاوتنی لەگەڵ خوادا كردوە، وە یەكێكە لەو پێنج پێغەمبەرانەی كە خوای كاربەجێ بەیەكەوە ناوی هێناون: (نووح، ئیبڕاهیم، مووسا، عیسا، موحەممەد) (علیهم الصلاة والسلام) كەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەیە ببێتە قوتابیی كەسێك كە زانیارییەكی پێ دراوە، ئەو پێی نەدراوە، بۆ ئەوەی لێوەی فێربێ!، كەواتە: ڕەفاقەتی صاڵحان بێگومان هۆكارێكی گرنگە بۆ ئەوەی ئینسان لەخوا نزیك ببێتەوە، وە بۆ ئەوەی نەفسی پاك و چاك بێ.

٢- هەر لەسووڕەتی (الكهف)دا خوا سبحانه و تعالی بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ٢٨﴾

واتە: نەفسی خۆت ڕابگرەو حەپسی بكە لەگەڵ ئەوانەدا كە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، وەڕووی خوایان دەوێ (واتە: ڕەزامەندیی خوایان دەوێ و دەیانەوێ بە دیداری خوا شاد ببن و خوا ببینن لە قیامەتدا)، وە چاوتیان لەسەر لامەدەو هەمیشە چاوت لەسەریان بێ و ئاگات لێیان بێ و نیزیكیان بە، وە بەقسەی كەسێك مەكە كە دڵیمان بێ ئاگا كردوە لەیادی خۆمان، وەحیسابی ڕۆیشتووەو كاری كراوە.

واتە: لەگەڵ ئەو بۆخوا صوڵحاوانەدا بە، تەنانەت پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم)، خوا فەرمانی پێدەكا لەگەڵ ئەو كەسانەدا بێ كە بەیانیان و ئێواران (واتە: بەدرێژایی شەوو ڕۆژ) لە یادی خوادان، زانایان دەڵێن: نەك تەنیا بەیانیان و ئێواران، بەڵكو مەبەستی ئەوەیە كە شەوو ڕۆژ لەیادی خوادان و لەخوا دەپاڕێنەوەو، بەندایەتیی بۆ خوا ئەنجام دەدەن.

٣- خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلْفَضْلُ مِنَ ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ النساء

خوا سبحانه و تعالى لە سیاقی چەند ئایەتێکدا کە باسی هەڵوێستی ئیمانداران دەکا، وە باسی هەڵوێستی مونافیق و دڵ نەخۆشەکان دەکا، لە بواری جەنگ و جیهادو ڕۆژانی سەخت و دژواردا دەفەرموێ: وە هەرکەسێ فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکا، ئەوە لەگەڵ کەسانێکدایە (واتە: لەقیامەت لەگەڵیاندایە) کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردوون، ئەوانیش: پێغەمبەران و صدیقان و شەهیدان و چاکانن، وە ئەوانەش باشترین هاوەڵن، ئەوەش بەخششێکە لەخواوە (کە ئەو جۆرە ڕەفاقەتە بە نسیبی ئینسان بکا)، وە خوا زانیاریی تەواوو بەسە. کە ئایا کێ شایستەی ئەوەیە بیکاتە هاوەڵ و ئەو چوار جۆرە بەندە هەڵبژاردانەی خۆی؟).

لەم دوو ئایەتە موبارەکەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە هاوەڵایەتیی کردنی صاڵحان - کە دیارە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، لە هەموو کەس صاڵح تر بوون، پاشان صدیقان و شەهیدان و صاڵحان - هاوەڵایەتیی کردنی ئەوانە، نیعمەت و بەخششێکی گەورەی خوایە، وە خوای زاناش ئەوە ئەمە بەهەموو کەس نابەخشێ.

هەروەها ئەوەشیان لێوەردەگیرێ کە ئینسان بەچی دەبێتە هاوەڵ و هاوڕێی صاڵحان؟، بە فەرمانبەریی کردنی خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چونکە دەفەرموێ:

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴾،

واتە وە هەرکەس فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکات (واتە: پابەند بێ بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم))، ئەوە لەگەڵ ئەوانەدا

دەبێ كە خوا چاكەی لەگەڵدا كردوون، بۆیەش گوتمان هاوڕێیەتیی كردنی صاڵحان، ئینسان بەرەو تەزكیەی نەفس و بەرەو پاكیی و چاكیی و بۆ خوا صوڵحاویی دەبا، چونكە بێگومان خوا پێداوان ئەوانەن كە خوا لەخۆی نزیكی خستوونەتەوە، خوای كاربەجێش كەسانێك لەخۆی نزیك دەخاتەوە، كە پاك و چاك بن، ڕاست و ساغ بن، كەواتە: ئەگەر لەوانەوە نزیك بی، وەك وانت لێدێ، بەهەمان شێوەی ئەوان نەفست پاك و چاك دەبێ.

## گرنگیی هاوڕێیەتیی كردنی صاڵحان، لەسەر تەزكیەی نەفس، لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)

١- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(لَا تُصَاحِبْ إِلا مُؤْمِنًا وَلَا يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلَّا تَقِيٌّ) أخرجه ابن المبارك برقم (٣٦٤)، والطيالسي برقم (٢٢١٣)، وأحمد برقم (١١٣٥٥)، والدارمي برقم (٢٠٥٧)، وأبو داود برقم (٤٨٣٢)، والترمذي برقم (٢٣٩٥) وقال: حسن، وأبو يعلى برقم (١٣١٥)، وابن حبان برقم (٥٥٤)، والحاكم برقم (٧١٦٩) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٩٣٨٢) قال الألباني: حسن، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن

واتە: هاوڕێیەتی ئیماندار نەبێ مەكە، وە با پارێزكاریش نەبێ نانت نەخوا، واتە: ئەوەندە لەگەڵی تێكەڵ مەبە بچیە ماڵی و بێتە ماڵت، مادام ئەهلی تەقوا نەبێ، چونكە بابای گوناهكار بێتە ماڵت و بچیە ماڵی، لە ئەنجامدا تووشی حەڕام خۆریی دەبی.

٢- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ) أخرجه أبو داود برقم (٤٨٣٣)، والترمذي برقم (٢٣٧٨) وقال: حسن غريب، قال الشيخ الألباني: حسن.

واتە: پیاو لەسەر ئایین و بەرنامەی خۆشەویستەکەی[1] خۆیەتی، بۆیە با هەریەکێ لە ئێوە باش سەرنج بداو ورد بێتەوە بزانێ لەگەڵ کێ دۆستایەتیی و نزیکیی پەیدا دەکا؟ یانی: هەرکام لە ئێوە لە قیامەتدا لەسەر دینی خۆشەویستەکەی خۆیەتی، بۆیە هەر کام لە ئێوە با لەدنیادا باش ورد بێتەوە، بزانێ هاوڕێیەتی و نیزیکی کێ دەکا؟ واتایەکی دیکەشی ئەوەیە: لە مرۆڤ لەدنیادا کێی خۆش بوێ، لەسەر دین و ڕێبازی ئەوە، لەبەر ئەوە چاك ورد بەوە بزانە: ئەو کەسەی تۆ خۆشت دەوێ، کێیە؟ چونکە لەسەرەنجامدا پەلکێش دەکرێی بۆ خوو خدەو بەرنامەی ئەو کەسانەی کە خۆشت دەوێن.

٣- هەر لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە:

(قيل للنبيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرَّجُلُ يُحِبُّ الْقَوْمَ وَلَمَّا يَلْحَقْ بِهِمْ؟ قَالَ: الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ) أخرجه ابن أبي شيبة برقم (٣٧٥٦١)، وأحمد برقم (١٢٠٣٢)، والبخاري برقم (٥٨١٩)، ومسلم برقم (٢٦٣٩)، وأبو داود برقم (٥١٢٧)، والترمذي برقم (٢٣٨٥) وقال: صحيح، وأخرجه أيضًا: عبد بن حميد برقم (١٢٦٥)، وأبو يعلى برقم (٢٨٨٨)، وابن حبان برقم (١٠٥)، والطبراني في الأوسط برقم (٧٤٦٥) ، وفي الصغير برقم (١٥٤).

واتە: پرسیار لە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) کرا: جاری وایە پیاوێك کۆمەڵێکی خۆش دەوێن، بەڵام نەگەیشتۆتە ئەوان و بەوان نەگەیشتووە (واتە لەڕووی کردەوەی باشەوە، خۆی وەك ئەوان نابینێ)، ئایا ئەو پیاوە حاڵەتەکەی چۆنەو یاخود سەرەنجامی چۆنە؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئینسان لەگەڵ کەسێکدایە کە خۆشی ویستوە)، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە خۆشەویستیی ئینسان بۆ کەسێك، وای لێدەکا لە قیامەتیشدا لەگەڵ ئەودا بێ، چونکە لە ژیانیدا هەوڵ دەدا، چاو لەو بکا.

(١) وەك جاری دیکەش گوتوومانە: کۆڕەکە کۆڕی پیاوان بووە، ئەگەرنا فەرمایشتەکە ئافرەتانیش دەگرێتەوە.

٤- هەر لەو بارەوە ئەم فەرموودە قودسییەش هەیە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە خوای پەروەردگارەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

(قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ وَالْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ وَالْمُتَبَاذِلِينَ فِيَّ) أخرجه أحمد برقم (٢٢٠٨٣)، والطبراني برقم (١٥٠)، والحاكم برقم (٧٣١٤)، وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٨٩٩٢)، وأخرجه أيضا: مالك برقم (١٧١١)، وعبد بن حميد برقم (١٢٥)، وابن حبان برقم (٥٧٥)، والقضاعي برقم (١٤٤٩)، قال المنذري (٢٤٨/٣): رواه مالك بإسناد صحيح، قال الشيخ شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

واتە: خوای زاڵی كاربەجێ فەرموویەتی: (خۆشەویستیی من پێویست بووە بۆ كەسانێك كە لە پێناوی مندا یەكدییان خۆش دەوێ، وە لەپێناوی مندا سەردانی یەكدی دەكەن، وە لە پێناوی مندا لەگەڵ یەكدی دادەنیشن، وە لە پێناو مندا چاوپۆشیی لەیەكدی دەكەن).

## قسەیەكی نەستەقی (إبن عطاء الله السكندري):

ئیبنو عەتائوڵڵای سكەندەریی كە عاریفێكی بەرجەستەو دیار بووە، پەندو قسەی نەستەقی زۆر جوانی هەن لەبواری تەزكیەی نەفسدا، لە نامیلكەیەكدا بەناوی (الحكم العطائية)، كە چەند شەرحێكیشی لەسەر كراون، یەكێ لەوانە: (إيقاظ الهمم في شرح الحكم) هی (إبن عجيبة)یە، (إبن عطاء الله) لە یەكێ لە حیكمەتەكانیدا دەربارەی گرنگیی ڕەفاقەتی ئینسانی چاك، یان خراپ، دەڵێ:

(لا تَصْحَبْ مَنْ لا يُنْهِضُكَ حالُهُ، وَلا يَدُلُّكَ عَلى اللهِ مَقالُهُ، رُبَّما كُنْتَ مُسيئاً، فَأَرَاكَ الإِحْسانَ مِنْكَ صُحْبَتَكَ إِلى مَن هُوَ أَسْوَأُ حالاً مِنْكَ)(١).

واتە: هاوەڵێتیی كەسێ مەكە كە حاڵەكەی تۆ هەڵناستێنێ و هانت نادات و بەرەو پێشت نابا، وە قسەكەی تۆ بەرەو خوا ناباو ڕێنماییت ناكا، چونكە دەگونجێ خۆت خراپەكار بی، بەڵام هاوەڵێتیی كردنی كەسێك كە حاڵی لەتۆ خراپترە، وات لێبكا، حاڵە خراپەكەی خۆت بەچاك ببینی!.

---

(١) إيقاظ الهمم في شرح الحكم- ص٤٦٣.

وەك دەڵێ: (لەچاو شلان پەیتە) یانی: تۆ كاتێ هاوەڵێتیی ئینسانی لەخۆت خراپتر دەكەی، با بۆخۆشت خراپ بی، بەڵام خۆت چاك دێتە بەرچاو، لەچاو ئەو، بۆیە واباشە هاوەڵێتیی ئینسانی باش بكەی، بۆ ئەوەی ئەگەر خۆت باشیش بی، خۆت بەخراپ بێتە بەرچاو، ئەمەش وات لێدەكا، بەردەوام باشتر بی.

هەروەها دەڵێ:

(إذا أَرَدْتَ أَنْ تَعْرِفَ قَدْرَكَ عِنْدَهُ فَانْظُرْ فِيما ذا يُقِيمُكَ)

واتە: ئەگەر ویستت قەدرو پایەی خۆت لای خوا بزانی، سەرنج بدە: بزانە لەچیدا تۆ بەكار دەهێنێ!، تۆ قیمەتت لەلای خوا بایی ئەوەندەیە كە پێیەوە سەرقاڵی، منیش هەر لەژێر ڕۆشنایی ئەوەدا گوتوومە: (إذا أَرَدْتَ أَنْ تَعْرِفَ قَدْرَكَ عِنْدَهُ فَانْظُرْ مع من يُقِيمُكَ!)، ئەگەر دەتەوێ بزانی لەلای خوا چۆنی؟ بزانە تۆی كردوە بە ڕەفیقی كێ، لەگەڵ كێدا هاودەم و هاوڕازی؟.

# هۆكاری سێزدەیەم: كەم خۆراكیی و، كەم خەویی، كەم دوێیی و، كەم تێكەڵیی

زۆربەی هەرە زۆری شارەزایانی بواری تەزكیەی نەفس، پێیان وایە كە لەگەڵ خۆدا تێكۆشان (مجاهدة النفس) چوار پایەی سەرەكیی هەن، كە بریتین لە:

١- كەم خۆراكیی (الجوع).

٢- كەم خەویی (السهر).

٣- كەم دوێیی (الصمت).

٤- كەم تێكەڵیی (العزلة).

ئنجا ئێمە هەریەك لەو پایانە، دەقێكی شەرعییان لەسەر دێنینەوە، دوایی لەچەند خاڵێكدا هەڵوێستی خۆم دەربارەیان دەخەمە ڕوو:

## پایەی یەكەم: برسێتیی (الجوع):

دەبارەی برسێتی كە پایەیەكی گرنگە لە پایەكانی لەگەڵ خۆدا تێكۆشان، وە یەكێكە لە پێویستییەكانی تەزكیەی نەفس، دەتوانرێ ئەو فەرمایشەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەری بەبەڵگە بهێنرێتەوە، كە دەفەرموێ:

(مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ، بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لَا مَحَالَةَ، فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ، وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ) أخرجه ابن المبارك برقم (٦٠٣)، وأحمد برقم (١٧٢٢٥)، والترمذي برقم (٢٣٨٠)، وقال: حسن صحيح، وابن ماجة برقم (٣٣٤٩)، وإبن سعد (٤٠٩/١)، والطبراني برقم (٦٤٤)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥٦٥٠)، والحاكم برقم (٧٩٤٥) وقال: صحيح الإسناد، وأخرجه أيضًا: النسائي برقم (٦٧٦٨)، وابن حبان برقم (٥٢٣٦) ، والديلمي برقم (٦٢١٠)، قال شعيب الأرنؤوط: رجاله ثقات غير أن يحيى بن جابر الطائي تكلموا في سماعه من المقدام، فإن صح سماعه منه فالحديث صحيح وإلاّ فمنقطع، قال الشيخ الألباني: صحيح.

واتە: ئادەمزاد هیچ زەرفێك (تووڕەكەیەك)ی پڕ نەكردوە، خراپتر لە گەدە، ئادەمزاد چەند پارووێك كە پشتی ڕابگرن، بەسنی، ئەگەر هەر نەیتوانی (واتە: تاقەتی بەخۆی نەشكا بۆ خواردنی كەم) با سێیەكی گەدەی بۆ خواردن بێ و، سێیەكی بۆ خواردنەوەی بێ و سێیەكیشی بۆ هەناسەی بێ.

ئنجا من لێرە پەندێكم هێناوە، دەڵێم: (ئەوەندە بخۆ هەڵتگرێ، ئەوەندە مەخۆ هەڵیگری)، وە دەڵێم: (ئەوەندە بخۆ كە پێویستیت پێیەتی، ئەوەندە مەخۆ كە كەیفت لێیەتی)، ئەو دیاردەی قەڵەوییەی كە ئێمە دەیبینن، ئەو ورگنیی (البطنة)یە نەخۆشیی ئەم سەردەمەیە، وە من لە ڕاپۆرتێكدا لە (BBC) گوێم لێبوو دەیگوت: (٥/٤)ی ئەو نەخۆشییانەی كە خەڵك پێیان دەمرێ، هۆكارەكەیان بریتیە لە قەڵەویی و زۆر خۆریی، هەر بۆیەش خوا سبحانه و تعالی دەفەرموێ:

﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ الأعراف

بخۆن و بخۆنەوە، بەڵام زێدەڕۆیی مەكەن، چونكە خوا زێدەڕۆیانی خۆش ناوێ.

## پایەی دووەم: شەونخوونیی (السَّهَر):

بۆ بێداریی و كەم خەوی خوایی، پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ ﴾ المزمل

واتە: ئەو نوێژەی كە بەشەوێ پێ دەگات و بەشەوێ دەكرێ باشترە، وە قسەكەشی (قورئان خوێندنەكەشی) باشترە، باشتر لەسەر دەم دێ، دەنگە دەنگ و ژاوە ژاو نیە.

هەر لەو بارەوە دەتوانرێ ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەبەڵگە بهێنرێتەوە:

(قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الدُّعَاءِ أَسْمَعُ؟ قَالَ: (جَوْفَ اللَّيْلِ الْآخِرِ، وَدُبُرَ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ) أخرجه الترمذي برقم (٣٤٩٩) وقال: حسن، والنسائي في الكبرى برقم (٩٩٣٦)، قال الشيخ الألباني: حسن.

واتە: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) كامە دوعا باشتر گیرا دەبێ؟ فەرمووی: {لەقوولایی شەوێداو، دوای نوێژە فەرزەكان (ئەو دوعایانەی لە كۆتایی تەحییاتدا دەخوێنرێن}.

## پایەی سێیەم: كەم دوێیی (الصَّمْت):

دەربارەی كەم دوێیی، یاخود بێدەنگیی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ) أخرجه أحمد برقم (١٦٤١٧)، والبخاري برقم (٥٦٧٣)، ومسلم برقم (٤٨)، وأبو داود برقم (٣٧٤٨)، والترمذي برقم (١٩٦٧) وقال: حسن صحيح، وابن ماجة برقم (٣٦٧٢)، وابن حبان برقم (٥٠٦)، وأخرجه أيضًا: الطيالسي برقم (٢٣٤٧)، وأبو يعلى برقم (٦٢١٨).

واتە: هەركەسێ بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی چاك بكا، ئەگەرنا بێدەنگ بێ.
بۆیەش وەك پەندێكیش گوتراوە: (ئەگەر قسەكردن زیو بێ، بێدەنگیی زێڕە).

## پایەی چوارەم: كەم تێكەڵیی (العُزلَة):

پایەی چوارەم بریتیە لە كەم تێكەڵیی یاخود گۆشەگیریی، لە سوورەتی (مريم) دا خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا ﴿٤٨﴾﴾

واتە: (ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ فەرمووی): لەوەی كە ئێوە لەجیاتی پەروەردگارم دەیپەرستن، من گۆشەگیر دەبم و لێتان دوور دەكەومەوە، ئومێدم وایە كە من بەدبەخت نەبم، بە پاڕانەوەی پەروەردگارم (بەبەندایەتیی پەروەردگارم بەختەوەر بم) نەك وەك ئێوە ڕۆژ ڕەش بم.

## چەند تێبینییەك دەربارەی ئەو چوار پایە:

من پێشتریش دەربارەی ئەو پایانە دواوم بەتایبەت لە كتێبی (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)دا، بەڵام ئەوەی ئێستا دەیڵێم، دەربارەی ئەو چوار پایە سەرەكییەی لەگەڵ خۆدا تێكۆشان، كە زانایانی بواری تەزكیەی نەفس دایان ناون، چەند تێبینییەكم هەن:

### تێبینی یەكەم:

هیچ كام لەو چوار پایە ناگونجێ بە ڕەهایی (مطلق)ی باش بێ، بۆ وێنە: ناگونجێ بەردەوام هەر برسی بی، چونكە ئەگەر هەر برسی بی، جەستەت پەكی دەكەوێ، بەڵكو پێویستە مەرجدار بكرێ بە ئەندازەیەك برسێتیی كە زیان بە جەستەو عەقڵ و ئەركە شەرعییەكان نەگەیەنێ، واتە: ئینسان بەلای برسێتییدا بێ، نەك تێریی، لە فەرموودەدا هاتوە كە جارێك كابرایەك قرپی هاتەوە، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش پێی فەرموو: (قرپ هێنانەوەی خۆتمان لێ دوور بكەوە)[1]، دیارە كە گەدە پڕ بوو ئنجا قرپ دێتەوە، كە پڕ دەبێ تەنگ بە هەناسە هەڵدەچنێ، بۆیە قرپ هاتنەوە شتێكی ناپەسندە.

بەڵێ نابێ لێرەدا بگوترێ: هەر كام لەم چوارە بە ڕەهایی پەسندو چاكە، بەڵكو دەبێ بگوترێ: برسێتییەك زەرەر بەبەدەن و عەقڵ نەگەیەنێ، وە بێدەنگییەك پەكی گوتنی قسەی هەق نەخا، وە كەم خەوییەك تەندروستییت تێك نەدا، وە كەم تێكەڵییەك پەكی ئەركە شەرعییەكانت نەخا.

---

(١) {كُفَّ عَنَّا جُشَاءَكَ}. الجُشاءُ: صوتٌ مع ريحٍ يَحْصُلُ من الفَمِ عند حصولِ الشَّبَعِ، المصباح المنير للفيومي، ص٥٧، أخرجه ترمذي برقم ٢٤٧٨ و، ابن ماجه برقم ٣٣٥٠.

## تێبینی دووەم:

مسوڵمان دەتوانێ وەك قۆناغێك لە قۆناغەكانی لەگەڵ خۆدا تێكۆشان، خۆی لەسەر ئەو چوارە ڕابێنێ، بەڵام بە لەسەر بەردەوام بوونیان، زەرەر بە عەقڵ و جەستەی خۆی دەگەیەنێ و، پەكی دەكەوێ و، ناتوانێ ئەركە شەرعییەكانی جێبەجێ بكا.

## تێبینی سێیەم:

بێگومان بیرۆكەی گۆشەگیریی ڕاهیبە نەصرانییەكان و هیندۆسەكان و، هەندێ لە گەلانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، كاریگەریی هەبووە لەسەر هەندێ لە پەیڕەوانی ڕێبازەكانی تەصەووف، كە لەبواری گۆشەگیرییدا زێدەڕۆیی بكەن، زێدەڕۆییەك كە لەگەڵ شەریعەتدا ناگونجێ، وە زیانیش دەگەیەنێ بە عەقڵ و جەستە، وە زیان دەگەیەنێ بە ژیانی دنیاش، دنیایەك كە خوای بەرزو مەزن ئێمەی تێدا تاقی دەكاتەوە، كە دەبێ بایی ئەوەندەی: بە جەستەیەكی ساغ و، عەقڵێكی سەلیم و، ڕووحێكی شاد تێیدا بین و، بتوانین سەر زەوی خوا ئاوەدان بكەینەوە، وە بتوانین دادگەریی بچەسپێنین و، دژی زوڵم و زۆرداریی بینەوە، دەبێ بایی ئەوەندە، خەم لە جەستەمان بخۆین، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە كە دەفەرموێ:

(فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا) أخرجه أحمد برقم (٦٨٦٧)، والبخاري برقم (١١٠٢)، ومسلم برقم (١١٥٩)، والنسائي في الكبرى برقم (٢٩٢٣).

واتە: بێگومان مافی جەستەت لەسەرت هەیە. بۆیە دەبێ هەقی جەستەش بدرێ، وە زێدەڕۆیی كردن لە هەقی ڕووحدا، لەسەر حیسابی جەستە، بێگومان شەریعەت پێی ڕازی نیە، بەڵام هەندێ لە زێدەڕۆییكارانی تەصەووف، تووشی زێدەڕۆیی بوون، كە ئەوەش: (ماڵی قەڵب و سەر بە خاوەنیەتی)، دەبێ هەر شەریعەت پێوەرو تەرازوو بێ، بۆ هەڵسەنگاندنی هەر قسەو هەڵس و كەوت و هەڵوێستێك.

## هۆكاری چواردەیەم: هەبوونی سەرپەرشتیارێكی ڕێی ڕاست نیشاندەر (وجود ولي مرشد)

دیارە ئەمەم لەو ئایەتە وەرگرتوە كە خوای تاك و پاك دەفەرموێ:

﴿مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ١٧﴾ الكهف

واتە: هەركەسێ خوا ڕێنمایی بكا، ئەوە ڕێی ڕاست گرتوویە، وە هەركەسێ خوا گومڕای بكات، ئەوە تۆ هیچ ڕێنیشاندەرێكت بۆی چنگ ناكەوێ[1]، دیارە زۆربەی هەرە زۆری پسپۆڕانی تەزكیەی نەفس، ئەگەر نەڵێم هەموویان، باسی ڕێنیشاندەریان كردوە، كە ئەوان ناویان ناوە (الشیخ المرشد) یان (المرشد الكامل) وە بەهۆكارێكی گەورەو گرنگی تەزكیەی نەفسی دادەنێن، بەڵكو هەندێكیان بەمەرجی دادەنێن، واتە: هەر كەسێ ڕێنیشاندەرو مورشیدێكی نەبێ، ئەوە پێیان وایە بەو ئامانجە ناگات كە ڕێبوارانی ڕێگای بەرەو خوا چوون لەبەر چاوی خۆیان گرتوە، كە دەبێ پێی بگەن، كە بریتیە لە ئیمانێكی شهوودیی، یاخود پایەی ئیحسان، وە هەندێكیش لەو بارەوە گوتوویانە: (مَن لَم يَكُن لَهُ شَيْخٌ، فَشَيْخُهُ الشَّيْطان)، واتە: هەركەسێ مامۆستاو ڕێنیشاندەرێكی نەبێ، ئەوە شەیتان دەبێتە مامۆستای!، كە من پێم وایە ئەوە زێدەڕۆییەكی زۆری تێدایەو بەڕاستیی ئەوە مەسەلەیەكی هەستیارە، بۆیە من لەو بارەوە چوار خاڵان دەخەمە ڕوو:

### یەكەم:

بەگشتی ئینسان بۆ هەر بوارێك پێویستیی بە ڕێنمایی و ڕێنیشاندانی كەسانی چاو ساغ دەكا، بۆ هەر بوارێك لە بوارەكان: مرۆڤ ئەگەر نەخۆش بێ، دەچێتە لای پزیشك، وە ئەگەر بیەوێ خانوو بكات دەچێتە لای ئەندازیار،

---

(١) لە بابەتەكانی پێشتردا بە تێرو تەسەلی باسمان كرد كە: خوای دادگەر لەگۆترە كەس هیدایەت ناداو، لەگۆترەش ڕێ لەكەس تێك نادا، دەتوانی بگەڕێیەوە سەری.

وە ئەگەر کێشەیەکی یاسایی هەبێ، دەچێتە لای یاساناسێك، وە ئەگەر بیەوێ کشتوکاڵ، بکا لە کەسانێك دەپرسێ کە جوتیارن، ...هتد، کەواتە: بۆ دینداریی و خوا پەرستییش هەر دەبێ لە شارەزایان بپرسێ، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْـلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ النحل

واتە: لە شارەزایان و زانایان بپرسن ئەگەر نازانن.

دیارە ئەهلی زیکریش هەریەکەیان بەگوێرەی خۆی: لە بواری دینداریدا، ئەوانەی لە دینداریدا شارەزان، ئنجا لەبازنەی دیندارییشدا: لە فیقهدا پرسیار لەکەسانێك بکەی، کە لە فیقە شارەزان، وە بۆ مەسەلەی ئیمان و عەقیدە، پرسیار لە کەسانێك بکەی کە لە ئیمان و عەقیدە شارەزان، وە لە بواری چاك قورئان خوێندندا، لە کەسانێك بپرسی کە لەتەجوید چاك شارەزان، وە لەبواری تەزکیەی نەفسیشدا، دەبێ پرسیار لەو کەسانە بکەی و بەهرەمەند بی لەو کەسانەی کەلەو بوارەدا شارەزان، ئەوە شتێکی ئاشکرایە پێم وانیە کەس لەمەدا مشت و مڕ بکا، ئینسان یان دەبێ بۆخۆی شارەزا بێ، یان دەبێ لەکەسانێك سوود مەند بێ کە شارەزان، لە هەر بوارێك لە بوارەکانی دینداریی و دنیاداریدا.

## دووەم:

بەڵام بێگومان هەموو بنچینەیەك هەڵاواردنی تێدایە، وەك گوتراوە: (لکل قاعدة شواذ)، یان گوتراوە: هەموو گشتییەك، تایبەت کراوە، (ما من عام إلا وقد خُصِّصَ)، یان گوتراوە: هیچ ڕەهایەك نیە، کە بەنددار نەکرابێ، (ما من مطلقٍ إلا وقد قُيِّد)، ئنجا ئەوەش کە ئینسان بۆ ئەوەی ببێتە خاوەن نەفسێکی پاك و لە خوا نزیك ببێتەوە، وە خوا پەرستییەکەی بکاتە خواپەرستییەکی دانستەو ساغ، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە ئیحسان ناوی بردوە، بۆ ئەوە حەتمەن پێویستیی بە ئوستازێك و ڕێ نیشاندەرێك هەیە، دەڵێین: ئەوە بەگشتی وایە، بەڵام مەرجیش نیە ئەمە هەڵاواردنی تێدا نەبێ، واتە: لەوانەیە کەسێك هیچ مورشیدو ڕێنیشاندەرێکی نەبێ، بەڵام خوای گەورە بەهۆی ئەو قورئان و سوننەتەوە بیگەیەنێتە ئەو ئامانجەی لەسەرەوە باسمان کرد، وە هەموو ئەو

قۆناغانە ببڕێ، کە ئەهلی عیرفان و تەزکیەو تەصەووف باسیان کردوون، وە دەگونجێ بەبێ شێخ و موڕشید هەموو ئەو هەقیقەتانەی چنگ بکەون، کە ڕێبوارانی ئەو ڕێیە باسیان دەکەن، چونکە خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾العنكبوت

واتە: بێگومان ئەوانەی لەڕێی ئێمەدا تێدەکۆشن، ڕێبازەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین، وە بێگومان خوا لەگەڵ چاکەکاراندایە، بەڵێ تۆ ئەگەر بتوانی چاك خوا بپەرستی بە ئیخلاصەوە، باش بۆ لای خوا حەرەکەت بکەی، ئەگەر دەستیشت لەکەس گیر نەبێ، کە جاری واهەیە ئەو شوێنەی کە تۆ لێی موڕشیدێکی ڕووحی، شێخێکی کامڵ، کە دوایی سیفەتەکانی باس دەکەم، چنگت ناکەوێ، ئەدی دەبێ خەڵك پەکی بکەوێ؟!

بێگومان خوا پەکی خەڵك ناخات و، ئەگەر بە ئیخلاصەوە بەرەو خوا بجووڵێن، خوای بەبەزەیی دەستیان دەگرێ و بێ ئاکام و بێ مرادیان ناکا، ئنجا ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەڵگەیە بۆ ئەوەی گوتمان کە لەخوای بەرزو مەزنی گێڕاوەتەوەو پێشتریش هێنامان، کە دەفەرموێ: (وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ، حَتَّى أُحِبَّهُ فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ)[1]

خوا دەفەرموێ: وە بەندەی من بەهیچ شتێك خۆشەویستتر لەلام لەوەی لەسەرم پێویست کردوە لەمن نزیك نەکەوتوە، کەواتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئینسان فەرزەکان جێبەجێ دەکا، چ فەرزە عەینییەکان، چ فەرزە کیفائییەکان، وە لەئەنجامی ئەوەدا کە شتە پەسندەکان (کە سوننەتیان پێ دەڵێن) جێبەجێ دەکا، لە خوا نزیك دەبێتەوە، وە وای لێدێ کە چاوو گوێی و دەست و لاقی، لە شیرازەی شەرع ناچنە دەر، وە تەنها لە ڕەزامەندیی خوادا دێن و دەچن.

.................................

(١) رواه البخاري: ٦٥٠٢.

بەڵێ ئەم فەرمایشتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە هەر كەسێ لە شەریعەت شارەزا بێ و، كاری پێ بكا، كافییە بۆی، بەئامانج و مەرامەكانی بگەیەنێ.

هەروەها ئەو ئایەتەش بەهەمان شێوە بەڵگەیە، كە دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾ محمد

واتە: وە ئەوانەی كە هیدایەت دراون، (واتە: ڕێنمایی خوایان وەرگرتوە، قورئان و سوننەتیان وەرگرتون خوا ڕێنماییان بۆ زیاد دەكا، وە تەقواشیان پێ دەبەخشێ. تەقواش بێگومان بەكەسێك دەبەخشرێ، كە نەفسی تەزكیە بووبێ، كەواتە: لە ئەنجامی وەرگرتنی هیدایەتی خوادا، خوا زیاتر هیدایەتی مرۆڤ دەدا، وە سەرەنجام تەقواش بەو كەسە دەبەخشێ كە زیاتر هیدایەتی داوەو، دڵسۆزانە بەرەو خوا هەنگاوی ناوە.

ئنجا دەڵێین: بەڵێ لە ڕاستیدا بوونی شێخی مورشید، ڕێ بۆ ئینسان كورت دەكاتەوە، بەڵام بڵێی: مرۆڤ بەبێ شێخی مورشید ناتوانێ بەڕێدا بڕوا، ئەوە پێچەوانەی ئەو ئایەت و فەرموودانەیە، كە هێنامانن، وە پێچەوانەی عەدالەت و ڕەحمی بێ سنووری خوای پەروەردگاریشە.

## سـێیەم:

بۆیە من پێم وایە لەكاتی نەبوونی (ولي مرشد)ی بەرجەستە لە شێخێكی كامڵ و ئوستازێكی ڕێنیشاندەردا، بۆ بەرەو خواچوون و صاڵح بوون، -كە بێگومان ئەویش بریتیە لە كەسێك كە لە قورئان و سوننەت شارەزایەو، دەتوانێ ئاسانتر بەرەو ڕێی شەریعەتت بەرێ، ئەگەرنا خۆ نابێ بەرەو ڕێی غەیری شەریعەتت بەرێ و، نەفسیشت پێی تەزكیە ببێ! ئەو شێخە ئازایەتیی و هونەرەكەی لەوەدایە، كە لە قورئان و سوننەت شارەزایەو، كاتێكی زۆری سەرف كردوەو تەزكیەی نەفسی خۆی كردوە، دەستی تۆش دەگرێ و، بەئاسانیی دەتباتە سەر ڕێگای شەریعەت- بەڵێ لەكاتێكدا ئەوەت دەستگیر نەبوو، ئەوە وەك گوتمان بەدڵنیایی خوای بەبەزەیی پەكی كەس ناخا، وە قورئان و سوننەت بۆ هەموو

کەس هیدایەتی تێرو تەواویان تێدایە، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە هەندێ لەئەهلی تەصەووف دەیڵێن، کە پێیان وایە: ئینسان لەڕێی وەلییێکی مورشیدەوە نەبێ، یاخود لەڕێی ڕێبازێکی تەصەووفەوە نەبێ، بەئاکام ناگا!! کە لە ڕاستییدا ئەوە وانیە، ڕاستە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بوون، بەڵام شوێنکەوتووان (تابعين) نەمانبیستوە شێخێکی تایبەتیان بووبێ، هەروەها پشت (جیل)ی دوای ئەوانیش بەهەمان شێوە، دوایی پێشەوا سەرمەزهەبەکان، چ (سفيان الثوري)، چ (ليث بن سعد)، چ (سعيد بن مسيب)، چ (أبو جعفر الطبري)، چ (أبو حنيفة)، چ (مالك)، چ (شافعي)، چ (جعفر الصادق)، چ (أحمد)، چ (داود الظاهري)، چ (زيد بن علي)، خوا لەهەموویان ڕازی بێ و پلەو پایەیان بەرز بکاتەوە، ئەو پێشەوایانە، نەبیستراوە شێخیان بووبێ، بەڵکو لە ژیانیاندا ئەوەی دەردەکەوێ خۆیان پێشەوا بوون، بەڵێ سوودیان لە زانایان و پێشەوایانی پێش خۆیان بینیوە، بەڵام لە بواری تەزکیەی نەفس و گەیشتن بە پلەی ئیحساندا، نەبیستراوە پەکیان لەسەر ئەوە کەوتبێ شێخێکیان بووبێ، بۆ ئەوەی قۆناغەکانی تەزکیەی نەفسی لەسەردەست ببڕن، کەواتە: ئەوەی کە دەڵێ: ئینسان پێویستیی بە شێخێك، یا بە مورشیدێك نیەو، قورئان و سوننەت بەسن، ئەوە کورت هێنانە، وە ئەوەش کە دەڵێ: هیچکەس بەبێ شێخ و مورشید بە تەزکیەی نەفس ناگا، ئەوەش تێپەڕاندنە.

ئنجا ئەوانەش کە دەڵێن: مرۆڤ بەبێ شێخی مورشید لە قورئان و سوننەت حاڵی نابێ، ئەوە ڕاستە، بۆ تێگەیشتنی قورئان و سوننەت، یان دەبێ بۆخۆت هەوڵ بدەی شارەزا بی، یان دەبێ لەسەر دەستی زانایەك شارەزابی، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە لە بواری تەزکیەی نەفسدا، حەتمەن پێویستیت بە کەسێك بێ کە لەو بوارەدا پێشت بکەوێ.

بە پێچەوانەشەوە: ئەوانەش کە دەڵێن: مادام قورئان و سوننەت و شەریعەتمان[1] لەبەردەست دایە، پەکمان لەسەر شێخ و وەلی مورشید نەکەوتوە، دەڵێین: ئەوەش وانیە، چونکە: قورئان و سوننەت ئیمان و عەقیدەشیان تێدایە، ئەدی بۆچی لەو

(١) شەریعەت یانی کۆی دەقەکانی قورئان و سوننەت.

بوارەدا دەگەڕێینەوە بۆ زانایان؟، وە بەهەمان شێوە قورئان و سوننەت زانستی قورئان و فەرموودەشیان تێدایە، ئەدی بۆچی لەو بارەوە دەگەڕێینەوە بۆ زانایانی پسپۆڕ لەبواری زانیارییەکانی قورئان و سوننەت؟، وە بەهەمان شێوە قورئان و سوننەت، فیقهو ئوصولّی فیقهیشیان تێدایە، ئەدی بۆچی دەگەڕێینەوە بۆ لای پسپۆڕانی ئەو بوارە؟ وە بەهەمان شێوە هەموو زانستە شەرعییەکانی دیکەش لە هەموو بوارەکاندا.

کەواتە: بەڵێ قورئان و سوننەت ئەوانەیان هەموویان تێدان، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە هەموو کەس بتوانێ خۆی ئەو زانستانە دەربێنێ، بەڵکو ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ لای زانایان و پسپۆڕان، ئەوان ڕێگامان زۆر بۆ کورت دەکەنەوە، چونکە هەموو کەس ناتوانێ زانا بێ و ڕاستەوخۆ شتەکان هەڵبهێنجێ، کەواتە: بۆ هەموو بوارەکانی دینداریی و دنیاداریی پێویستیمان بە ڕێنیشاندەر هەیە، بەڵام بێگومان ئەگەر کەسێکیشت چنگ نەکەوێ ڕێنماییت بکات، ئەوە خوا پەکی کەس ناخات و هاوکاریی دەکات و بێ مرادی ناکا.

## چوارەم:

شێخی کامڵ یان وەلی مورشید، ئەوە نیە هەر کەسێ هەڵسێتەوە، پێی بگوترێ: ئەوە شێخی کامڵە، یان شێخی مورشیدە، یان بگوترێ: ئەوە کەسێکە هەموو قۆناغەکانی تەزکیەی نەفسی بڕیون!، لەو بارەوە پێم خۆشە، ئەو چەند دێڕە شیعرەی ئیبن و لبەننای سەرقوستی بێنم، کە لە کتێبی: (المباحث الأصلية) دا هێناونی، کە (إبن عجيبة) لە پەراوێزی کتێبی: (إيقاظ الهمم في شرح الحكم) دا، شەرحی لەسەر کۆی شیعرەکانی کردوە، (إبن البنا السرقسطي) دەڵێ:

وَإِنَّمَـا القَـوْمُ مُسَـافِرونَ ... لِحَضْرَةِ الحَـقِّ وَظَـاعِـنونَ
فَـافتَقَـروا فـيها إِلـى دَلـيـل ... ذي بَصَرٍ بِالسَّـيْرِ وَالمَقـيـل
قَدْ سَلَكَ الطَّريقَ ثُـمَّ عَـادَ ... لِيُخْبِرَ القَـوْمَ بِـما اسْتَفـادَ
وَجـابَ مِنْها الوَهْـدَ وَالآكامَ ... وَراضَ مِنْـها الرَّحْلَ والزُّغاما

وَجالَ فِيها رائِحاً وَغادِيا ... وَسارَ كُلَّ فَدْفَدٍ وَوادِيا
وَعَلِمَ المَخوفَ وَالمأْمونا ... وَعرفَ الأَنْهارَ وَالعُيونَا
قَدْ قَطَعَ البَيْداءَ وَالمَفاوِزَ ... وَارْتادَ كُلَّ حابِسٍ وَحاجِز
وَحَلّ في مَنازِلِ المَناهِلِ ... وَكُلَّ شِرْبٍ كانَ فيه ناهِلٌ
فَعِنْدَما قامَ بِهَذا الخَطْبِ ... قالوا جَميعا: أَنْتَ شَيْخُ الرَّكْبِ(١)

دەڵێ: (وَإِنَّما القَوْمُ مُسافِرونَ) لێرەدا كۆمەڵ (القَوْمُ) مەبەستی ڕێبوارانی ڕێی صالْح بوون و بەرەو خوا چوونە، ئەوانەی دەیانەوێ بەرەو خوا بچن و لەخوا نزیك ببنەوە، دەیانەوێ بە خواپەرستییەكی سادە ئیكتیفا نەكەن و دیندارێكی ڕاست و ساغتر بن و بگەنە مەقامی ئیحسان، ئەوانە ڕێبوارن بەرەو نیزیكیی حەق دەچن، بەرەو نیزیكیی خوای پەروەردگار دەچن، ئنجا لەهەندێ شوێندا بارگەو بنە دەخەن و پشوو دەدەن.

ئیدی لەو سەفەری صالْح بوون و بەرەو خوا چوونەیاندا، پێویستییان بەڕێ نیشاندەرو دەلیلێك هەیە، كەشارەزا بێ و بەرچاو ڕوون بێ، كە لەكوێ بڕۆن، وە لەكوێ بارگەو بنە بخەن و پشوو بدەن، چونكە ئینسان ناتوانێ بەردەوام هەر بڕوا، دەبێ جار جار پشوو بدا، ئنجا دێتە سەر وەسفی ئەو كەسەی كە شایستەی ئەوەیە پێش خەڵك بكەوێ و، ببێتە ئوستازو ڕێ نیشاندەریان، بەچەند شتێك وەسفی دەكا:

١- ئەو كەسە كەسێكە ڕێگایەكەی بڕیوە دوایی گەڕاوەتەوە، هەتا دوا مەنزڵ چووە، دوایی گەڕاوەتەوە، بۆ ئەوەی هەواڵ بدا بەو كۆمەڵەی كە دەیەوێ پێشیان بكەوێ، وە دەیانەوێ پێش خۆیانی بدەن، هەواڵیان پێدەدا، بۆ ئەوەی ئەو بەهرەیەی وەری گرتوە، ئەوانیش بەهرەمەند بكا، چونكە كەسێ بۆ خۆی بەڕێیەكدا نەڕۆیشتبێ، چۆن دەتوانێ پێش خەڵكی بكەوێ و بڵێ وەرن بەو ڕێیەتاندا دەبەم؟ دەبینی دوایی سەری بەبن بەستێك و بە هەڵدێرێك دەگا، یان

(١) إبن البنا السرقسطي- المباحث الأصلية على حاشية إيقاظ الهمم- ص ١٤٢- ١٥٨.

سەری بەدوژمنێك دەگا، كە ڕێگایان پێ دەگرێ و ڕێگایان لێ دەبڕێ.

٢- دەبێ كەسێك بێ كە هەموو تەپۆلكەو نزماییەكانی ڕاو كردبێ و پێیاندا ڕۆیشتبێ چ ئەوەی كە لمە، چ ئەوەی كە گڵ و خۆڵی لێیە، واتە: جوان بەو ڕێیەدا ڕۆییبێ و پشكنیبێ.

٣- بەیانیان و ئێواران پێیدا چووبێ و هاتبێ، وە هەموو چیاو دۆڵەكانی بینیبێ و بڕیبێ.

٤- ئەوەندە بەو ڕێیەدا ڕۆیشتبێ، بزانێ: كوێ شوێنی مەترسییە؟ وە كوێ شوێنی دڵنیاییە؟

٥- ئەوەندە شارەزا بێ، بزانێ: لەكوێ ڕووباری لێ هەن، بۆ ئەوەی لێیان بپەڕنەوە، وە لەكوێش سەرچاوەو كانی لێ هەن، بۆ ئەوەی لێیان بخۆنەوە.

٦- هەموو بیابانەكان و ئەو چۆڵەوانیانەی بڕیبێ كە ئاویان لێ نیە.

٧- دەبێ جوان شوێنەكانی ڕاو كردبن، كە لەكوێ لەمپەرێك و نێوانێكی لێیە، ڕێگا لە ڕۆیشتنەكەیان دەگرێ؟!.

٨- وە دەبێ لە هەموو ئەو مەنزڵگایانەدا كە ئاویان تێدا هەیە، بارگەو بنەی خستبێ و، وە ئاوی لێ خواردبنەوەو بزانێ تامی چۆنە.

ئنجا كاتێ بەهەموو ئەو كارانە هەستابێ و هەموو ئەو شارەزاییانەی هەبن، نەك هەر شارەزای تیۆریی (نظري) بەڵكو بە كردەوە ئەو قۆناغانەی بڕیبن، ئنجا ئەوانی لەگەڵنی پێی دەڵێن: تۆ شێخ و ڕێنیشاندەرو شارەزای ئەو كاروانەی و بەپێشمان بكەوە.

ئنجا لێرەوەش دەڵێم: بەداخەوە لەم ڕۆژگارەدا زۆر لە ڕێبازەكانی تەصەووف بوون بە شتی میراتیی، زۆر نیزیكە كەسی یەكەم و دامەزرێنەری ڕێبازەكە كەسێكی باش بووبێ، پشك و بەشی هەبووبێ لە ئوستازێتیی ئیرشادو تەزكیەی نەفسدا، بەڵام دوای وی كاڵ بۆتەوەو دواتریش كاڵتر بۆتەوە، دوایی دەبینی كەسانێك لەشوێنیان دانیشتوون، كە ڕەنگە مەرجەكانی مسوڵمانێكی ئاساییشیان تێدا نەبن و، تەنانەت پێنج پایەكانی ئیسلامیش بەچاكی جێبەجێ نەكەن!، كە من

پێم وایە ئەوە ستەمێکە لە ئەصڵی تەزکیەی نەفس و لە ڕێبازەکانی تەزکیەی نەفس دەکرێ، وە زوڵمێکیشە لەو پێشەواو گەورانە دەکرێ، چونکە هەر کەسێ ئەوانە ببینێ کە لەشوێنیان دانیشتوون، وا دەزانێ ئەوانی پێشێش هەر وابوون کە بێگومان ڕێبازەکان (الطرق) زانای زۆر گەورەیان تێدا بوون، بەڵام ئێستا کەسانێکی ناشاییستە لەشوێنیان دانیشتوون، هەڵبەتە ناڵێم: هەموویان چونکە ئینسانی چاکیش لەنێو ئەواندا هەر هەیە، وە ڕەنگە کەسی وایان هەبێ، پشك و بەشی چاکیشی هەبێ لەو شتانەدا کە بەمەرج گیران و بۆ شێخی کامڵ، بەڵام کەسانێکیان هەن زۆر کەم تفاق و ڕووت و ڕەجاڵن لەو شتانە، ئنجا کەسێك کە ئەوانە دەبینێ و پێشووەکان و باب و باپیرانیان لەسەر ئەوان قیاس دەکا، بەد بین دەبێ بەرانبەر بەوانەی پێشێش، واتە: ئەو جۆرە کەسانە کە بەبێ شایستەیی و لیاقەت و توانایی، لەشوێنی ئەو پێشەوایانە دادەنیشن، ئەوە لەڕاستیدا خەڵك بەهۆی ڕەفتارو کرداری ئەوانەی ئێستاوە، ئەوانەی پێشێشی لەبەرچاو دەکەون! ئنجا بێگومان ئێمە لەهەموو بوارەکانی دیکەی زانستیشدا هەر وا دەڵێین: مەرج نیە ڕۆڵەی پزیشك، پزیشك بێ، ڕۆڵەی یاسا ناسێك، یەکسەر یاساناس بێ، بەڵکو دەبێ بچێ بخوێنێ، وەك بابی، مەرج نیە کوڕە جوتیارێك بتوانێ وەك بابی جوتیاریی بکا، وە هەروەها، بەهەمان شێوەش کوڕە مەلایەك، کوڕە شێخێك (شێخ بەو مانایەی ئوستازو ڕێنیشاندەر بێ) مەرج نیە وەك بابی مەلا یان شێخ بێ، بەڵکو دەبێ وەك بابی بخوێنێ و شارەزا بێ! کە ئێستا قەزیەکە لادراوەو وەك گوتم: ئەوە پێویستیی بەڕاستکردنەوە هەیە، وە بەداخەوە بەرژەوەندیی دنیایی و ماددییش دەوری زۆرە لەوەدا، هەروەها نەزانیی خەڵکیش و بە لاسایی کردنەوەو عاتیفی بیر کردنەوەو، کوێرانە بەدوا کەوتنیان، دیسان دەوری زۆرەو کاریگەریی لەو بوارەدا بووە، کۆتایی ئەو مەسەلەیەش بەو دوو دێڕە شیعرە دێنم، کە هی (شریشی)یە کە یەکێکە لە زانایان و شارەزایانی بواری تەصەووف، دەڵێ:

وَلِلشَّــيْخِ آياتٌ إذا لَمْ تَكُنْ لَهُ ... فَمَا هُوَ إلاّ في لَيالِي الهَوى يَسْري

إِذا لَمْ يَكُن عِلْمٌ لَدَيْهِ بِظاهِرٍ ... وَلا باطِنٌ فاضْرِب بِهِ لُجَجَ البَحْرِ[١]

---

(١) إيقاظ الهمم في شرح الحكم- ص ١٥٨.

دەڵێ: شێخ چەند نیشانەو مەرجێكی هەن، ئەگەر ئەو نیشانەو مەرجانەی تێدا نەبوون، ئەوا هەر بە شەوگارەكانی ئارەزوودا دەڕوا، (واتە: هەر بەتاریكە شەوێ، بەدوای ئارەزووی خۆی كەوتوە)، ئنجا مەرجەكانی دەخاتە ڕوو:

ئەگەر زانیاریی بە ڕواڵەت (علم الظاهر) {یانی: ڕواڵەتی شەریعەت}ی، لەلا نەبوو، هەروەها زانیاری بەپەنهان (علم الباطن) {یانی: ماناو مەبەستە مەعنەوییە قووڵەكانی قوڕئان و سوننەت}ی لەلا نەبوو، ئەوە بەشەپۆلی دەریایدا بدە.

واتە: ئەوە شێخ نیەو هیچ دەورێك نابینێ، مەبەستی لە (علم بالظاهر) و (علم بالباطن)، واتە: دەبێ لە ڕواڵەتی شەریعەت شارەزابێ و پێیدا قووڵ بێتەوە، هەندێ لە ئەهلی تەصەووف ئەو زاراوە بەهەڵە بەكاردێنن، دەڵێن: شەریعەت ئاشكرا (ظاهر)ە، بەڵام تەصەووف پەنهان (باطن)ە، بەڵام ئەوە وانیە، چونكە شەریعەت زاهیرێشی هەیەو باتینیشی هەیە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ﴿٧﴾ ﴾ آل عمران،

واتە: ئەوانەی بەزانیارییدا قووڵ بوونەتەوە، شەریعەتە زاهیرەكە، باتینەكەشی هەر لەنێودایە، وە نەبێ لەڕێگای غەیری شەریعەتەوە، بتوانین ئەو زانیارییە پەنهانە وەدەست بخەین، وەك ئەوەی بەداخەوە هەندێ لە ئەهلی تەصەووف وایان گوتوە.

# هۆكاری پازدەیەم: پاكسازیی و چاكسازیی كردن لە كۆمەڵگادا

ئەوە كە ئینسان لەبەردەم كۆمەڵگاكەی خۆیدا، كاتێ كە لە ئیسلام دوور دەكەوێتەوەو لە قورئان دوور دەكەوێتەوە، دەستەو ئەژنۆ دانەنیشێ، بەڵكو قۆڵی لێ هەڵماڵێ و مشوور بخوا لە كۆمەڵگاكەی، بژاری بكا لە ناشەرعییەكان و، بیڕازێنێتەوە بە شتە باشەكان، ئەوە لەڕاستیدا هۆكارێكی گەورەو گرنگی دیكەی نەفس تەزكیە بوون و بەرەو خوا چوون و صاڵح بوونە، لەبەر ئەوەی ئینسان لە میانەی كاركردن و بژاركردنی كۆمەڵگادا لە ناشەرعییەكان، وە چاكسازیی تێدا كردن و ڕازاندنەوەی بە سیفەتە بەرزو پەسندەكان، ئینسان لە میانەی ئەوەدا تووشی دەیان كۆسپ و لەمپەرو سەرئێشەو گرفتاریی دێ، ئەوانەش هەموویان دەبنە هۆی ئەوە كە ئینسان پەی بە عەیب و كەم و كوڕییەكانی خۆی بەرێ، وە وا دەكا مرۆڤ عەیبەكانی خۆی ببینێ و، نەخۆشییەكانی خۆی بزانێ، پاشان بەهۆی ئەوانەوە گوناهی لێ دەبێتەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلَا وَصَبٍ وَلَا هَمٍّ وَلَا حُزْنٍ وَلَا أَذًى وَلَا غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ) أخرجه أحمد برقم (٨٠١٤)، وعبد بن حميد برقم (٩٦١)، والبخاري برقم (٥٣١٨) ومسلم برقم (٢٥٧٣).

واتە: ئینسانی مسوڵمان هەر ماندوویێتیی و گرفتاریی و ئازارو خەم و خەفەتێكی بێتە ڕێ، تەنانەت دڕكێكی لە پێ ڕابچێ، خوا بەهۆی ئەوەوە لە گوناهەكانی دەسڕێتەوە، ئنجا مادام گوناهەكانی سڕانەوە كەواتە: نەفسی بەرەو پاكیی و چاكیی دەچێ و پاداشتی بۆ دەنووسرێ و زیاتر پەی بە هەڵەو پەڵەو كەم و كوڕییەكانی خۆی دەبا، لەئەنجامی تێكگیرانی لەگەڵ خەڵكداو لەئەنجامی ئەو كێشەو گرفتانەدا كە بۆی دێنە پێش، وە ئەوەش وای لێدەكا: چاو بەخۆیدا بگێڕێتەوەو، هەمیشە ئاگای لەخۆی بێ، وە خۆی بڕازێنێتەوە بە سیفەتە بەرزو چاكەكان.

ئەبو حامیدی غەززالیی ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەو بارەوە قسەیەكی جوانی هەیە، دەڵێ: ئەگەر كەسێك كوان (دوومەڵ)ی لێ هاتبن، بەڵام بۆخۆی هەستیان پێ نەكا، ئەو كاتە هەستیان پێ دەكا، كە خۆی لە كەسێ خشاند، شانی بەشانی كەسێ كەوت، شتێكی بەر كەوت، لەو كاتەدا هەست بەوە دەكا كە ئەو شوێنەی برینە، یاخود كوان و دوومەڵە، ئینسان زۆر جار عەیب و كەم و كوڕیی هەیەو هەست بەخۆی ناكا، هەتا لەگەڵ خەڵك تێكنەگیرێ.

قسەكەی زۆر جوانە: ئایا ئینسان كەی بۆی دەردەكەوێ، ئازایە یان ترسنۆكە؟ لەو كاتەدا كە بكەوێتە نێو ترسەوە، بكەوێتە شوێنێكی ترسناكەوە.

ئەدی كەی بۆی دەردەكەوێ، كە بەخشندەیە، یاخود چرووكە؟ ئەو كاتەی كە ماڵ و سامانێكی هەبێ، وە داوای لێبكرێ بیبەخشێ، ئەو كاتە بۆی دەردەكەوێ كە سەخییە یان چرووكە.

ئەدی ئینسان كەی بۆی دەردەكەوێ، دڵ نەرمە یا دڵ ڕەقە؟ دەبێ هەڵوێستێكی بێتە پێش، پێویستی بە بەزەیی نواندن بێ، ئایا ئینسان كەی بۆی دەردەكەوێ، دادگەرە یاخود ستەمكارە؟ دەبێ هەڵوێستێكی بێتە پێش پێویستی بە دادگەریی نواندن بێ، هەروەها هەموو سیفەتەكانی دیكەش، كەواتە: ئینسان لە میانەی كاركردنی لەنێو كۆمەڵگادا، بۆ ئەوەی ئەو كۆمەڵگایە بەرەو شەریعەت بێنێتەوەو لەخوایان نزیك بخاتەوە، لەمیانەی ئەوەدا هەست بەكەم و كوڕییەكانی خۆی دەكا، ئەوەش دەبێتە هۆی لەخوا نزیك بوونەوەی.

ئنجا بێگومان شێوازەكانی چاكسازیی و پاكسازیی تێدا كردنی كۆمەڵگا زۆرن، ئێمە ناتوانین هەموویان باس بكەین، بەڵام دەتوانین بڵێین گرنگترینیان ئەمانەن:

## ١- بانگەواز (الدعوة):

دەربارەی بانگەواز خوا سبحانە و تعالى دەفەرموێ:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ ﴿١٢٥﴾ ﴾ النحل.

كەواتە: ئێمە بانگەواز كردنمان لەسەر پێویستە، هەروەها خوا سبحانە و تعالی لەسەر مسوڵمانانی فەرز كردوە كە دەبێ كۆمەڵێكیان تێدا هەبن خەڵكی بانگ بكەن بۆ چاكە، كە هەموو خێرو چاكەیەك لە بەرنامەی خوا دایە، دەفەرموێ:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ آل عمران،

واتە: با لەنێو ئێوەدا كۆمەڵێك هەبن خەڵك بانگ بكەن بۆ چاكە، یاخود ئێوە كۆمەڵێك بن بانگەواز بكەن بۆ چاكە...

## ٢- پەروەردەو فێركردن (التربیة والتعلیم):

خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ التوبة

واتە: نابێ ئیمانداران هەموویان بڕۆن بۆ جەنگ و جیهاد، بەڵكو دەبێ لەهەر كۆمەڵێك دەستەیەكیان بچن، بۆ ئەوەی لەدیندا شارەزا بن، وە دوایی خەڵكەكەیان وریا بكەنەوە وشیار بكەنەوە، ئەو شارەزاییەی وەریان گرتوە پێیان بگەیەنن، بۆ ئەوەی ئەوانیش وریایی خۆیان وەربگرن و تووشی ناشەرعیی و هەڵەو پەڵەو لادان نەبن، كەواتە: ئەوەش فەرزە كە مسوڵمانان ئەركی پەروەردەو فێركردن لەنێو خۆیاندا ئەنجام بدەن.

## ٣- فەرمان بە شتە پەسندەكان و، ڕێگریی لە شتە ناپەسندەكان (الأمر بالمعروف والنهی عن المنكر):

خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ آل عمران

واتە: با لە نێو ئێوەدا كۆمەڵێ هەبن (یاخود ئێوە كۆمەڵێكن) بانگەواز دەكەن بۆ چاكەو، فەرمان بە شتە پەسندەكان دەكەن و، ڕێ لە شتە ناپەسندەكان دەگرن و، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

## ٤- كۆچ كردن لە پێناوی خوادا، هەركات پێویستی كرد (الهجرة).

وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢١٨﴾ ﴾ البقرة

## ٥- تێكۆشان لە پێناوی خوادا (الجهاد في سبيل الله):

دەربارەی كۆچ كردن و تێكۆشان لە پێناوی خوادا، خوا سبحانە و تعالى دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢١٨﴾ ﴾ البقرة

واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە، وە ئەوانەی كۆچیان كردووە، تێكۆشاون لەپێناوی خوادا، ئا ئەوانە بە ئومێدی بەزەیی خوان، وە خوا لێبوردەی میهرەبانە.

هەروەها خوا سبحانە و تعالى لەسووڕەتی (المائدة)دا لەوەسفی ئەوانەدا كە دوای ئەوەی خەڵك لەدین هەڵدەگەڕێتەوە، دەیانهێنێ و دینیان پێ دەبووژێنێتەوە فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ ﴾ المائدة

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هەر كام لە ئێوە لە ئایینەكەی پاشگەز بێتەوە، خوا كۆمەڵێك دێنێ: خۆشی دەوێن و خۆشیان دەوێ، لەگەڵ ئیمانداراندا میهرەبانن، لەسەر كافران زبرو بەدەمارن، لەڕێی خوادا تێدەكۆشن (فیداكاریی دەكەن) وە لە لۆمەی لۆمەكاران ناترسن.. كەواتە: ئەوانە هەموویان پێویستن بۆ ئەوەی كۆمەڵگای خۆمان پاك و چاك بكەین، وە لە میانەی ئەوەدا خۆشمان پاك و چاك بكەین، بۆیە ئەوانەی پێیان وایە: دەتوانن تەزكیەی نەفسی خۆیان بكەن و، لەماڵی خۆیان دابنیشن و، تێكەڵی هیچ شتێ نەبن، ئەوە پێچەوانەی بەرنامەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، وە پێچەوانەی ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەكان و هاوەڵان و پێشەوایانی ئێمەیە خوا لێیان ڕازی بێ، كە هەرگیز لە كۆمەڵگای خۆیان ڕانەماون و، هەرگیز لە بەرانبەر خێرو شەڕی كۆمەڵگای خۆیاندا بێ هەڵوێست نەبوون، بەڵكو قۆڵیان لێ هەڵماڵیوەو هەوڵیان داوە: خۆیان و كۆمەڵگاكەیان پاك و چاك بكەن و، وابكەن كە جێگای ڕەزامەندیی و پەسندیی خوای پەروەردگار بێ.

هەڵبەتە دەگونجێ زۆر شتی دیكەش باس بكرێن، كە هەموویان دەچنەوە نێو ئەو پێنجانەی ڕابردن، بەتایبەت ئەركی مەزن و گشتگیری: فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند.



# ١٢ دۆستانی خوا کێن؟

دیاره له ئه‌نجامی ئه‌وه‌دا که خوا یارمه‌تی مرۆڤ ده‌دا خۆی پاك بكا، واته: خۆی بژار بكا له خه‌سڵه‌ته نزم و په‌سته‌كان، وه خۆی چاك بكا واته: خۆی بڕازێنێته‌وه به سیفه‌ته به‌رزو په‌سنده‌كان، ئنجا وه‌ك پێشتریش گوتمان خراپترین و نزمترین سیفه‌ت به نسبه‌ت نێوان خوای مه‌زن و به‌نده‌وه بریتیه له: كوفرو شیرك، وه به‌نسبه‌ت نێوان به‌نده‌كان خۆیان بریتیه له: جه‌ورو سته‌م، هه‌روه‌ك باشترین و په‌سندترین سیفه‌ت له‌نێوان خواو به‌نده‌كانیدا، بریتیه له: ئیمان هێنان و خوا به‌یه‌كگرتن (توحید)و ته‌نیا خوا په‌رستن، وه باشترین و په‌سندترین سیفه‌ت له‌نێوان به‌نده‌كان خۆیاندا، بریتیه له: دادگه‌ریی، ئنجا له ئه‌نجامی ئه‌وه‌دا كه ئینسان پاك و چاك ده‌بێ، له‌خوا نزیك ده‌بێته‌وه، وه سه‌ره‌نجام شایسته‌ی ئه‌وه ده‌بێ كه ببێته دۆستی خوا، چونكه دۆستی خوا یانی: كه‌سێك كه له خوا نزیكه، وشه‌ی (وَلِيَ) له ئه‌صڵی زمانی عه‌ڕه‌بیدا یانی: (قَرُبَ)[1]، كه‌واته: (وه‌لیی) ئه‌و كه‌سه‌یه كه له خوا نزیكه، (وَلي، يَلِي، ولْياً) واته: (قَرُبَ، يَقرُبُ، قُرْباً)، ئنجا (ولي) به‌هه‌ركه‌سێ ده‌گوترێ، كه له كه‌سێ یان له شتێ نیزیك بێ، (وَليُّ الله) كه‌سێكه له خوا نزیك بێ و دۆستی خوا بێ.

ئنجا ئایا ئینسان به‌چی له خوا نزیك ده‌بێته‌وه‌و ده‌بێته دۆستی خوا؟ ئێمه تیشك ده‌خه‌ینه سه‌ر ئه‌م مه‌سه‌له‌یه، وه دواییش باسی ئه‌و شته ده‌كه‌ین كه هه‌میشه كاتێ باسی دۆستانی خوا ده‌كرێ، ئه‌و شته‌ش باس ده‌كرێ، كه بریتیه له كه‌ڕامه‌ت.

.................................................

(١) مختار الصحاح، ص٦٣١.

كەڕامەتیش: بریتیە لە: (ڕێزگرتنی خوا لە بەندەكەی)، لە ئەصڵدا ئەوە واتاكەیەتی، با لە مێشك و زەینی خەڵكدا واتای دیكەشی هەبن، وەك دوایی باسی دەكەین.

ئنجا سەرەتا با بزانین دۆستانی خوا كێن؟ وە مرۆڤ بەچی دەبێتە دۆست و نزیك و خۆشەویستی خوا سبحانە و تعالی؟

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (یونس) لە ئایەتەكانی (٦٢-٦٤)دا زۆر باش تیشكمان بۆ دەخاتە سەر دۆستەكانی خۆی و پێناسەیان دەكا كە كێن؟ وە بەچی بوونەتە دۆستی خواو سیفەتەكانیان چین؟ دەفەرموێ:

﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾ يونس

وشەی (ألا) لەزمانی عەرەبیدا بۆ ئاگادار كردنەوەیە، واتە: ئاگادار بن بێگومان دۆستانی خوا نە ترسیان لەسەرەو نە پەژارەش دادەگرن. ئینسان هەمیشە بە نسبەت داهاتووەوە مەترسیی هەیە: لە ڕزق دەترسێ، لە ژیانی دەترسێ، لە نەخۆشیی و ناخۆشیی دەترسێ، لە گرفتارییەكان دەترسێ، وە بەنسبەت ڕابردووەوە كە تازە چووە، ئینسان مەترسیی نیە، بەڵام خەمی لێدەخواو دڵتەنگی دێتە سەر، ئنجا خوا سبحانە و تعالی دۆستەكانی خۆی بەوە پێناسە دەكا كە نەبۆ ڕابردوو خەم و پەژارەیان هەیە، نە بۆ داهاتووش مەترسییان هەیە، چونكە ئەوەی پەرێزی پاكە، بەرچاوی ڕووناكە، ئەوەی كە ژیانەكەی بە پاكیی گوزەراندوە، بە فەرمانبەریی خواوە، خەم بۆ ڕابردوو داناگرێ، ڕابردوو تازە پێچراوەتەوە، بەو كردەوە باشانەوە كە ئینسان ئەنجامی داون، یان بە كردەوە خراپەكانەوەو تازە لەدەست چووە، چاكەت تێدا كردبێ، خراپەت تێدا كردبێ، تازە ڕۆیشتووە.

بە نسبەت داهاتووشەوە: دۆستانی خوا بۆیە مەترسییان نیە بۆ داهاتوو چونكە یەقینیان هەیە بەوە كە خوا دۆستیانە، نەك هەر گومانی چاك (حسن

الظن) یان هەیە، بەڵكو دڵنیایی باش (حسن الیقین)یشیان هەیە، چونكە مرۆڤ هەركات خوای خۆی ناسی، هەمیشە بەخوای خۆی پشت ئەستوور دەبێ، لێی دڵنیایە وە پێی دڵخۆشە، وە دەزانێ خوای بەخشندە لەگەڵیەتی و سەرپەرشتیی دەكاو ئاگای لێیەتی، لە سۆنگەی ئەوەوە ئینسانی ئیماندار بەنسبەت داهاتووشەوە، ترسی نیە، واتە: ئەو ترسەی نیە كە خەڵكی دیكە هەیەتی، ئەگەرنا ئەویش ترسی ڕۆژی دوایی هەیە، ترسی سزاو پاداشتی هەیە، ترسی هەیە لە لێپرسینەوەو دادگەریی خوا، ترسی هەیە لە گوناهو تاوانەكانی خۆی، بەڵام ئەو شتانەی خەڵك لێیان دەترسێ، ئەو جۆرە ترسانەی نین، هەروەك ئەگەر لە ڕابردووشدا چاكەیەكی لەدەست چووبێ، خەمی بۆ دادەگرێ، بەڵام ئەو خەمەی خەڵك دایدەگرێ، ئەو دایناگرێ، بەزۆرییش وایە، ئەگەر ئینسان خوا تەوفیقی دا بە پاكیی و چاكیی ژیانەكەی هێنا، لەو ڕووەشەوە كە ویستوویەتی خوا لەخۆی تووڕە نەكاو، سەرپێچیی نەكا، غەم و پەژارەی نیە، هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەستەكە ئەوەیە كە: ئەگەر لە ڕابردوودا بەرژەوەندییەكی دنیاییان لەدەست چووبێ، ئەو خەمەیان نیە كە خەڵك هەیەتی، واتە: ئەگەر ترسیان هەبێ، جۆرە ترسێكی دیكەیە، وە ئەگەر خەمیش بخۆن، جۆرە خەمێكی دیكەیە، ئەوە یەكێكی دیكە بوو لە واتایەكانی ئایەتەكە، كە دەگونجێ بەو شێوەیەش لێك بدرێتەوە.

ئنجا ئایا ئەوانە سیفەتیان چۆنەو بەچی بوونەتە دۆستی خوا؟ دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾

ئەوانەی كە ئیمانیان هێناوە، بەهەموو ئەو شتانەی پێوستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، وە عادەتیان وابوو پارێزیان دەكرد، واتە: بە وریایی و هۆشیارییەوە ژیاون و لە خۆیان وریا بوون و، هەوڵیان داوە شتێ نەكەن كە خوا پێی ناخۆش بێ، خوای دادگەریش دوو شتی بۆ بەندەكانی پێ ناخۆشن:

١- ئەو شتانەی كە پێویستی كردوون، بیانچوێنێ.

٢- وە ئەو شتانەی كە قەدەغەی كردوون، بیانشكێنێ.

خوای کاربەجێ هەر کام لە فەرز چواندن و، قەدەغە شکاندنی، بۆ بەندەکانی پێ ناخۆشن، ئەوانیش خۆیان پاراستوە لەوەی فەرزەکانی بچوێنن، وە قەدەغەکان بشکێنن، کە ئەمە ماناو نێوەڕۆکی پارێزکاریی (تقوی)یە، چونکە (راغب الأصفهاني) بە:(حِفْظُ النَّفْسِ عَمَّا يُؤْثِم) پێناسەی کردوە[1].

## ئەو جۆرە کەسە خۆ پارێزانە، خوای بەخشەر چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکا؟

خوا دەفەرموێ:

﴿ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٤﴾ ﴾

واتە: ئەوانە موژدەی خۆشییان بۆ هەیە لە ژیانی دنیاداو لە دوا ڕۆژیشدا، لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە کە (بشرى) بە: (الرؤيا الصالحة)[2] خەونی باش لێکدراوەتەوە، کە خەونی باش جێگای دڵ خۆشییە بۆ بەندە لە دنیادا، بۆ ئەوەی دڵی بچەسپێ لەسەر تاعەت، وە دڵنیا بێ لەوەی لەسەر ڕێیەکی ڕاستە. وە بەنسبەت دواڕۆژیشەوە: موژدەی خۆش چوونە بەهەشتەو، ڕەزامەندیی خوایە، کە ڕەزامەندیی خوا، لە بەهەشتیش گەورەترە، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَرِضۡوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ ﴿٧٢﴾ ﴾ التوبة

واتە: وە ڕازیبوونێکی مەزن لە خواوە گەورەترە. ئنجا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

........................................

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٨٨١.

(٢) رواه أبن جرير عن عبادة بن الصامت جامع البيان (١٥/ ١٣٢)، والسيوطي في (الدر المنثور) ج٣ ص٣١١.

﴿لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ (كلمات الله) یانی: وشەكانی خوا، {واتە: بڕیارەكانی خوا} گۆڕانكارییان بەسەردا نایەت، خوا سبحانه و تعالى ئەو بڕیارانەی كە داونی، هیچ كەس ناتوانیٚ بیانگۆڕیٚ، ئا ئەوەش سەركەوتنی مەزنە، واتە: سەركەوتنی مەزن ئەوەیە كە ئینسان شایستەی ئەوەبیٚ خوا لەدنیاو دوارۆژدا دڵخۆشی بكا، خوا بە لوتف و كەرەمی خۆی لەو كەسانەمان بگێڕیٚ.

ئنجا لە فەرمایشتێكدا كە پێشتریش هێنامان، خوا سبحانه و تعالى باسی دۆستەكانی خۆی دەكاو پێناسەیان دەكا، وە بۆمان ڕوون دەكاتەوە كە ئینسان بەچی دەبێتە دۆستی خوا؟ فەرموودەكەش فەرموودەیەكی قودسییە:

(إِنَّ اللَّهَ قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ، حَتَّى أُحِبَّهُ فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ)، أخرجه البخاري برقم (٦١٣٧)، وأخرجه أيضًا: ابن حبان برقم (٣٤٧)، والبيهقي برقم (٢٠٧٦٩)، وأبو نعيم في الحلية (٤/١).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە خوای بەرزو مەزن دەگێڕێتەوە دەفەرمویٚ: (خوای بەرز فەرموویەتی: هەركەسێك دژایەتیی دۆستێكی من بكا، ئەوە من ئاگادارم كردۆتەوە كە جەنگەكەی لەگەڵ منەو لەگەڵ من لەحاڵەتی جەنگدایە، وە بەندەی من بە هیچ شتێك لەوانەی لەسەرم فەرز كردوون، خۆشەویستتر لەلام، لەمن نزیك نابێتەوە، {واتە: ئینسان بەهۆی ئەنجام دانی فەرزەكانەوە، لەهەموو شتێك زیاتر لە خوا نزیك دەبێتەوە)، وە بەردەوام بەندەكەم لەمن نزیك دەبێتەوە بەو شتانەی پەسندم كردوون، (واتە: لەسەرم فەرز نەكردوون بەڵكو بەچاكم داناون، كە (مندوبات)و (نوافل)یان پیٚ دەگوتریٚ} بەردەوام لیٚم نزیك دەبێتەوە تاكو خۆشم دەویٚ، (كەواتە: ئینسان بەچی دەبێتە خۆشەویستی خوا؟، پێشیٚ بە ئەنجامدانی فەرزەكان، ئنجا دوایی بەئەنجامدانی شتە پەسندەكان و

سوننەتەکان)، ئنجا ئەگەر خۆشم ویست: دەبمە ئەو بیستنەی پێی دەبیستێ، وە ئەو دیتنەی کە پێی دەبینێ، وە ئەو دەستەی کە شتی پێ دەگرێ، وە ئەو پێیەی کە پێی دەڕوا، وە ئەگەر داوای لێکردم پێی دەبەخشم، وە ئەگەر پەنای پێ هێنام پەنای دەدەم.

دیارە کە دەفەرموێ: هەرشتێکم داوا لێبکا، پێی دەدەم، یانی خوا ئەو شتەی پێدەدا کە بۆخۆی پێی چاکە، وە بۆ ئەو پێی باشە، ئەگەرنا مەرج نیە ئەوەی کە بەندەکە داوای دەکا، خودی ئەو شتەی پێ بدا، چونکە جاری وایە ئینسان داوای شتێ دەکا، ئەگەر خوای بەخشەر پێی بدا، زەرەر بەو ئینسانە دەگا، جاری وایە ئینسان داوای مردن بۆخۆی دەکا!، جاری وایە ئینسان لەمنداڵێکی تووڕە دەبێ، دوعای خراپی لێدەکا!، ئنجا ئەگەر خوا بۆی بکا، زەرەری لێدەدا، مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە کە خوا ئەوەی پێدەدا کە بۆی باشە، لەو کاتەدا کە بۆ ئەو چاکە، وەبەو ئەندازەیە کە بۆ ئەو باشە.
هەر لەو بارەوە ئەو فەرموودەیەش هەیە:

(عَنْ رَبِيعَةُ بْنُ كَعْبٍ الْأَسْلَمِيُّ قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَيْتُهُ بِوَضُوئِهِ وَحَاجَتِهِ فَقَالَ لِي: {سَلْ} فَقُلْتُ: أَسْأَلُكَ مُرَافَقَتَكَ فِي الْجَنَّةِ، قَالَ: {أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ؟} قُلْتُ: هُوَ ذَاكَ، قَالَ: {فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ)) أخرجه أحمد برقم (١٦٦٢٨)، ومسلم برقم (٤٨٩)، وأبو داود برقم (١٣٢٠)، والنسائي برقم (١١٣٨).

ئەبی فیڕاس کە ناوی ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمییە، خزمەتی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) کردوەو یەکێ بووە لە هاوەڵانی ئەهلی صوففە، دەڵێ: شەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەمامەوە، ئاوی دەست نوێژو کەل و پەل و پێداویستییەکی هەبا، بۆم دەهێنا، پێی فەرمووم: (داوام لێبکە)، منیش گوتم: داوات لێدەکەم لەبەهەشتێ لەخزمەت تۆبم، فەرمووی: (ئایا هەر ئەوە، غەیری ئەوەم داوا لێناکەی؟) گوتم: نەخێر هەر ئەوە، {واتە: هیچ داواکارییەکی دنیایی نەبوو، تەنیا ئەوەنەبێ لە بەهەشت لە خزمەتی دابێ}، ئەویش فەرمووی: (یارمەتییم بدە لەسەر نەفسی خۆت،

بەزۆر سەجدە بردن)، دیارە سەجدە بردن لەنوێژدایە، واتە: نوێژی چاك بكەو زۆر نوێژان بكە، بۆ ئەوەی شایستەی ئەوەبی كە ببی بە هاوەڵی من، لە بەهەشتدا.

كەواتە: لەو دوو فەرموودانەوە دەزانین كە ئینسان بەچی لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نزیك دەبێتەوە؟ دیارە كەسێ لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نزیك دەبێ، كە دۆستی خوا بێ، وە بەپێ ئایەتەكەو ئەو دوو فەرموودەیە، ئینسان بە ئیمان و تەقواو كردەوە باشەكان و ئەنجامدانی فەرزەكان و، كارە پەسندەكان، لە خوا نزیك دەبێتەوە.



# ١٣ ڕێزلێگرتنی خوا بۆ بەندەكانی (كرامات الأولیاء)

(كرامات) كۆی (كرامة)یە واتە: ڕێزلێگیران، كە لێرەدا مەبەست ئەوەیە: خوا ڕێز لە دۆستانی خۆی دەنێ، ئنجا زانایان زۆر شتیان لەو بارەوە گوتوە، بەڵام ئەوەی كە سەرجەم زانایان لەسەری یەك دەنگن، ئەوەیە كە دۆستانی خوا خاوەنی كەڕامەتن، واتە: خوا ڕێزیان لێدەگرێ، بەڵام ئەوەی لەزەینی زۆربەی خەڵكیدایە، ئەوەیە كە وشەی (كەڕامەت)یان كردوە بە هاوواتا (مرادف) بۆ وشەی: (یاسادڕ) (خارق العادة) بۆ وێنە: ئینسان شتێكی بۆ كەشف بێ، لە ڕێی نائاساییەوە، یاخود ئیلهام و خورپەیەكی بۆ بێ، یاخود ڕزق و ڕۆزییەك لە كاتێكی ناوەختدا پەیدابێ لە شوێنێكدا، كە ئەو شوێنە ئەو شتەی لێ نیە، یان لە كاتێكدا كە ئەو كاتە ئەو جۆرە ڕزق و ڕۆزییە نیە، زۆربەی خەڵك و هەندێ لە ئەهلی عیلمیش، وشەی كەڕامەتیان لەگەڵ ئەو جۆرە شتانە لێك داوە، كە لەڕاستیدا وانیە، بەڵكو بەرزترین كەڕامەت بریتیە لە ڕاوەستاویی لەسەر شەریعەت: (أَفضَلُ الكَرامة الإِستقامَةُ عَلى الشَّريعة)[1]، چونكە كەڕامەت واتە: ڕێزگرتنی خوا لە بەندەكەی، ئنجا كەخوا ڕێز لە بەندەكەی بگرێ، ئەوەیە كە یارمەتی بدا لەسەر شەریعەتی خوا بەردەوام بێ، ئەوە ڕێزی ڕاستەقینەی خوای پەروەردگارە بۆ بەندەكەی، ئەمما شتەكانی دیكە، بەڵێ دەگونجێ دۆستانی خوا شتی نائاساییان لێ ڕووبدا، بەڵام جاری وا هەیە دوژمنانی خواش شتی

(١) ئەمە قسەی (أبو علي الجوزجاني)یە، بڕوانە: مجموع الفتاوى، لابن تيمية، ج١١، ص٣٢٠، ٣٢١.

نائاسایيان لێ ڕوودەدا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كاتێ بۆمان باسی دەججال دەكا، كە ڕووباری پێیە، ئاگری پێیە، دەتوانێ كابرا بكوژێ، پاشان زیندووی بكاتەوە، لەبەر چاوی خەڵك، هەروەها زۆر لە جادوو گەرەكان و زۆر لە مورتازە هیندییەكان، شتی سەیر سەیر ئەنجام دەدەن، بۆیە ئەو شتانە سەنگی مەحەك نین، شتێك كە هەم دۆستانی خواو، هەم دوژمنانی خوا بتوانن ئەنجامی بدەن، ئەوە نابێتە بەڵگەی هەبوونی كەرامەت، بەڵكو گەورەترین و مسۆگەرترین كەرامەت ئەوەیە كە خوا یارمەتی بەندەكەی بدات، پابەند بێ بەشەریعەتەكەیەوە، ئەوە گەورەترین كەرامەتە، ئەگەرنا هەندێ شتیش هەن كە لە چوار چێوەی كەرامەتدا باس كراون و، لە چوارچێوەی كەرامەتدا خۆیان دەبیننەوە، بۆ وێنە:

### كـەشــف :

ئەوەیە كە كەسێ شتێ بزانێ و ببینێ، كەسانی دیكە نەیزانن و نەیبینن، بۆ وێنە: خوای زانا سەبارەت بە مەریەم سەلامی خوای لێبێ، دەفەرموێ:

﴿فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ١٧﴾ مريم

واتە: بێگومان ئێمە ڕووحی خۆمان نارد بۆ لای مەریەم، بۆی چووە سەر شێوەی بەشەرێكی (پیاوێكی) تێرو تەواو، هەتا لە درێژەی ئایەتەكەدا مەریەم دەڵێ: پەنات لێ بەخوا دەگرم كە دەستم بگەیەنیە بە خراپە، ئەویش دەڵێ: من لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتووم، كەواتە: كە مەریەم جبریل دەبینێ، ئەوە حاڵەتێكی كەشفەو خوای تاك و پاك بە مەریەمی داوە، وە دەگونجێ ئەو ئینسانە جند ببینێ، وە دەگونجێ ئینسان هەندێ شتی بۆ دەربكەوێ، وەك ئەوەی شوێنی شتێكی وون بووی بۆ دەربكەوێ، یان ئەو ئافرەتەی كە دوو گیانە بەبێ پشكنین خوا بیخاتە دڵی، كە بزانێ ئەوە كوڕە یان كچە، ئەو شتانە بوون و شتی ئاسایین بۆ دۆستانی خوا.

## خورپە، ئیلهام، خرانە دڵ:

لەو بارەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(إِنَّهُ قَدْ كَانَ فِيمَا مَضَى قَبْلَكُمْ مِنْ الْأُمَمِ مُحَدَّثُونَ، وَإِنَّهُ إِنْ كَانَ فِي أُمَّتِي هَذِهِ مِنْهُمْ، فَإِنَّهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ) أخرجه أحمد برقم (٨٤٤٩)، والبخاري برقم (٣٢٨٢).

واتە: کەسانێك لە ئۆممەتانی پێش ئێوەدا هەبوون کە دوێنراو بوون، {(مُحَدَّثُونَ) واتە: (مُلْهَمون) خورپەیان دەخرایە نێو دڵ، زانیاریی ڕاستیان دەخرایە نێو دڵ بەبێ بیر کردنەوەی خۆیان}، ئنجا ئەگەر لە ئۆممەتی من کەسێ هەبێ، ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە (خوا لێی ڕازی بێ). میصداقی ئەوەش کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی لە ژیانی عومەردا وەك مانگی چواردە دیارە، هەر لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) چەند جار پێشنیاری بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کردوون، دوایی لەسەر پێشنیارەکانی وی خوای پەروەردگار ئایەتی دابەزاندوون، بۆ وێنە:

١- لە تەوافدا بە پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) گوت: ئایا مەقامی ئیبراهیم نەکەینە نوێژگە؟ خوای پەروەردگاریش ئایەتی ناردە خوارو فەرمووی:

﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ ١٢٥﴾ [1] البقرة

واتە: ئەو شوێنەی کە ئیبراهیمی لێ وەستاوە (بۆ بینا کردنی کەعبە) بیکەنە نوێژگە (دوو ڕکات نوێژی لێ بکەن)، هەروەها لە شوێنی دیکەش خوای پەروەردگار ئایەتی ناردە خوار لەسەر پێشنیاری عومەر.

٢- هەروەها دیلەکانی جەنگی بەدر کە عومەر خوا لێی ڕازی بێ گوتی: با قەرەبوویان لێ وەرنەگیرێ، خوای پەروەردگار فەرمووی:

........................................

(١) رواه أحمد والبخاري.

﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ ﴾ الأنفال[1].

٣- هەروەها جارێكی دیكە عومەر خوا لێی ڕازی بێ پێشنیاری كرد، كە نوێژ لەسەر عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەییە نەكا، كەسەری نیفاق بوو لە مەدینەدا[2]، وە چەند حاڵەتی دیكەش هەبوون كە خوای پەنهانزان ئایەتی ناردۆتە خوارو پشتگیریی پێشنیاری عومەری كردوە، كە ئەوەش نیشانەی ئەوەیە عومەر خوا لێی ڕازی بێ، خوربەو ئیلهامی بۆ كراوە، واتە: خوا زانیاری ڕاستی خستۆتە نێو دڵ، بێ ئەوەی لە ڕێگای بیركردنەوەوە بووبێ.

## خـەونی بــاش و ڕاسـت:

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەوە دەفەرموێ:

(لَمْ يَبْقَ مِنْ النُّبُوَّةِ إِلَّا الْمُبَشِّرَاتُ، قَالُوا: وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ) أخرجه البخاري برقم (٦٥٨٩)

واتە: لە پێغەمبەرایەتیی جگە لەدڵ خۆشكەرەكان، هیچ شتی دیكە نەماوە، {واتە: دەرگای وەحی داخراوە، بەڵام دڵخۆشكەرەكان هەن، كە ئەویش دەشوبهێنە وەحییەوە و

.........................................

(١) رواه أحمد في المسند: ٢٠٨ و ٢٢١، ومسلم: ١٣٨٣.
تێبینی: لە تەفسیری سووڕەتی (الأنفال)دا بە درێژی قسەم لەسەر تەفسیری ئەم ئایەتە كردوەو ڕام وایە ئایەتەكە واتاكەی ئەوەیە كە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە دیلان بگرێ تاكو دوژمن لە پەل وپۆ نەخات و، كوشتاری زۆری لێ نەكات، بۆیە من ئەو هۆی هاتنەخوار (سبب النزول)ە، بە گونجاو لەگەڵ واتای ئایەتەكە و، ئایەتی ژمارە (٤)ی سووڕەتی (محمد)دا نابینم:

﴿ ... حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ... ﴾ محمد: ٤

كە تەنیا دوو ڕێیان بۆ مامەڵە لەگەڵ دیلەكانی جەنگدا دیاریی دەكات:
١- بەردانیان بە بەلاش و منەتكردن.
٢- بەردانیان لە بەرانبەر قەرەبوودا.

(٢) رواه البخاري: (٣/١١٠) و (٨/ ٢٥١-٢٥٥)، ومسلم: (١٧/١٢١).

لە جینسی وەحییە، بەڵام بەو وەحییە دانانرێ کە بۆ پێغەمبەران دێ، چونکە ئەو وەحییەی بۆ پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، دێ، جێی دڵنیاییەو پێغەمبەران و خەڵکیش دڵنیان کە ئەوە لەلایەن خوایە، بەڵام ئەوەی لەڕێی دڵخۆشکەرەکانەوە دەبینرێ، هەڵەو کەم و کورِیی تێ دەکەوێ}، ئنجا پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) کرد، گوتیان: دڵخۆشکەرەکان چین؟ فەرمووی: خەونی باشە. هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەکی دوورو درێژدا، کە ئێمە بەشێکی لێ دەهێنین، دەفەرموێ:

(وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنْ النُّبُوَّةِ) أخرجه ابن أبي شيبة برقم (٣٠٤٦٠)، وأحمد برقم (١٢٠٥٦)، والبخاري برقم (٦٥٩٣)، ومسلم برقم (٢٢٦٤)، والترمذي في الشمائل المحمدية برقم (٤١٥).

واتە: خەونی ئیماندار بەشێکە لە چل و شەش (٤٦) بەشی پێغەمبەرایەتیی. ئنجا هەندێ لە زانایان وایان شیکردۆتەوە کە: پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) شەش مانگ پێش پێغەمبەرایەتیی لە ئەشکەوتی (حیراء)دا چۆتە حاڵەتی ڕامان و بیر کردنەوەو خوا پەرستیی، بەپێی ئەو کاتە کە خوای پەروەردگار خستوویەتە دڵی یان زانیویەتی، ئنجا ئەو (٦) مانگە دەکاتە بەشێك لە (٤٦) بەشی (٢٣) ساڵەکەی پێغەمبەرایەتیی، کە (١٣) ساڵی قۆناغی مەککەو (١٠) ساڵی قۆناغی مەدینەیە، ئەوە (٢٣)، شەش مانگیش دەکاتە (٤٦/١)ی ئەو (٢٣) ساڵە، کەواتە: خەونی باشیش یەکێکە لەو شتانەی کە هی ئەو کەسانەیە کە لە خوا نزیکن و دۆستی خوان، هەڵبەتە جاری وایە کافریش خەونی ڕاست دەبینێ، بەڵام کەمە، وە بابای کافر کە خەون دەبینێ، زیاتر بۆ بەرژەوەندییەکی دنیاییە، بەڵام ئەهلی ئیمان ئەو خەونانەی کە دەیانبینن زیاتر دەبێتە هۆی سوود پێ گەیاندنیان و نزیك بوونەوەیان لەخوا، لەبواری دینداریيدا.

## یـاسـا درِ (خوارق العادة):

(خارق العادة) واتە: پێچەوانەی عادەت و باوی خەڵك، بۆ وێنە: مەریەم سەلامی خوای لێبێ، كە خوای پەروەردگار لێی دەگێڕێتەوە، دەفەرمویٚ:

﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾﴾ آل عمران.

واتە: هەركات زەكەریا لێی چووە ژوور میحراب، بژیوێكیی لەلا بینی، گوتی: ئەی مەریەم! ئەمەت لە كویٚ بۆ هات؟ گوتی: ئەوە لەخواوەیە، خوا هەركەسیٚ بیەویٚ بەبیٚ حیساب (واتە: بەبیٚ بۆژماردن) ڕزق و ڕۆزی پیٚ دەدا.

هەروەها ڕێگا بۆ نزیك كرانەوە (طي المسافة)، وە گەلیٚ شتی دیكەی یاسادرِ، دەگونجیٚ بۆ دۆستانی خوا پەیدا بن، بەڵام بێگومان وەك گوتمان: ئەو شتانە هەندێكیان دەگونجیٚ بۆ خەڵكی نا مسوڵمانیش پەیدابن، وەك جادووگەرەكان، مورتازە هیندییەكان و، ئەوانەی كە لایەنی ڕووحیی خۆیان بەهێز دەكەن، هەندیٚ شت لە خۆیاندا پێشان دەدەن، پێچەوانەی باوی خەڵكە، بۆیە ئەوەی كە بەسەنگی مەحەك دادەنریٚ، وە بە مسۆگەریی جێی دڵنیایی و پشت پیٚ بەستنە لەو ڕووەوە: تەنیا پابەندییە بە شەریعەتی خواوە، ئەوە گەورەترین ڕێزگرتنی خوایە سبحانە و تعالی بۆ بەندەی خۆی.



# ١٤ باسێك لەبارەی شەریعەت و تەریقەت و حەقیقەتەوە

هەندێ لە پەیڕەوان و شوێنکەوتووانی تەصەووف، وا ئیددیعا دەکەن کە شەریعەت بۆ خەڵکی عەوامە، واتە: بۆ خەڵکییە بەگشتی، (الشريعة للعوام) وە تەریقەت بۆ خەڵکی تایبەتییە، (الطريقة للخواص) وە حەقیقەت بۆ خەڵکی تایبەتی تایبەتە، (الحقيقة لخواص الخواص). ئنجا ئایا ئەوە چەندی ڕاستە؟ با باسێك لەو بارەوە بکەین: سەرەتاش هەندێ قسەی (ئیبن و عەجیبە) دەهێنم کە لەو بارەوە دەڵێ:

(والأعمال عند أهل الفن على ثلاثة أقسام: عمل الشريعة، وعمل الطريقة، وعمل الحقيقة، أو تقول: عمل الإسلام، وعمل الإيمان، وعمل الإحسان، أو تقول: عمل العبادة، وعمل العبودية، وعمل العبودة، أي الحرية، أو تقول: عمل أهل البداية، وعمل أهل الوسط، وعمل أهل النهاية، فالشريعة: أن تعبده، والطريقة: أن تقصده، والحقيقة: أن تشهده، أو تقول: الشريعة: لإصلاح الظواهر، والطريقة: لإصلاح الضمائر. والحقيقة: لإصلاح السرائر، وإصلاح الجوارح بثلاثة أمور: بالتوبة، والتقوى، والإستقامة، واصلاح القلوب بثلاثة أمور: بالإخلاص، والصدق، والطمأنينة، وإصلاح السرائر بثلاثة أمور: بالمراقبة، والمشاهدة، والمعرفة، أو تقول: إصلاح الظواهر باجتناب النواهي وأمتثال الأوامر، وإصلاح الضمائر بالتخلية من الرذائل والتحلية بأنواع الفضائل، وإصلاح السرائر (وهي هنا الأرواح) بذلها وانكسارها حتى تتهذب وترتاض الأدب والتواضع وحسن الخلق)[١].

................................................

(١) إيقاظ الهمم في شرح الحكم- إبن عجيبة - ص١٠.

سەرەتا من قسەكانی تەرجەمە دەكەم دوایی تێبینی خۆم دەخەمە ڕوو، كە بێگومان قسەكانیم هەموو بەدڵ نیە، دەڵێ: {كردەوەكان لەلای ئەهلی ئەو هونەرە (واتە: هونەری تەزكیەی نەفس و ئەهلی عیرفان و تەصەووف) سێ بەشن: كردەوەی شەریعەت و، كردەوەی تەریقەت و، كردەوەی حەقیقەت، یان دەڵێین: كردەوەی ئیسلام و، كردەوەی ئیمان و، كردەوەی ئیحسان، یان دەڵێین: كردەوەی عیبادەت و، كردەوەی عبوودییەت و، كردەوەی عبوودەت واتە: ئازادیی، یان دەڵێین: كردەوەی ئەوانەی لەسەرەتادان، وە كردەوەی ئەوانەی لە نێوەڕاستدان، وە كردەوەی ئەوانەی گەیشتوونەتە كۆتایی.

ئنجا شەریعەت ئەوەیە كە تەنیا خوا بپەرستی، وە تەریقەت ئەوەیە تەنیا خوات پێ مەبەست بێ، حەقیقەتیش ئەوەیە كە تەنیا خوا ببینی، یان دەڵێین: شەریعەت بۆ چاككردنی ڕواڵەتەكانە واتە: ئەندامە ڕواڵەتییەكان، كە ملكەچی شەریعەت بن، وە تەریقەت بۆ چاككردن و چاكسازیی دەروونە، وە حەقیقەتیش بۆ چاككردنی دڵە، یان ڕووحە.

**وە چاككردنی ئەندامەكان بە سێ شتان دەبێ:**

١- بە گەڕانەوە بۆ لای خوا.

٢- بە پارێزكاریی، بەبەردەوامیی و ڕاوەستاویی.

**وە چاككردنی دڵیش بە سێ شتان دەبێ:**

١- بە تەنیا خوا پێ مەبەست بوون.

٢- بە ڕاستیی.

٣- بە ئارامیی.

**وە چاككردنی سەرائیر كە مەبەستی پێ ڕووحە، بە سێ شتان دەبێ:**

١- بە چاودێریی.

٢-بە بینین.

٣- بە ناسین.

یان دەڵێین: چاككردنی ڕواڵەت بەوە دەبێ، كە خۆ لەقەدەغەكان بپارێزی.

فەرمانەكان جێبەجێ بكەی، وە چاككردنی دەروون بە بژاركردن لە سیفەتە نزمەكان دەبێ، وە ڕازێنرانەوە بە جۆرەكانی سیفەتە پەسندەكان دەبێ، وە چاككردنی ڕووحەكان بەوە دەبێ، كە لەبەرانبەر خوادا مل كەچ بێ و شەرم دایبگرێ، هەتا تەواو پاك دەبێتەوە، وە هەتا بەئەدەب و خۆ بەكەم گرتن و ڕەوشتی جوانەوە ڕادێ}.

دیارە لەوانەیە بە شێوەیەك لە شێوەكانی تەئویل، بگونجێ ئەو قسانە ئاڕاستە بكرێن، بەڵام ئەوەی كە من بەڕاستی دەزانم دەربارەی ئەو سێ وشەیە، ئەوەیە كە:

خوای بێ هاوەڵ یەك شتی ناردوە كە بریتیە لە شەریعەت، ئەو شەریعەتەش لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، چونكە خوا تەنها باسی شەریعەتی بۆ كردووین، وەك دەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية

دوای ئەوەی باسی ئەهلی كیتاب دەكا دەفەرموێ: (ئەی موحەممەد!) دوایی تۆمان لەسەر بەرنامەیەك دانا شوێنی بكەوە، وە شوێنی ئارەزووی ئەوانە مەكەوە كە نازانن، واتە: ئێمە یەك شتمان هەیە، كە بریتیە لە شەریعەت، ئەدی ئەهلی تەزكیەو عیرفان، ئەو تەریقەت و حەقیقەتەیان لەكوێ هێناوە؟!

تاكە شتێ كە بگونجێ ئەو دوو وشەیەی پێ ئاڕاستە بكرێ ئەوەیە بڵێین: ئیسلام تەنیا یەك شتە، كە شەریعەتە، وە ئێمە سێ شتمان نین، شەریعەت بۆ هەندێكیان و، تەریقەت بۆ هەندێكیان و، حەقیقەت بۆ هەندێكیان، بەڵكو تەنها یەك شتمان هەیە، ئەوەش كە ئیبن و عەجیبە دەڵێ: ئەهلی ئیسلام و، ئەهلی ئیمان و، ئەهلی ئیحسان، ئەوەش وا نیە، چونكە: ئەوەی كە ئیمانداره، دەبێ پایەكانی ئیسلام جێبەجێ بكا، وە دەبێ هەوڵیش بدا لەكاتی خوا پەرستنیدا، وا بزانێ كە خوا دەبینێ، یاخود بەلای كەمەوە دەبێ پێی وابێ، كە خوا دەیبینێ. كەواتە مسوڵمان دەبێ هەوڵ بدا بەشی لە هەمووواندا هەبێ (ئیمان و ئیسلام و ئیحسان) هەریەكەو بە ئەندازەی خۆی كەواتە: ئێمە بەس شەریعەتمان هەیە،

ئەدی تەریقەت چییە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە: ئەو شێوازەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شەریعەتی پێ پیادە کردوە، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسی خۆیدا، ئا ئەوە ڕێبازێکی دیاری کراوە کە ڕێبازی پێغەمبەرە (طريقة النبي)ە، وەك لە (کتێبی ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)دا گوتومە کە: لە ڕاستیدا هەرچی ڕێبازەکانی تەصەووفن، شوێن کەوتووەکانیان خۆیان ناویان لێناون: قادریی و چەشتیی و کوبرەویی و بەدەویی و نەقشیی و ڕیفاعیی و سیمنانیی و...هتد، ئەگەرنا لە ئەصڵدا تەریقەت تەنها ڕێبازی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێ: (عليكم بسنتي) ڕێباز هەر ڕێبازی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) خەلیفە ڕاشیدەکانیش، هەر لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوون، بۆیەش ڕاشیدو سەر ڕاست بوون، دوایی کە لادان کراوە لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەبواری حوکم و سیاسەتدا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناوی لێناوە: (ملك عضوض) واتە: حوکمڕانییەك کە بەددان دەگیرێ، یاخود ناوی ناوە: (ملك جبري) واتە: حوکمڕانی خۆ فەرز کردن، ئەمما ئەوەی کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووە، لە ئیمان و عەقیدەو حوکم و سیاسەت و عیبادەت و ئەخلاق و لەهەموو بوارەکاندا، ئەوە ڕێباز هەر ڕێبازی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، ئنجا ئەو ڕێبازە کە ڕێبازی پێغەمبەر (طريقة النبي)ە (صلى الله عليه وسلم) هەرکات ئەو ڕێبازەت جێبەجێ کرد، ئەوە دەتگەیەنەتە کۆمەڵێك حەقیقەت، کە حەقیقەتەکان هەر لەنێو شەریعەت دان، وەك چۆن ڕێبازی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) هەر لەنێو شەریعەت دایە، هەر شەریعەت فەرمان بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کردوە: بەو شێوەیە بەندایەتیی بکە، وە هەر شەریعەت هەواڵمان پێ دەدا، کە ئەگەر بەو شێوە تایبەتەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شەریعەتی پێ پیادە کردوە، تۆش پیادەت کرد، دەتگەیەنێتە کۆمەڵێ حەقیقەت: حەقیقەتی ئیمان و تەوحید، حەقیقەتی تەقوا، حەقیقەتی صەبرو شوکرو، حەقیقەتی ئیحسان و هەموو ئەو حەقیقەتانەی دیکە، کە ئەهلی تەزکیە باسیان دەکەن، وە زانایان و بۆ خوا صوڵحاوان ئەو حەقیقەتانەیان تێدا بەرجەستە بوون.

بەڵێ هیچ شتێ لەدەرەوەی شەریعەت، بۆ دینداریی و لەخوا نیزیك كەوتنەوە سوود بە ئینسان ناگەیەنێ، ئەگەرنا خوای كاربەجێ دەیخستە نێو شەریعەتەوە، بۆیەش دەفەرموێ:

﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة

واتە: ئەمڕۆ بەرنامەكەتانم بۆ تەواو كردن، وە چاكەی خۆم بەتەواویی لەگەڵدا كردن، وە ئیسلامم بەبەرنامە بۆ پەسند كردن. كەواتە: ئایین و شەریعەتی خوای پەروەردگار تەواوە، وەك پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(يا أيها الناس! إني قد تَرَكْتُ فِيكُمْ ما إن اعتصمتم به فَلَنْ تَضِلُّوا أبداً: كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ) أخرجه البيهقي برقم (٢٠١٢٣)، وأخرجه أيضًا: الحاكم برقم (٣١٨)، قال الألباني: صحيح.

واتە: ئەی خەڵكینە! شتێكم بۆ بەجێهێشتوون، كە ئەگەر دەستی پێوە بگرن، هەرگیز لەدوای من ڕێتان لێ تێك ناچێ: كتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەكەی، دیارە سوننەتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هەر بریتی بووە لە جێبەجێ كردنی كتێبی خوا، وەك دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ:

(كانَ خُلُقَ نَبِيِّ اللَّهِ كانَ الْقُرْآنُ) رواه مسلم: ٧٤٦

واتە: ڕەوشت و هەڵس و كەوتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قورئان بوو، بەڵێ ڕێبازەكەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هەر بریتیە لە تەرجەمە كردنی قورئان بەكردەوە، وە ڕوون كردنەوەی ئەوەی كە پێویست بە ڕوون كردنەوە دەكا.

كەواتە: ئێمە جگە لە شەریعەت هیچ شتێكی دیكەمان نیە، ئەدی تەریقەت چییە؟ وەك گوتم: تاكە ماناو چەمكێكی ڕاست كە بگونجێ بۆی بەكاربێ، ئەوەیە بڵێین: مەبەست لە تەریقەت هەمان ڕێبازی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) كە شەریعەت حاڵەتێكی تیۆریی (نظري) هەیە، بەڵام تەریقەت حاڵەتێكی

پڕاكتيكيى (تطبيقي) هەيە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ميانی سوننەتەكەی خۆيدا شەريعەتی بۆ بەرجەستە كردووين، وەك ئەوەی دايكمان عائيشە گوتوويەتی، چونكە: وشەی (خُلُق) مانايەكەی زۆر فراوانەو، تەنها مەبەست پێی هەڵس و كەوتی تاكيی نيە، يانی: سەرجەم جم و جۆڵ و چالاكيی و هەڵوێستەكانی بريتی بوون لە پيادەكردنی قورئان، كەواتە تەريقەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و ڕێبازێك كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شەريعەتی پێ لە دنيای واقيعدا جێبەجێ كردوە، ئەوە ئەو تەريقەتەيە كە دەبێ بەو شێوەيە قورئان و شەريعەت پيادە بكرێ، ئنجا ئەگەر بەو شێوەيە شەريعەتت پيادە كرد، بێگومان چەند بەرهەمێكت دەكەونە دەست كە پێيان دەگوترێ: (حقائق) حەقيقەتی ئيمان و تەوحيد، حەقيقەتی عيبادەت، حەقيقەتی ئيخلاص، حەقيقەتی تەقوا، حەقيقەتی ئيحسان، حەقيقەتی سەبرو شوكرو تەوەككول و، حەقيقەتی ئاكاری جوان و، حەقيقەتی كۆچ كردن و تێكۆشان لە پێناوی خوادا، هەموو ئەو سيفەت و كارە باشانەی كە ئينسان لە شەريعەتدا لێی داواكراون، وە پێيان لە خوای بەرز نزيك دەبێتەوە، دوای ئەوەی كە شەريعەت بە ڕێبازێكی تايبەت كە تەريقەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) جێبەجێ دەكەين، ئەو حەقيقەتانەمان دێنە دەست، كەواتە: تەريقەت و حەقيقەت هەر چوونەوە نێو شەريعەت، وە ئێمە شتێكی لە شەريعەت زيادەمان نيە، وە هەر كەسێ پێی وابێ شتێ هەيە لەدەرەوەی شەريعەت و، وا دەكا ئينسان لە خوای پەروەردگار نزيك بێتەوە، لە ڕاستيدا حاڵی نەبووە، چونكە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمايشتێكدا دەفەرموێ: هيچ شتێ نيە لە خواتان نزيك بخاتەوە من پێم نەگوتبن، وە هيچ شتێ نيە كە ئێوە لە خوا دوور بخاتەوە، من ئاگادارم نەكردبنەوە.

هەر لەو بارەوە سێ وشەی ديكەش بەكاردێن لەلايەن ئەهلی تەصەووف و عيرفاندا بە پێويستی دەزانم لە باسی پازدەيەم (١٥)دا تيشكێكيش بخەمە سەر ئەوان و، باسێكی كورت دەربارەيان بكەين.



# ١٥

# باسێك دەربارەی:
# (عِلْمُ اليَقين و حَقُّ اليَقين و عَيْنُ اليَقين)

دیارە ئەو سێ وشەیە هەرسێکیان لە قورئاندا هاتوون، بۆ وێنە خوا سبحانه و تعالى لە سوورەتی (التكاثر)دا دەفەرموێ:

﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ﴿٢﴾ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴿٥﴾ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴿٧﴾ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾﴾ التكاثر

واتە: خۆ هەڵکێشان بە (زۆریی)ەوە، ئێوەی بێئاگا کرد، هەتا سەردانی گۆڕستانتان کرد (واتە: تاکو مردن، یاخود: هەتا چوون مردووەکانیشتان سەرژمێر کرد)، نەخێر واز بێنن لەمەودوا دەزانن، نەخێر واز بێنن لەمەودوا دەزانن، وازبێن ئەگەر زانیاریی جێی دڵنیاییتان هەبووایە (ئاواتان نەدەکرد)، سوێند بەخوا ئێوە دۆزەخ دەبینن، دوایی ئێوە بەچاوی دڵنیاییەوە دەیبینن، پاشان دەربارەی نازو نیعمەتەکان لێتان دەپرسرێتەوە.

کەواتە: وشەکانی: (علم اليقين) و (عين اليقين) لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوون، دیارە لە شوێنی دیکەشدا هاتوون، (حق اليقين)یش لە سوورەتی (الحاقة)دا هاتوە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٥٢﴾﴾

دیارە باسی قورئان دەكا دەفەرموێ: بێگومان ئەم (قورئان)ە، یادخەرەوەیە بۆ پارێزكاران، وە ئێمە دەزانین ئێوە هەندێكتان بەدرۆی دەزانن، وە ئەوە مایەی داخ و خەفەتە بۆ كافران {داخ و خەفەتی زۆر دەخۆن، لە ڕۆژی دواییدا، یاخود لە دنیادا خەفەتی لێ دەخۆن، كە ناتوانن بەربەرەكانی قورئان بكەن}، وە قورئان (حق الیقین)ە. (دوایی باسی دەكەین واتە: چی؟) ناوی پەروەردگاری مەزنت بەپاك بگرە.

## ئایا ئەو سێیانە: (علم الیقین و حق الیقین و عین الیقین) مانایان چییە و جیاوازییان چییە؟

(الیَقِین) لە (یَقَن)ەوە هاتووە (یَقِنَ الأَمْرُ، أي: ثَبَتَ وَ وَضَحَ)[1]، ئاوەكە وەستا (یَقِنَ) واتە: وەستا.

**(علم الیقین)**: بریتیە لە زانیارییەك كە ئینسان داوای هیچی دیكە نەكا لەو بارەوە، واتە: تۆ زانیارییەكت هەیە دەربارەی شتێك، كە پێویست نەكا هیچی دی لەبارەوە بزانی و، لەوێ دەوەستی.

**(عین الیقین)**: ئەوەیە كە تۆ وێڕای ئەوەی بە عەقڵ شتەكەت دەرك كردوە، بەچاویش ببینی.

**(حق الیقین)**: ئەوەیە كە تۆ دەست لەو شتە بدەی، یان بچیە لای، یان بچیە نێوی، یان بیچێژی.

با وێنەیەك بهێنینەوە: ئەگەر ئینسان بزانێ و دڵنیابێ كە لە فڵان شوێنە هەنگوین هەیە، ئەوە (علم الیقین)ی هەیە بە بوونی هەنگوین، (عین الیقین) یش ئەوەیە بەچاوی خۆی شانە هەنگوینەكان ببینێ لەو شوێنەدا، (حق الیقین) یش ئەوەیە كە دەستیان لێ بدا، یاخود لێی تام بكا.

.................................

(١) الصباح المنیر، للفیومي، ص٣٥١.

دیارە ئەوان بەنسبەت مامەڵە كردن لەگەڵ خوادا، ئەو سێ وشەیەیان بەكار هێناون: (علم الیقین) بەخوا، ئەوەیە كە تۆ زانیارییت هەبێ بەبەڵگە، وە دڵنیایی كە خوا سبحانە و تعالی خاوەن و پەروەردگارو مشورخۆری ئەو كەون و كائیناتەیە، وە خوا خاوەنی هەموو ناوو سیفەتێكی بەرزو پەسندە، وە خوا دەبێ تەنیا خۆی بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ بكرێ.

(عین الیقین)یش ئەوەیە كە تۆ بەدڵ ئەو حەقیقەتانە ببینی، بەچاوی عەقڵ و دڵ بیانبینی، دوای ئەوەی بەبەڵگەی تەواو زانیبووتن.

(حق الیقین)یش ئەوەیە كە تۆ ئەو شتانە تام بكەی و چێژیان لێ وەربگری بە كردەوە، كە دەگونجێ ئینسان بگاتە ئەو حاڵەتەش و شتەكان وایان لێبێ، وەك ئەوەی دەستیان لێ بدەی و شتەكان بەرهەست بوون، وەك (علي بن المجد طالب) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (لو كُشِفَ الحجابُ ماازدَدْتُ یقیناً)[1] واتە: ئەگەر پەردەش لابدرێ بڕوا پتەویم زیاد ناكات.



............................................

(١) تفسیر القرآن الحكیم، لمجد رشید رضا، ج٩ ص٥٠٤.



# ١٦ هەندێ هەڵەو پەڵەی ژمارەیەك لە ئەهلی تەصەووف

شوێن کەوتووانی هەندێ لە ڕێبازەکانی تەزکیەو تەصەووف، هەندێ هەڵەو پەڵەیان هەن من ئاماژە بە هەندێکیان دەکەم، بۆ ئەوەی هەموو لایەك وریا بین، ئەگەر ئەوانەمان بینی لەسەر زانیاریی تەزکیەی نەفس و، لەسەر ئەو گەورە پێشەوایانەی کە مامۆستاو چاوساغی ئەو ڕێبازە بوون، وە پسپۆڕو شارەزا بوون، لەسەر ئەوانیان حیساب نەکەین، ماڵی قەڵب سەر بە خاوەنیەتی، وەك جاری دیکەش گوتوومە: لە باخێکدا کە پڕە لە میوەی جوان، لەبەر ئەوەی چەند دانە میوەیەکی گەنیوی تێدایە، یان چەند میوەیەکی کرچ و کاڵ و تام ناخۆشی تێدایە، نابێ هەموو میوەکانی ئەو باخەت لەبەرچاو بکەون، دیارە لەنێو دەریای فراوانی تەصەووفیشدا، وێڕای ئەوەی گەوهەرو مرواری زۆر هەن، بەڵام ئەو دەریایە هەندێ جرو جانەوەریشی تێدایە، ئەویش لەبەر ئەوەی تەصەووف و تەزکیە، زیاتر سەرو کاری لەگەڵ عاتیفەو دڵ و دەروونە، ئەوەش زۆر جار وا دەکا عاتیفە بەسەر عەقڵدا زاڵ دەبێ و، ئینسان تووشی تێپەڕاندن و کورت هێنان و لادان دەکا، بۆیە کەم و زۆر هەڵەو پەڵەی تێ دەکەوێ، وەك چۆن قسەی شاعیران هەندێ جار هەڵەی تێ دەکەوێ، وە قسەی هونەرمەندەکان بەهەمان شێوە، چونکە بەردەوام ئەو شتانەی کە لە عاتیفەوە سەرچاوە دەگرن، تێپەڕاندن و بەزایە دان و لادانیان تێ دەکەوێ، ئێمە ئاماژە بەهەندێ لەو هەڵانەی ئەهلی تەصەووف دەکەین:

## ١- زێدەڕۆیی كردن لە زوهددا:

یەكێ لەو هەڵانە بریتیە لە زێدەڕۆیی كردن لە زوهددا، بگرە بەهەڵە تێگەیشتن لە زوهد، زۆریان وشەی زوهدیان بەوە تەفسیر كردوە كە بریتیە لە: (دنیا نەویستیی)، بەڵام لە ڕاستیدا زوهد بریتی نیە لە دنیا نەویستیی (ترك الدنیا) چونكە زوهد سیفەتێكی پەسندە، وەك یەكێ لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەپرسێ: شتێكم پێ بڵێ بەهۆیەوە هەم خوا خۆشمی بوێ، هەم خەڵكیش خۆشمی بوێ، ئەویش فەرمووی:

(ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا فِي أَيْدِي النَّاسِ يُحِبُّوكَ) أخرجه ابن ماجة برقم (٤١٠٢)، والطبراني برقم (٥٩٧٢)، والحاكم برقم (٧٨٧٣) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١٠٥٢٢) قال الشيخ الألباني: صحيح.

واتە: لە ژیانی دنیادا زاهید بە، خوا خۆشی دەوێی، وە لەوەی لە دەستی خەڵك دایە زاهید بە، خەڵكیش خۆشی دەوێی، كەواتە: زوهد سیفەتێكی پەسندە، ئنجا (دنیا نەویستیی) ناگونجێ ئینسان دنیای هەر نەوێ بە ڕەهایی، چونكە ئەگەر دنیات نەوێ، دەبێ خۆت بكوژی و بەجێی بێڵی، كە ئەوەش دیارە قەدەغە كراوە، نەخێر زوهد: بریتیە لە (دنیا بەكەم گرتن) بەبەڵگەی قورئان، بۆ وێنە: ئەوانە كە یوسفیان لە بیرەكە دەرهێناو فرۆشتیان، خوای زانا دەفەرموێ:

﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ یوسف

واتە: وە بەچەند درهەمێكی كەم فرۆشتیان وە بەرامبەری زاهید بوون، چونكە بەبەلاش دەستیان كەوت، وە دەیانزانی دوایی خاوەنێكی هەیەو لێیان وەردەگرێتەوە، خواخوایان بوو بە نرخێكی كەم بیفرۆشن و لەكۆڵ خۆیانی بكەنەوە.

كەواتە: زوهد واتە: (دنیا بەكەم گرتن) نەك (دنیا نەویستیی)، ئنجا زێدەڕۆیی كردن لە دنیا بەكەم گرتندا، بە شێوەیەك كە ئینسان هەقی خاوەن هەقەكان بفەوتێنێ، بۆ وێنە: كابرا ماڵ و منداڵی هەیە، نەتوانێ بیانژیێنێ،

وە نەتوانێ خۆی وا لێبکا چاوی لەدەستی خەڵك نەبێ، ئەوە بەڕاستی سەر لێ تێکچوونە، وەك لە کتێبی (إحياء علوم الدين)ی غەززالییدا کە گەوهەرو مرواریی زۆریشی تێدان، بەڵام وەك لە (کتێبی ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)یشدا باسم کردوە، لەبواری دنیا بەکەم گرتندا، زیادەڕۆیی زۆری تێدایەو، ئەگەر ئەوەی ئەبو حامیدی غەززالیی خوا لێی خۆشبێ، دەڵێ، هەموو مسوڵمانان وا بکەن، پەکیان دەکەوێ و، هیچ مەدارێکیان پێ ساز ناکرێ، کە ئەوەش بەتەئکید لەگەڵ شەریعەتدا ناگونجێ.

## ٢- بەکارهێنانی هەندێ قسەو تەعبیری سنوور بەزێن:

یەکێکی دیکە لەو هەڵانە: بەکارهێنانی هەندێ قسەو تەعبیری سنوور بەزێنە، کە (شطحات)ی پێ دەگوترێ، ئەو قسانەی لە سنووری عەقڵ و شەرع دەچنە دەر، بۆ وێنە: لە هەندێ لە کتێبەکانی تەصەووفدا هاتوە کە حەللاج گوتوویەتی: (أنا الله) یان گوتوویەتی: (ما في الجبة إلا الله)، وە گوایە لە ئەبو یەزیدی بەستامی دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: (سبحاني ما أعظم شأني)، وە یەکێکیان بە شیعر گوتوویەتی:

أنا من أهوى ومن أهوى أنا .... نحن روحان حَلَلْنا بَدَنا

کابرا بڵێ: (من خوام)، یان (ئەو جوببەیە خوای تێدایە)، یان (پاکیی بۆ من، پایەی من چەند مەزنە!)، یان بڵێ: (ئەوەی کە من ئارەزووی دەکەم و خۆشم دەوێ ئەو منم، وە منیش ئەوم، ئێمە دوو ڕووحین لەیەك جەستەداین). ئەوە لەڕاستیدا هەموویان (شطحات) و قسەی بێجێن، وە بە کوفری بێ پێچ و پەنا دادەنرێن، دیارە حەللاج باجی ئەو قسانەی داوە، کاتی خۆی لە شاری بەغدا کوژراوە، زانایان فەتوایان لەسەری داوە.

بەهەرحاڵ مەبەست ئەوەیە کەئەهلی تەصەووف هەندێ قسە لەهەندێ لە کتێبەکانیاندا هەن عەقڵ و شەرع نایانگرێتەوەو، پێویستە لێیان وریا بین.

## ٣- بیرۆكەی: هەموو شتێك خوایەو ، خواش لە هەموو شتێك دایە (وحدة الوجود):

هەڵەیەكی دیكە كە لەهەندێ لە ئەهلی تەصەووفدا هەیە، كە هەڵەیەكی زل و كوشندەیە، بریتیە لە بیرۆكەی یەك بوونیی (وحدة الوجود)، بۆ نموونە: (محي الدين بن عربي) دوو كتێبی هەن بەناوی: (الفتوحات المكية) وە (فصوص الحكم)، لەو دوو كتێبەیدا بە ئاشكرا باسی (وحدة الوجود) دەكا، (وحدة الوجود) كورتەكەی ئەوەیە: كە بوون (وجود) جەستەیەكە، خوای پەروەردگار ڕووحەكەیەتی و تێیدایە، یانی: هەموو شتێك خوایەو، خوا لەهەموو شتێك دایە!! كە لە ڕاستیدا ئەوەش قسەیەكی بێجێ و بێمانایە، وە هەموو ئەوانەی قووڵ و ڕۆچوون لە بواری تەصەووف و تەزكیەی نەفسدای پابەند بە قوڕئان و سوننەتەوە، ڕەفزی ئەوەیان كردوە، وە ئەوەیان بە كوفرو سەر لێشێوان و سەرگەردانیی داناوە، وە ئەگەر گومانی چاكیان بە خاوەنەكەی بردبێ، گوتوویانە: ئەوە لە حاڵەتێكدا بووە، كە عەقڵی لەسەر خۆی نەبووەو، دڵ گەرمیی بەسەریدا زاڵ بووە، وە ئەگەر گومانی خراپیشیان پێ بردبێ، گوتوویانە: ئەوە ئینسانێكی زەندیق و بێدین بووە، هەڵبەتە ئێمە حوكم بەسەر هیچ كامیاندا نادەین، بەڵام حوكم بەسەر قسەكانیاندا دەدەین، وە ئەوەش هەڵوێستی ڕاستە، چونكە دەگونجێ كابرا هەندێ لەو قسانە هی خۆی نەبن و خزێنرابنە نێو قسەكانی، یاخود ئەگەر هی خۆشی بن، لەكاتێكدا كردبنی، ئاگای لەخۆی نەبووبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێمە دەڵێین: ئەو قسانە كوفرو بێدینیی و ئیلحادن، ئەمما خاوەنەكەیان چۆنە؟ ئەوە خوا بۆخۆی دەزانێ، دەبینی كابرا ئەو قسانەی كردوەو دوایی لێیان پەشێمان بووەتەوە.

## ٤- بیرۆكەی: (خاتم الأولياء):

یەكێكی دیكە لەو هەڵەو پەڵانە كە بەتایبەت: (إبن عربي) و (الحكيم الترمذي) زۆر جەختیان لەسەر كردۆتەوە، بریتیە لە بیرۆكەی كۆتایی دۆستانی خوا (خاتم الأولياء) كە هەردووكیان زۆر بەزەقیی خۆیان بە كۆتایی دۆستانی

خوا دەناسێنن، وە دەڵێن: چۆن (خاتم الأنبياء) هەیە، ئاواش (خاتم الأولياء) هەیە، کە بەڕاستیی ئینسان پێکەنینی بەوە دێ، ئاخر تۆ: موحییدینی کوڕی عەڕەبیی! ئەگەر گریمان تۆ باشیش بی و ئەو قسانە هی تۆ نەبن و لەسەر تۆ حیساب نەکرێن، بەڵام تۆ کە لە سەدەی شەشەم و حەوتەمی کۆچییدا ژیاوی، چووزانی دوای تۆ خوای پەروەردگار چەند دۆستی دیکەی پەیدا دەبن؟

چۆن خۆت کرد بە خاتەم و کۆتایی هەمووان؟ بەڕاستیی ئەوە شتێکی زۆر بێ مانایەو ئیددیعایەکی زۆر زل و زۆر بێ بنەمایە، کە لەچەند شوێنێکی کتێبەکانیدا دەڵێ: من بڕوام وایە کۆتایی ئەولیاکانم، بەڵکو هەندێ لە قسەکانی ئەوە دەگەیەنن کە (خاتم الأولياء) لە ڕووی دۆستایەتیی لەگەڵ خوادا، لە پێش (خاتم الأنبياء)ەوە بێ، کە هەر ئەوە بۆخۆی کوفرێکی بێ پێچ و پەنایە، هەڵبەتە هەندێ لە ئەهلی تەصەووف ئەو قسانەی (إبن عربي) بە جۆرێ ئاڕاستەو پینەو پەڕۆ دەکەن، بۆ ئەوەی بەلای کەمەوە لەوە کە لەبازنەی ئیسلام و ئیماندا بچێتە دەر، بیپارێزن، ئێمەش سوورنین لەسەر ئەوەی کەس لە بازنەی ئیمان و ئیسلام ببەینە دەر، بەڵام سوورین لەسەر ئەوەی هەرشتێ ناهەق بوو، ڕەتی بکەینەوە، بەهەق بڵێین: هەق، بەناهەقیش بڵێین: ناهەق، قسەکان حوکمیان لەسەر دەدەین، بەڵام خاوەنەکەی چۆنە، یان خراونەتە پاڵی، یان لێیان پەشێمان بووەتەوە، یان لە حاڵەتی عەقڵ لەلا نەماندا، ئەو قسانەی کردوون، ئەوە شتێکی دیکەیە، خوا بۆخۆی بەبەندەکانی ئاگادارە، وەك بنچینەی شەرعیی کە زانایان دایان ناوە: (نَحْنُ نَحْكُمُ بِالظَّاهِرِ، وَاللهُ يَتَوَلّى السّرائِر)، ئێمە بە ڕواڵەت حوکم دەکەین، نهێنییەکانیش حەواڵەی خوا دەکەین، ڕواڵەتی ئەو قسەیە ئەوە حوکمەکەیەتی: هەر کەسێ پێی وابێ کە لە پێغەمبەری خاتەم گەورەترە، ئیددیعایەکی وا زل بکا، ئەگەر کافریش نەبێ بە ئیددیعا زلەکەی، کە گوایە کۆتایی دۆستانی خوایە، بێگومان کەسێ خۆی پێ لە پێغەمبەری خاتەم گەورەتر بێ، کافر دەبێ، وە هەر کەسێ ئیددیعای وا زل بکا، بڵێ: دۆستانی خوا بەمن کۆتاییان پێ هاتوە، با لەدوای منیشەوە دۆستی دیکەی خوا بێن، هەرکەسێ ئەو ئیددیعایە بکا، بەلای کەمەوە زۆر گوناهبارە، چونکە خۆ بەزل

گریی (كِـبـر) بەدەقی ئایەت نەهی لێ كراوە.

(وحدة الوجود)یش ئەوە دیارە كوفرو ئیلحادو لادانە لە دین، چونكە خوای بێ هاوەڵ دەفەرموێ:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى

واتە: هیچ شتێك وەك وێنەی وی (خوا) نیە، وە ئەو بیسەری بینەرە. بەڵام تۆ بێنی هەموو شتێ بەخوا دابنێی و، بڵێی خوا ڕووحی هەموو شتێكە ئەوە بێگومان دژو تێكگیراوە لەگەڵ ئایەتی خوادا! ئنجا خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٤﴾﴾ السجدة

كەواتە: خوای بێوێنە لەسەر عەرشی خۆیەتی، لە دەرەوەی دروستكراوەكانی، بەڵام ئەو دەڵێ: خوا لەهەموو شتێكدایەو لە هەموو شوێنێكە! بەڵێ، ڕاستە بڵێی: من سیفەتەكانی خوا لە هەموو شتێدا دەبینم، بەواتا شهوودییەكەی، چونكە (وحدة الشهود) لە ئیسلامدا هەیە، وەك باسمان كرد، تەنیا خوا ببینی، تەنیا سیفەتەكانی خوا ببینی، لە هەموو دروستكراوەكانیدا، ئەوە شتێكی پەسندەو هیچ كێشە لەگەڵ ئەوەدا نیە، بەڵام بڵێی: خوا لەهەموو شتێك دایەو لە هەموو شوێنێكە، ئەوە بێگومان پێچەوانەیە لەگەڵ ئایەت و فەرمایشتەكاندا، وە لەگەڵ عەقڵ و فیطرەت و عیلم و واقیعیشدا.

## ٥- دەمارگیریيان بۆ ڕێبازەكانی خۆیان:

هەڵەیەكی دیكەیان ئەوەیە كە هەندێكیان زۆر دەمارگیرن بۆ ڕێبازەكانی خۆیان، نەقشەبەندیی بۆ ڕێبازەكەی خۆی، چەشتیی بۆ هی خۆی، قادریی بۆ هی خۆی، ڕیفاعی بۆ هی خۆی.. هتد، پاشان هەڵەی شێخەكانیشیان كەم وایە ببینن، یانی: هەندێكیان ئەگەر بە قسەش نەیڵێن، بە كردەوە شێخەكانی خۆیان پێ مەعصوومە لە هەڵە، ئەگەر بڵێی: فلان شێخ ئەو هەڵەیەی كردوە، پێی قەبووڵ ناكرێ، لە كاتێكدا تەنها پێغەمبەران پارێزراون لە هەڵە، جیاوازیی نێوان ئەهلی سوننەت و جەماعەت كە زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانانن، لەگەڵ

شیعەی دوازدە ئیمامییدا، ئەوەیە كە شیعە، دوازدە ئیمامەكانیان پێ پارێزراوە لە هەڵە، بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن: زانایان پارێزراو نین لە هەڵە، تەنها پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ پارێزراون، پێغەمبەرانیش لە گوناح پارێزراون، ئەمما لە هەڵەی ئیجتیهادیی پارێزراو نین، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چەند جارێك كۆششی كردوە، بەڵام خوای پەروەردگار بەڕاستی دانەناوەو، بۆی ڕاست كردۆتەوە، وەك دەفەرموێ:

﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ﴿٤٣﴾﴾ التوبة هەروەها: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ ﴿٦٧﴾﴾ الأنفال هەروەها: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾﴾ عبس

تەماشا دەكەی خوای كاربەجێ هەڵەی ئیجتیهادیی بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕاست كردۆتەوە، بۆیە بەپارێزراو زانینی شێخ و ئوستازەكان هەڵەیەكی دیكەیە، لەهەڵە زەقەكانی هەندێ لە ئەهلی تەصەووف.

## ٦- خۆدوور گرتن و كەنارگیریی كردن لە مسوڵمانان:

خۆدوور گرتن لە مسوڵمانان و تێكەڵ نەبوونیان، هەروەها خۆدوور گرتن لە مزگەوتەكانیان و، ئیكتیفا كردن بە تەكیەو خانەقایەكانی خۆیان، شێخ هەر لە تەكیەو خانەقای خۆیەتی و نایەت بۆ مزگەوت، كە ئەوەش جۆرێكە لە خۆ بەزلگریی و خۆ جیا كردنەوە لە مسوڵمانان، كە ئەوەش هەڵەیە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ مسوڵماناندا بووەو پێشەوایان بووە، وە شێخان و ئوستازانی موعتەبەر لەسەر ئەو ڕێبازەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوون و، خۆیان جیا نەكردۆتەوە لە مسوڵمانان.

## ٧- بیرۆكەی: قسە وەرنەگرتن لە مردووان:

هەروەها ئەو قسەیان كە دەڵێن: (أخذتم علمكم من الأموات، وأخذنا علمنا من الحي القيوم الذي لا يموت)، دیارە ئەوان مەبەستیان ئەوەیە كە هەم:

قورئانی بەرزو بە پێزەو، هەم سوننەتی پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) هەمووی دەماو دەم بە ئێمە گەیشتوون، ئنجا دەڵێن: ئەو زانایانە کە قورئان و فەرموودەکانیان گێڕاوەتەوە، وەفاتیان کردوە، کەواتە ئەو زانیارییەی ئێوە لە مردووەوە وەرتان گرتوە، بەڵام ئێمە ڕاستەوخۆ زانیارییەکانمان لە خواوە وەردەگرین!! کە ئەوەشیان دیسان قسەیەکی بێجێیە، چونکە زانیاریی شەریعەت هەمووی لە خواوە هاتوە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ... ﴿٦﴾ ﴾ الفرقان

بەڵێ، شەریعەت چ وەحی ڕاستەوخۆ بێ، کە قورئانە، چ ئەوە بێ کە خوا خستوویەتە دڵی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)، چ بە شێوەی ئیلهام، چ بە شێوەیەك لە شێوەکانی وەحی، خوای زانا پێی ڕاگەیاندوە، کەواتە: عیلمی شەریعەت هەموی دەگەڕێتەوە بۆ خوا سبحانه و تعالی، بەڵام تۆ هەر لەخۆوە بڵێی: خوا ئەوەی خستۆتە دڵم، تۆ نازانی: ئایا خوا ئەوەی خستۆتە دڵت، یان شەیتان!، وەك (إبن تیمیة) لە کتێبی: (الفرقان بین أولیاء الرحمن و أولیاء الشیطان)دا، ئاماژەی پێ دەکا، کە تۆ نازانی ئەوە لەلایەن خواوەیە خراوەتە دڵت، یان لەلایەن شەیتانەوەیە، دڵنیا نی بڵێی: ئەوە ئیلهامەو حەتمەن لەلایەن خواوەیە، چونکە تەنانەت هەندێ جار شەیتان ویستوویەتی وەسوەسەی خۆی بخاتە نێو ئەو ئایەتانەوە، کە بۆ پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) هاتوون، وەك خوای توانا دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِىٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ ﴾ الحج،

لەسەر ڕای هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست لەم ئایەتە موبارەکە ئەوەیە کە: جارو بار شەیتان ویستوویەتی وەسوەسەی خۆی بخاتە نێو ئەو ئایەتانەوە کە بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نێرراون، ئەدی دەبێ بۆ کەسانی غەیری پێغەمبەران (صلی الله علیه وسلم) چۆن بێ؟ بەڵێ ئیلهام و خورپە هەیە،

بەڵام بەدیل نیە بۆ قورئان و شەریعەت، شەریعەت ئەوەیە كە ئێمە لێی دڵنیاین كە خوا فەرموویەتی و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، یان كردوویەتی.

## ٨- بانگەشەی هەندێ لە ئەهلی تەصەووف، كە گوایە گەیشتوونەتە (یقین):

هەڵبەتە ئەوانەیان كە زۆر لادەرن و هەندێكیان لە بازنەی ئیسلام چوونەتە دەر، بانگەشەی ئەوە دەكەن كە گوایە ئەركە شەرعیەكانمان لەسەر نەماوە، چونكە خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾ الحجر

واتە: وە پەروەردگارت بپەرستە، تاكو یەقینت بۆ دێ، دەڵێن: ئێمەش یەقینمان بۆ دروست بووە، یەقین واتە: دڵنیایی ئێمەش گەیشتووینەتە دڵنیایی و، تازە پێویست ناكا نوێژ و طاعەت بكەین، چونكە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: پەروەردگارت بپەرستە تاكو یەقینت بۆ دێ، ئێمەش گەیشتووینەتە یەقین و تازە پێویست ناكا خوا بپەرستین! كە ئەوە مانا لێك دانەوەیەكی زۆر هەڵەو زۆر ڕووكەشییانەیە، چونكە یەقین لێرەدا بەمانای مردنە، وەك لە شوێنێكی دیكەدا لەسەر زمانی كافرەكان دەفەرموێ:

﴿ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴿٤٧﴾ ﴾ المدثر

واتە: وە ئێمە دواڕۆژمان بەدرۆ زانی. تاكو مردنمان پێ گەیشت، هەر لەبەر ئەوەش ناو لە مردن نراوە: یەقین، چونكە كەس گومانی نیە لە مردن، كەواتە: ئەوە قسەیەكی بێ مانایە كە لێرەدا یەقین بەمانای دڵنیایی بێ، ئەگەر وابووایە، دەبووایە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر لەسەرەتاوە هیچ نوێژو ڕۆژوویەكی نەبێ، چونكە هەر لەسەرەتای هاتنی وەحی بۆی، یەقینی بۆ پەیدا بوو، كەچی تا گیانی موبارەكی سپاردوە، هەر بەردەوام بووە لەسەر خواپەرستیی، وە لە كۆتا ساتەكانی تەمەنیدا، دوو نەفەر چوونەتە بن

قۆڵی بۆئەنجام دانی نوێژ، کە لە نەخۆشیی مەرگیدا بووە، وەک لە (صحیح البخاري)دا هاتووە.

## ٩- بەهەڵە لێکدانەوەی ئایەتی ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ ﴾ :

هەندێکیان گوتوویانە: هەرکەسێ تەقوای خوا بکا، پێویستی بە مامۆستاو کتێب خوێندنەوەو شارەزایی لە قورئان و سوننەت ناکا! چونکە خوا فەرموویەتی:

﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ ﴿٢٨٢﴾ ﴾

واتە: پارێز لە خوا بکەن، وە خوا فێرتان دەکات.. دەڵێین: ئەوەش بەهەڵە لێی تێگەیشتوون، چونکە خوا نەیفەرمووە: (واتَّقوا الله يعَلِّمْكُمُ الله) بەجەزم نەیفەرمووە: وە پارێز لەخوا بکەن، خواش فێرتان دەکا، بەڵکو دەفەرموێ: وە پارێز لەخوا بکەن، وەخوا فێرتان دەکا، یانی پارێز لەخوا بکەن لەوەدا کە فێری کردوون، خوای زاناش بەردەوام یاساکانی شەریعەتتان فێر دەکا.

ئەگەر بەجەزم بووایە، ئەو کاتە ئەو مانایەی دەگەیاند کە ئەوان دەیڵێن، بەڵێ، بێگومان لە ئەنجامی تەقوادا ئینسان دڵی ڕۆشن دەبێتەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ئەگەر پارێز لەخوا بکەن، خوا فورقانتان پێ دەبەخشێ:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأنفال

فورقانیش حاڵەتێکە ئینسان هەق و ناهەقی پێ لێك جیا دەکاتەوە، بەڵام ئەو دڵ ڕوونییە لە ئەنجامی بوونی تەقواوە، بەدیل نیە بۆ زانیاریی شەرعیی و، بەدیل نیە بۆ زانیاریی هەبوون بە قورئان و سوننەت، هەر بۆیەش گەورە زانایانی وەك: شێخ عەبدولقادری گەیلانیی و، شێخ جونەیدو، شێخ ئەحمەدی سەرهەندیی، کە لەدەریای تەزکیەی نەفسدا مەلەوان بوون، هەمیشە لە خزمەت قورئان و سوننەت دابوون.

**١٠- دەڵێن: ئەگەر ئینسان دەرونی خۆی پاك بكاتەوە، دەروونی وەك ئاوێنەیەكی لێ دێ، كە زانیاریی خوای پەروەردگاری تێدا دەدرەوشێتەوە:**

كە ئەوەشیان هەڵەیەكی دیكەیە، ئنجا (ئیبن و لبەنناى سەرقوستیى) چەند شیعرێكی لەو بارەوە گوتوون، دەڵێ: ئەهلی تەصەووف دەبنە دوو بەش، بەكورتیی شیعرەكەی دەهێنینەوە دەڵێ:

والقوم في هذا على فرقين ... وحكمهم فيه على ضربين
ففـرقة طريقهم مبنية ... عـلى العـقائد وحسـن النيـة
قالوا فإن النفس كالمرآة ... ينطبع المـاضـي فــيها والآتي
وإنــما يعـوقـها أشـياء ... تــرك المـحـاذاة أو الصــداء
قالوا وإن العـين قـد تـغور ... وإنـما يخـرجها الحــفير
وأجمعـوا أن عـلاج الأصـل ... أقرب للبـئر معــاً والنيـل
فمـا إليه أبـداً نشــير ... هـو عـلاج النفـس والتـطـهير
وهـذه طـريقة الإشـراق ... كانت وتبقى ماالوجود باقي

دەڵێ: كۆمەڵی ئەهلی تەڕیقەت و تەصەووف، لێرەدا دوو كۆمەڵەن، وە دوو جۆر حوكمیان هەیە، كۆمەڵێكیان ڕێبازەكەیان بنیات نراوە لەسەر عەقیدەو نیەتی باش، وە گوتوویانە: نەفسی ئینسان وەك ئاوێنەیەك وایە، كە ڕابردووو داهاتووی تێدا ڕەنگ دەداتەوە، بەڵام هەندێ شت دەبن بەپەرچ لە ڕێیدا: یەكیان: ئەوەیە كە ڕوو بەڕووی نەبێ، دووەم: یاخود ژەنگی هێنا بێ، ئنجا گوتوویانە سەرچاوەش جاری وایە ئاوەكەی ڕۆ دەچێ، بەڵام ئەوەی ئاوەكە دەردەهێنێ، دووبارە هەڵی دەكۆڵێتەوە، وە هەموویان یەك دەنگن، كە چارەسەری ئەصڵەكە چاكترەو نزیكترە لەوەی كە دووبارە بیرێكی دیكە هەڵكەنی، ئەوەی كە بەردەوام ئەوان بەڕاستی دەزانن، ئەوەیە كە نەفس چاك بكرێ و پاك بكرێتەوە، ئەوەش پێی دەگوترێ: ڕێبازی ئیشراق، كە بەردەوام هەبووەو هەتا بوونیش بمێنێ، ئەو ڕێبازە بەردەوام دەبێ.

بەكورتیی ئەوان دەڵێن: ئەگەر ئینسان نەفسی خۆی خاوێن بكاتەوە، وەك ئاوێنەیەك وایە هەرچی زانیاریی خوای پەروەردگارە لەو ئاوێنەیەدا دەردەكەوێ، وە ڕابردووو داهاتوو چی تێدایە، تێیدا دەردەكەوێ!. بەڵام بێگومان ئەو بۆچوونە ڕاست نیە، بەڵێ، دەگونجێ نەفس هەندێ شتی لێ دەركەوێ، بەڵام بڵێی: هەرچی زانیاریی خوای پەروەردگارەو، هەرچی شەریعەتە لە نەفسدا دەردەكەوێ، ئەوە لە ڕاستیدا شتێكی بێ بەڵگەو بنەمایە.
ئنجا باسی دەستەی دووەم دەكاو دەڵێ:

وفـرقةٌ قـالوا بـأن العلـما ... مـن خـارج بالإكتسـاب أسـما
وشرطوا العلوم في اصطلاحه ... إذ لا غنىً للباب عن مفتاحه
فـليس للطـامع فيه مطـمع ... ما لـم تكن فيـه عـلوم أربع
وهــي علوم الـذات والصفـات ... والفقه والحـديث والآلات
وهــذه طـريقــة البـرهــان ... وهـي لكل حــازم يقـظــان.

باسی كۆمەڵی دووەم دەكاو دەڵێ: كۆمەڵێكیش گوتوویانە: زانیاریی لەدەرەوەی خۆت دەبێ بەدەستی بێنی، (وەك خوێندنەوە، نەك لەنێو خۆتدا) هەروەها چەند زانیارییەكیان بەمەرج گرتوون، چونكە گوتوویانە: دەرگا بەبێ كلیل ناكرێتەوە، وە هەر كەسێ چوار زانیاریی نەبن نابێ بە ئومێد بێ كە لەبواری تەزكیەی نەفسدا، بگا بەهیچ: زانیاریی بە زات و سیفەتەكانی خوا، وە زانیاریی بە شەریعەت و فەرموودەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وە زانستەكانی زمان كە ئامرازی تێگەیشتنی قوڕئان و سوننەتن. وە ئەم ڕێبازە ڕێبازی بەڵگەیە، ئەوەش بۆ كەسێكە كە زۆر وریاو هۆشیار بێ.

بەڵام حەقیقەت ئەوەیە كە فێربوونی تەزكیە كردنی نەفس، بەدیل نیە بۆ وەرگرتنی زانستی شەرعیی و، دەبێ زانستی شەرعیی هەر وەربگیرێ، چونكە نەفس بەبێ وەرگرتن و شارەزابوونی شەرع، هەر تەزكیە نابێ، دەبێ پێشێ: ﴿يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ﴾ هەبێ، پاشان ﴿وَيُزَكِّيهِمۡ﴾ دەبێ، چونكە نەفس هەرچەندە پاك و چاك بێ، ئەوە نابێتە هۆی ئەوە كە وەحی بۆ بێ، شەریعەت دەبێ لەڕێی خۆیەوە بزانرێ، وە ئەگەر وەك ڕێبازی ئیشراق دەڵێ:

وابووایە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرمووو: تەنها زیکر بکەن، پێویست بەوە ناکا ئایەتەکانی خوا لەبەر بکەن و، سوننەتی من لەبەر بکەن، وە ئەگەر وابووایە نەیدەفەرموو:

(مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ) أخرجه أحمد برقم (١٦٩٢٤)، والبخاري برقم (٧١)، ومسلم برقم (١٠٣٧)، وابن حبان برقم (٨٩)، وأخرجه أيضًا: الدارمي برقم (٢٢٤)

واتە: هەرکەس خوا چاکەی بۆی بوێ، لە ئاییندا شارەزای دەکات.

کەواتە: دەبێ لەسەرەتادا شەریعەت وەربگیرێ، ئنجا ئینسان ئەو شەریعەتە لەسەر خۆی پیادە بکا، تاکو نەفسەکەی پاك و چاك بێ.



# بەرهەم و نیشانەکانی تەزکیە بوونی نەفس

ئایا ئەو نیشانەو دروشمانە چین کە ئینسان ئەگەر لەخۆیدا، یان لە بەرامبەرەکانیدا بینینی، بزانێ خۆی یان بەرانبەرەکەی خاوەن نەفسێکی تەزکیە کراوە، خاوەن نەفسێکی پاك و چاکەو، کەسێکە لەخوا نزیکەو دۆستی خوایە؟!

## ١- وەدەست هێنانی ئیمانێکی شهوودیی:

مەبەستمان لە ئیمانی شهوودیی ئەوەیە کە ئینسان بەجۆرێك مامەڵە لەگەڵ خوادا سبحانە و تعالی بکا، وە لەگەڵ فریشتەکانی خوادا، وە لەگەڵ کتێبەکانی خوادا، وەلەگەڵ پێغەمبەرانی خوادا، وە لەگەڵ ڕۆژی دواییدا، وەك ئەوەی بەچاوی دڵ ئەوانە ببینێ، پێشتر باسمان کرد کە عاریف و خواناسەکان لە کۆتا قۆناغی ناسینی خوادا، لە کۆتا قۆناغی خوا بەیەکگرتن و ئیماندا، دەگەنە قۆناغی (وحدة الشهود)، واتە: تەنیا خوا سبحانە و تعالی وە سیفەتەکانی خوا دەبینن، بەڵێ دروستکراوەکانی خواش بەچاوی سەر دەبینن و، جیاوازیی دەخەنە نێوان بەدیهێنەرو دروستکراوەکانی، بەڵام بەچاوی عەقڵ و دڵ سیفەتەکانی خوا لەدروستکراوەکانی خوادا دەبینن، وەك من کاتی خۆی لەژێر ناوو نیشانی وتارێکدا گوتوومە: (تَتَجَلَّى ذاتُ اللهِ في صِفاتِهِ، وَتَتَجَلّى صِفاتُهُ في مَخْلُوقاتِهِ)[1]، بەڵێ لەڕاستیدا ئەوە کە ئینسان بە چاوی دڵ، نەك تەنیا بەعەقڵ و بەبەڵگە

---

(١) واتە: خودی خوا لە سیفەتەکانیدا دەدرەوشێتەوەو، سیفەتەکانی خواش لە دروستکراوەکانیدا دەدرەوشێنەوە.

هێنانەوە، بەڵكو بەدڵ و بە چێشتن و تام لێكردن، بڕوای بەخوا سبحانە و تعالى بێ و، هەست بە چاودێریی خوا بكا، وە هەست بە مامەڵەی خوا بكا لەگەڵیدا، وە هەست بە مامەڵەی خۆی بكا لەگەڵ خوادا سبحانە و تعالى، وە پاشان هەست بە مامەڵەی فریشتەكان بكا لەگەڵیدا، هەروەها هەست بە حەققانیەتی كتێبەكانی خوا بكا، بە چێشتن و بە چاوی عەقڵ و دڵ ئەو ڕاستییانە ببینێ، وە ڕاستیی (صدق)ی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، هەروەها ڕاستیی هاتنی ڕۆژی دوایی و حەقیقەتەكانی ڕۆژی دوایی و جیهانی بەرزەخ و، پاشان تێكچوونی ئەم بوونەوەرەو هەڵدرانەوەی لاپەڕەیەكی دیكە، تەنیا كاتێك مرۆڤ ئەو جۆرە ئیمانەی بۆ مەیسەر دەبێ، كە نەفسی باش تەزكیە ببێ، ئنجا ئەو حەقیقەتانەی لەلا دەبن بە شتی مەشهوودو بینراو، نەك تەنیا شتی مەعلووم و زانراو، بەڵكو لەلای دەبن بە شتی چێژراوو بینراوو دەكەوێتە حاڵەتی شهوودەوە، وە لێرەشدایە كە عاریف و خواناسەكان باسی (وحدة الشهود)یان كردوە، واتە: ئینسان وای لێدێ كە تەنیا خوا ببینێ، وە سیفەتەكانی خوا ببینێ، وەك پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلَا اللَّهَ بَاطِلٌ، وَكَادَ أُمَيَّةُ بْنُ أَبِي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ) أخرجه أحمد برقم (١٠٠٧٦)، والبخاري برقم (٣٦٢٨)، ومسلم برقم (٢٢٥٦)، وابن ماجة برقم (٣٧٥٧).

ڕاستترین قسە كە شاعیرێك گوتبێ، قسەكەی (لبید)ە: ئاگادار بن! جگە لە خوا هەموو شتێك بۆشە، وە (أمية بن أبي الصلت) نیزیك بووە مسوڵمان ببێ. بەڵێ هەموو شتێك جگە لەخوا بۆشە، چونكە هیچ شتێك نیە بوونەكەی لەخۆیەوە بێ، هەمووی بوونەكەی لەخواوەیە، وەك من لە هەندێ لە كتێبەكانم گوتوومە: دروستكراوەكان وەك سفر وان، ئەگەر تۆ لە ڕۆژهەڵات تا ڕۆژئاوا، لە ڕۆژئاوا تا ڕۆژهەڵات، سفر ڕیزبكەی، بێ نرخن و هیچ بەهایەكیان نیە، بەڵام (١)ێك لە پشتیانەوە دابنێی، قیمەت بە هەموویان دەدا، سفرەكان هەموویان لابەرە، (١)ەكە هەر خاوەن قیمەتێكی زاتییە، سفرەكان لەلای ڕاستیەوە دابنێ، قیمەت بە هەموویان دەدا، دروستكراوەكانیش بەخواوە هەن، بۆیە هەندێ لە

عاریفان بۆ وێنە: ئیبن و عەتائوڵڵای سكەندەریی لە حیكمەتەكانی خۆیدا دەڵێ: لەجیاتی ئەوەی دروستكراوەكانی خوا بكەینە بەڵگە لەسەر خوا، دەبێ خوا بكەینە بەڵگە لەسەر ئەوە كە دروستكراوەكان هەن، چونكە هەر خوا خاوەنی بوونی ڕاستەقینەیە.

بەهەرحاڵ یەكەم شتێ كە ئینسان لە تەزكیەی نەفسدا پێی دەگا، بریتیە لەو جۆرە ئیمانە، ئیمانی شهوودیی، كە ئینسان لە هەموو شتەكاندا خوا ببینێ، وە هەمیشە هەست بە بوونی خواو بە سیفەتەكانی خوا بكا، هەركامێكیان لە مەقامی خۆیداو لە حاڵەتی خۆیدا.

## ٢- تام و چێژ كردن لە خواپەرستیی:

نیشانەو بەرهەمی دووەمی تەزكیەی نەفس بریتیە لە تام و چێژ وەرگرتن لەخوا پەرستیی، وە بەقالب سووكیی و بەدڵخۆشیی ئەنجامدانی پەرستشەكان، بەتایبەت پەرستشەكان كە مامەڵەی ڕاستەوخۆن لەگەڵ خوادا، ئەگەرنا دەبێ هەموو ئەركە شەرعییەكان، ئینسان تام و چێژیان لێ بكا، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كە كاتی نوێژ دەهات، دەیفەرمووە بیلال:

(يَا بِلَالُ أَقِمْ الصَّلَاةَ أَرِحْنَا بِهَا) أخرجه أحمد برقم (٢٣١٣٧) ، وأبو داود برقم (٤٩٨٥)، قال الألباني: صحيح.

واتە: ئەی بیلال! (بانگەكە بدەو) نوێژ بەرپا بكەو بەهۆیەوە ئاسوودەمان بكە. هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەكی دیكەدا دەفەرموێ:

(وَجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ) أخرجه أحمد برقم (١٢٣١٥)، والنسائي برقم (٣٩٣٩)، وابن سعد (٣٩٨/١)، وأبو يعلى برقم (٣٥٣٠)، والحاكم برقم (٢٦٧٦) وقال: صحيح على شرط مسلم، والبيهقي برقم (١٣٢٣٢).

واتە: ترووسكایی چاوم یان فێنكایی چاوم، ئەوەی كە دەبێتە مایەی ئۆخژن و ئارامییم، بریتیە لە نوێژ.

## ٣- دووریی لە خوو خدەی نزم و پەست:

یەكێكی دیكە لە بەرهەم و نیشانەكانی تەزكیەی نەفس، بریتیە لە دووریی لە خوو خدەی نزم و پەست، جا چ پەیوەندییان بە جەستەو ڕواڵەتەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە ڕووح و دەروونی ئینسانەوە هەبێ.

ئەوانەی پەیوەندییان بە ڕواڵەتەوە هەیە، وەك هەموو ئەو گوناهانەی كە دەكرێن، هەر لە گوناهە گەورەكانەوە بگرە: وەك قەتڵ و زیناو دزیی و سوود خۆریی و زوڵم و فەسادو، نادادگەریی، هەتا گوناهە بچوكەكان وەك: ڕوانین بە ئارەزووەوە (النظر بشهوة)و هەموو گوناهە بچووكەكانی دیكە، وە گوناهە دەروونییەكانیش وەك شیرك و نیفاق و خۆ بەزل گریی و حەسەدو بوغزو كینەو ڕیابازیی.

## ٤- ڕازاندنەوەی ئینسان بە سیفەتە بەرزو پەسندەكان:

چ ئەو سیفەتانەی پەیوەندییان بە دەروونی ئینسانەوە هەیە، چ ئەوانەی پەیوەندییان بەجەستەی ئینسانەوە هەیە.

## ٥- ئامادەیی سەرو ماڵ بەخشین لەپێناو خوادا:

ئەمیش یەكێكی دیكەیە لە بەرهەمەكانی تەزكیەی نەفس، هەر كەس نەفسی پاك و چاك بووبێ و بۆ خوا صوڵحاو بێ و لەخوا نیزیك بێ، خۆی و سەرو ماڵەكەی بەهی خوا دەزانێ:

﴿ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦ ﴾ البقرة

واتە: ئەوانەی كاتێك بەڵایەكیان بەسەردێ دەڵێن: ئێمە هی خواین و بۆ لای خواش دەگەڕێینەوە.

ئنجا كەسێك كە نەك هەر ماڵەكەی، بەڵكو خۆشی بەهی خوا بزانێ، دیارە هەركات دینی خوا پێویستیی پێبێ، چرووكی نانوێنێ لە بەخشینیدا، هەر بۆیەش ئەوانەی بۆخوا صوڵحاو بوون، هەر لەسەردەمی هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بێ، كە لەلووتكەی بۆ خوا صوڵحان دابوون، هەتا جیلەكانی دوای ئەوان،

بەتایبەت ئەوانەی ئەهلی عیرفان و تەزكیەی ڕاستەقینە بوون، زۆر ئازاو بەجەرگ و بوێرو فیداكار بوون، زۆر لە شێخ و ئوستازانی بواری تەصەووف فەرماندەیەتیی زۆر لە ڕاپەڕینەكانیان كردوە، وەك: شێخ شامیلی نەقشبەندیی لە شیشان و، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی و، شێخ سەعیدی پیران و، شێخ مەحموودی حەفیدو، ئەمیر عەبدولقادری جەزائیریی، شێخانی دیكەش، كە مەرجیش نیە هەموویان سیفەتی شێخی كامڵ و ئوستازی ئیرشادیان بەسەردا چەسپیبێ.

## ٦- دنیا لەلا بچووك بوون و، گوێنەدان بە ئەهلی دنیا، لەسەر ئەوەی كە ڕەخنەی ناشەرعیی دەگرن:

هەڵبەتە ئینسان دەبێ بەردەوام گوێ بگرێ بۆ ڕەخنەی شەرعیی و قسەو پێشنیاری دڵسۆزانە، چونكە پارێزراوان لە هەڵە، تەنیا پێغەمبەرانن سەلامی خوایان لێبێ، هەر ئەوان بێ گوناهن، ئەگەرنا ئەوانی دیكە شایستەی ئەوەن هەڵەو كەم و كوڕییان هەبێ، وە ڕەخنەیان لێ بگیرێ، بەڵام زۆر جار ئەهلی گڵ، ڕەخنە لە ئەهلی دڵ دەگرن، بە هاندەرو غەرەزی دنیایی، یان لەبەر ئەوەی لەگەڵ بەرژەوەندیی ئەواندا نایەنەوە، ڕەخنەیان لێ دەگرن، ئنجا لێرەدایە خوا سبحانە و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ﴿٥٤﴾ ﴾ المائدة

یەكێ لە نیشانەكای دۆستانی خوا، ئەوەیە كە لەلۆمەی لۆمەكاران ناترسێن، لەكاتێكدا ڕەزامەندیی خوا لەشتێك دابێ، دەیكەن، بێ ئەوەی گوێ بدەنە سەركۆنەی سەركۆنەكەران و ڕەخنەی ناشەرعییان.

## ٧- هەڵبژاردنی دواڕۆژ بەسەر دنیادا:

ئەوەش دیسان هەر پەیوەندیی بەوەی پێشەوە هەیە، ئەوە كە ئینسان دواڕۆژ هەڵبژێرێ بەسەر دنیاداو، كاتێ كە بەرژەوەندییەكی دنیایی لەگەڵ

بەرژەوەندییەكی دوارۆژدا تێكبگیرێ، زۆر بەئاسانیی بەرژەوەندییەكەی دوارۆژ زاڵ بكات، وە ئامانجی ئەوەبێ كە لەدوارۆژدا خوای پەروەردگار لێی ڕازی بێ و، ڕەزامەندیی خوا وەدەست بێنێ، نەك ڕەزامەندیی خەڵكی دنیا، لەكاتێكدا كە ڕەزامەندییەكە لەگەڵ تووڕەیی خوادا تێك بگیرێ، یاخود ببێتە هۆی تووڕە بوون و سزای خوا، دەبێ گوێ نەداتە ڕازی بوونی خەڵكێك، كە لێی ڕازی نابن، تاكو خوا لەخۆی تووڕە نەكا!.

## ٨- بەزەیی و پەرۆشی بەرانبەر بە خەڵك بەگشتی:

یەكی دیكە لە بەرهەمەكانی تەزكیە بوونی نەفس، ئەوەیە كە مرۆڤ بەزەیی بەخەڵكدا بێ و دڵی گەورەبێ بەرانبەریان و بەتەنگیانەوە بێ، پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، وابوون، دۆستانی خوا هەمیشە وابوون، بەنەفسەوە مامەڵەیان لەگەڵ خەڵكدا نەكردوە، وەك عەبدولقادری گەیلانیی ڕەحمەتی خوای لێبێ، گوتوویەتی: (كُن مَعَ الحَقِّ بِلا خَلْق، وَمَعَ الخَلْقِ بِلا نَفْس)، لەگەڵ خوادابە بەبێ خەڵك، وەلەگەڵ خەڵكدابە بەبێ نەفس.

بەڵێ، بۆخوا صوڵحاوان بەنەفس و سیفەتە بەدەكانی وەك: خۆ بەزلگریی و كینەو حەسەدو بوغزو ...هتد مامەڵەیان لەگەڵ خەڵكدا نەكردوە، بەڵكو بۆیان بەڕەحم و بەسۆزو پەرۆش بوون.

## ٩- دۆستایەتیی گرتن لەبەر خوا، وە دوژمنایەتیی كردن لەبەر خوا:

یەكێكی دیكە لە نیشانەكانی تەزكیە بوونی نەفس، بریتیە لە خۆشویستن و دۆستایەتیی كردن لەبەر خوا، وە وژمنایەتیی و ڕق لێبوونەوە لەبەر خوا، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دەفەرموێ:

(مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ، فَقَدْ اسْتَكْمَلَ الْإِيمَانَ) رواه أبو داود برقم: (٤٦٨٣) قال الألباني: صحيح.

هەر كەسێ لەبەر خوا خەڵكی خۆش بوێ و، لەبەر خوا ڕقی لێیان هەڵسێ، وە لەبەر خوا پێیان ببەخشێ (ئەگەر پێویستی كرد)، وە لەبەر خوا پێیان نەبەخشێ، ئەوە ئیمانی تەواو كردوە.

هەروەها لەفەرمایشتێكی دیكەدا هاتوە دەفەرموێ:

(أوثق عرى الإيمان: الموالاة في الله والمعاداة في الله، والحب في الله، والبغض في الله)، أخرجه الطبراني برقم: (١١٥٣٧)، وأخرجه أيضا: البيهقي في شعب الإيمان برقم (٩٥١٣).

واتە: پتەوترین گرێ و قوڵفەی ئیمان، بریتیە لە: دۆستایەتیی كردن و دوژمنایەتیی كردن لەبەر خوا، وە خۆشویستن و ڕق لێبوونەوە لەبەر خوا.

## ١٠- خەڵوەو تەنیایی و ڕازو نیاز پێ خۆش بوون، لەكاتی تەنیاییدا:

ئەوە كە ئینسان ئەگەر دەرفەتی هەبێ، كاتێ كە بەتەنیا دەبێ، جا چ كاتێك شەونوێژ دەكا، یاخود لە شوێنێكدا بەتەنیایە، یاخود لە شوێنێكی چۆڵە، پێی خۆشبێ و لەزەتی لێ بكا، ئەمیش نیشانەیەكی دیكەی تەزكیە بوونی نەفسە، هەندێ كەس سەعاتێ لەژوورێكی تاریكدا، یان لە شوێنێكی چۆڵ، دایبنێ، دڵی سەغڵەت دەبێ و هەست دەكا تەنیایە، بەڵام دۆستانی خوا، كاتێ كە لەخەڵك دوور دەبن، ئەگەر پێویستیی كرد، وەك چوونە ئیعتیكاف و خەڵوە، یاخود لەكاتی شەونوێژدا، یان كاتێ كە لە شوێنێكی چۆڵن، لەززەتی لێ دەكەن، چونكە لەگەڵ ئەو زاتەدان كە لە هەموو كەس و لە هەموو شتێ لە لایان بەرزترو بەڕێزترو خۆشەویستترو شیرینترە، وە هەست بە تەنیایی ناكەن، وە نەك هەر دڵیان سەغڵەت نابێ، بگرە هەست بە فەرەحنایی و دڵخۆشیی و شادمانیی دەكەن.

ئەوانەی باسمان كردن، دە نیشانەو دروشم و بەرهەمی ئەو كەسانەن كە گەیشتبنە حاڵەتی نەفس تەزكیە بوون و، لەخوا نزیك كەوتنەوەو، صالح بوون.




# ڕەنگدانەوەی نیشانەکانی تەزکیەی نەفس لە ژیانی هەندێ لە صاڵحاندا

## ١- هەڵوێستێکی ئەبو بەکری صیددیق خوا لێی ڕازی بێ:

کاتێ ئەبو بەکری صیددیق خوا لێی ڕازی بێ، بە خەلیفەی مسوڵمانان هەڵدەبژێررێ، وتارێك پێشکەش دەکا، کە دەبێ بە ئاوی زێڕ بنووسرێ و، بە بناغەی حوکمی ڕەشید دادەنرێ، لە بەشێك لە وتارەکەیدا دەڵێ:

(أيها الناس! فإنِّي قد ولِّيتُ عليكم، ولست بخيركم، فإن أحسنتُ فأَعينوني، وإن أسأت فقوِّموني)[1]. واتە: ئەی خەڵکینە! بەسەرتانەوە کراوم بە سەرپەرشتیار، بەڵام لە ئێوە باشتر نیم، (خۆم لە ئێوە پێ چاکتر نیەو ئێوە داتاننناوم، ئیددیعای ئەوە ناکات بڵێ: من لە ئێوە چاکترم و بە میرات بۆم بەجێماوەو من پێی شایستە ترم) ئەگەر چاکم کرد، هاوکارم بن، وە ئەگەر خراپم کرد ڕاستم بکەنەوە.

کە بێگومان ئەو قسەو هەڵوێستانە لە نەفسێکی خاوەن تەزکیەی تەواوەوە نەبێ، نایەنە دەر، بەتایبەت لەو مەقامەدا کە کراوە بە جێنشینی یەکەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و بەو شێوەیەش قسە دەکا، بێگومان ئەوە نیشانەی نەفسێکی یەکجار موزەککایە، دیارە ئەبو بەکری صددیق خوا لێی ڕازی بێ، لووتکەی صیددیقانە.

................................

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٤، ص٣٩٣.

## ٢- هەڵوێستێکی عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ:

دوای ئەوەی (أبو لؤلؤة)ی مەجووسیی زامداری دەکاو، لە حاڵەتی مەرگدا دەبێ، یەکێ پێشنیاری بۆ دەکا دەڵێ: ئەی ئەمیری ئیمانداران! بۆچی عەبدوڵڵای کوڕت ڕاناسپێری کە لەدوای تۆ ببێتە جێنشین؟ ئەویش دەڵێ: (سوێند بەخوا مەبەستت لەو قسەیە بەرژەوەندیی مسوڵمانان و ڕەزامەندیی خوا نەبوو، دوایی دەڵێ: بۆ ئالی عومەر بەسە یەکێکیان موحاسەبە بکرێ، لەسەر ئەوەی سەرپەرشتیاری مسوڵمانان بووە، نابێ ببێتە دوو)[1]، لەو کاتەدا کە ئەو پیاوە ماستاوی بۆ دەکا، عومەر ئاوای وەڵام دەداتەوە، دیارە هەڵوێستەکان زۆرن بەڵام من هەر کەسە نموونەیەکم بۆ هێناونەتەوە.

هەڵبەتە ئەو هەڵوێستەش نەك هەر نیشانەی تەزکیە بوونی نەفسە، بەڵکو تەقواو تەزکیەی لێ دەچۆڕێ!

## ٣- هەڵوێستێکی عوسمانی کوڕی عەففان خوا لێی ڕازی بێ:

کاتێ ئاژاوە گێڕەکان دەوری ماڵ و خانووەکەی دەگرن، کۆمەڵێ لە هاوەڵان لە نێویاندا حەسەن و حوسەین و موحەممەد کوڕانی عەلی خوا لێیان ڕازی بێ، دەچنە لای دەڵێن: هاتووین بەرگرییت لێ بکەین، عوسمان خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: (ئامادە نیم لەسەر من بەقەد قوچکەیەك (ئەوەی کە ئافرەت بە پەنجەیەوە دەکات، لە کاتی شت دووریندا)، خوێنی مسوڵمانێك بڕژێ، بەهۆی ئەوەوە کە بەرگرییم لێ دەکەن)[2] بێگومان ئەو هەڵوێستەش لە نەفسێکی زۆر پاك و چاك نەبێ، نایەتە دی، تۆ دەورت بگرن و بزانی ئەوە بۆ کوشتنتە، وە خەڵکیش هەبێ بەرگرییت لێ بکا، بەڵام بڵێی: با خوێن لەسەر من نەڕژێ، ئەوە گەورەییەو نیشانەی نەفس چاکیی و مەعدەن پاکییە.

..............................

(١) تأريخ الإسلام السياسي.. حسن إبراهيم حسن، ج١ ص٢٥٤.

(٢) البداية والنهاية، لابن كثير ج٧ ص٢١١، و (تأريخ دمشق) لابن عساكر ص ٤٠٣.

## ٤- هەڵوێستێكی عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب خوا لێی ڕازی بێ:

لە یەكێ لە قسەكانیدا دەڵێ (لو كُشِف الحجابُ ما ازددتُ يقيناً)(١)، یانی ئەگەر پەردە لابچێ، یەقینم زیاد ناكا، واتە: ئەگەر پەردە لابچێ و بەچاوی سەر خوای پەروەردگار ببینم، یەقینم وەك خۆیەتی و زیاد ناكا، مانای وایە لە لووتكەی یەقین دابووە، كەواتە: خاوەن نەفسێكی زۆر پاك و چاك بووە.

## ٥- هەڵوێستێكی دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ:

دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دوای ئەوەی بوختانی پێ دەكرێ، پاشان ئایەت دێنە خوارێ و، خوای پەروەردگار بەرگریی لێ دەكا، دەڵێ: (نەفسی خۆم لەوە پێ بچووكترو كەم بایەخ تر بوو، كە خوای عز وجل لەبارەی منەوە، ئایەت بنێرێتە خوارێ و، تاكو قیامەت بخوێنرێنەوە، ئومێدم ئەوە بوو كە خوا تبارك و تعالی بە خەون شتێ پێشانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بدات)(٢)، ئاوا خۆی لەلا كەم بووە، بۆیە لەلای خوا زۆر بووە، خوا لەو دایكە بەڕێزەمان (صديقة بنت الصديق) ڕازی بێ و ڕازیشی بكات.

........................................

(١) زۆر گەڕام لە (نهج البلاغە)دا نەمبینی، بەڵام ئەم تەعبیرەم بینی: (ما شككت في الحق مذ أريته) نهج البلاغة، ص٥٥٦، باب المختار من حكم أمير المؤمنين ومواعظة. بەڵام دوایی لە (تفسير القران الحكيم)ی (محمد رشيد رضا) ج٩ ص ، دا دۆزیمەوە.

(٢) ئەمە دەقی قسەكەیەتی: (وَلَشَأْنِي كَانَ أَحْقَرَ فِي نَفْسِي مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى)رواه أحمد والبخاري ومسلم وغيرهم.

## ٦- هەڵوێستێکی شـێخ عـەبدولقـادری گـەیلانیی ڕەحمەتی خوای لێبێ:

جارێكیان وتاری دەداو خەلیفەی عەبباسیش لە مزگەوت دانیشتبوو، پاشان یەكێ گوتی: ئەی شێخ عەبدولقادر! كە تۆ وتارت دەدا، خەلیفە دانیشتبوو، شەرمت لێ نەكرد؟

گوتی: (نەخێر، كاتێك گەورەیی و عەزەمەتی خوام هێنایە بەرچاوی خۆم، خەلیفە هەر بەقەدەر پشیلەیەك دیاربوو لەبەر چاوم)[1]، بەڵێ! هەركەسێ خوای لەلا گەورە بێ، بە دڵنیاییەوە خەڵكی خوای لەلا بچووك دەبێتەوە، لەو ڕووەوە كە شەرمیان لێ بكاو، لێیان بترسێ و لەبەروان هەق نەڵێ.

........................................

(١) بڕوانە: زانایانی ئیسلام كێن و چۆنن؟ لاپەڕە (٢٣٢) چاپی سێیەم.




# چەند وتەیەكی بەپێزی ئیبن و عەتائوڵڵای سكەندەریی، دەربارەی تەزكیەی نەفس

ئێمە هەوڵ دەدەین لەم باسەدا چەند قسەیەكی بەپێزی ئیبن و عەتائوڵڵای سكەندەریی بێنین، دەربارەی تەزكیەی نەفس، ئەو زانا پایە بەرزە چەند قسەیەكی نەستەقی هەن، لەو بارەوە قسەكانی مەشهوورن بە: (الحكم العطائية)، ئنجا من (٥٠) پەنجا قسەم لەنێو حیكمەتەكانیدا گوڵبژێر كردوون:

١- (لا يكُنْ تَأخُّرُ أَمَد العَطاء مَعَ الإلْحاح في الدّعَاءِ موجباً ليأسِك، فهو ضَمِنَ لَكَ الإجابَةَ فيما يختارُهُ لكَ، لا فيما تختاره لنَفْسكَ، وفي الوقْتِ الذي يريدُ، لا في الوقْت الذي تُريدُ).

واتە: با دواكەوتنی كاتی بەخشین (واتە: بەخشینی خوا)، لەگەڵ ئەوەشدا كە تۆ بە جەختكردنەوە دەپاڕێیەوەو سووری لەسەر پاڕانەوە، نەبێتە هۆی نائومێدییت، چونكە خوا سبحانە و تعالی گرەنتیی داوە وەڵامت بداتەوە، لەوەدا كە خۆی بۆت هەڵدەبژێرێ، نەك لەوەدا كە تۆ هەڵیدەبژێری، وە لەو كاتەدا كە خۆی دەیەوێ، نەك لەو كاتەدا كە تۆ دەتەوێ.

بەڕاستی حیكمەتەكانی شایستەن بە ئاوی زێڕ بنووسرێن، واتە: كە دوعاكەت یەكسەر قەبووڵ نابێت، با نەبێتە هۆی نائومێدییت، وە دەست هەڵمەگرە لە پاڕانەوە، چونكە خوا بۆ خۆی دەزانێ چیت بۆ دەكاو، كەی بۆت دەكا؟ وە مەرج نیە ئەوەی تۆ دەتەوێ و، لەو كاتەدا كە دەتەوێ، بۆتۆ واباش بێ.

٢- (الأعمالُ صُوَرٌ قائمةٌ، وأرواحُها وجودُ سِرِّ الإخلاص فِيهَا).

واتە: كردەوەكان چەند دیمەنێكی بەرچاوو ڕاوەستاون، بەڵام ڕووحی كردەوەكان، بریتیە لە بوونی نهێنیی ئیخلاص لەو كردەوانەدا.

واتە: كردەوەكان كەلەشێكن، ڕووحەكەیان بریتیە لەو ئیخلاص و خوا پێ مەبەست بوونە، كە بۆتە هاندەرو پاڵنەر، بۆ ئەنجامدانیان.

٣- (إِدْفِنْ وجودَك في أرضِ الخمولِ، فما نَبَتَ مما لم يُدْفَنْ، لا يَتِمُّ نَتَاجُه، ما نَفَعَ القلبَ مثلُ عُزْلَةٍ يدخلُ بها مَيْدَانَ فكرة).

واتە: بوونی خۆت لەسەر زەمینی كەنارگیرییدا بشارەوە، چونكە دانەوێڵەیەك لەژێر زەویدا نەشاردرابێتەوە، سەوز نابێ (یاخود بەرهەم دار نابێ) وەهیچ شتێ سوود بەدڵ ناگەیەنێ، وەك كەنارگیرییەك كە پێی دەچێتە مەیدانی بیركردنەوەو تێوەڕامانەوە.

لێرەدا دیارە پێداگیریی دەكات لەسەر خەڵوەو بیركردنەوەو، جار جار خۆ دوورگرتنی ئینسان لە خەڵك، وە ڕازو نیاز كردن لەگەڵ خواداو بیركردنەوە لەدین و ژین و، لە دنیاو دواڕۆژ.

٤- (كيف يُشْرِقُ قَلْبٌ صُوَرُ الأكوانِ مُنْطَبِعَةٌ في مرآته؟ أَمْ كيف يرحلُ إلى الله وهو مكَبَّلٌ بشَهواته؟ أم كيف يطمع أن يدخل حضرةَ الله، وهو لم يتطهَّر من جَنَابَةِ غَفَلاتِهِ؟ أم كيف يرجو أن يفهم دقائقَ الأَسرارِ، وهو لم يَتُبْ من هَفَواتِهِ؟).

واتە: دڵێك چۆن ڕۆشن دەبێتەوە، كە وێنەی شتەكان لە ئاوێنەكەیدا دەرچووە؟ یان چۆن بەرەو خوا دەچێ، لە كاتێكدا بە ئارەزووەكانی دەست و پێی بەستراون؟، یان چۆن دەچێتە خزمەت خوا، لەكاتێكدا كە لە لەشپیسیی بێ ئاگایی، خۆی پاك نەكردۆتەوە؟ یان چۆن دەیەوێ لە وردەكاریی نهێنییەكانی بەندایەتیی بۆخوا كردن و شەریعەت حاڵی بێ، لە كاتێكدا كە لەوردە هەڵەكان پەشیمان نەبۆتەوەو نەگەڕاوەتەوە؟.

كەواتە: كاتێ ئینسان لەخوا نزیك دەبێتەوەو شایستەی ئەوە دەبێ كە بەندایەتی بۆخوا بكا، كە خاوەنی عەقڵێك و دڵێكی هۆشیارو بێ دارو پاك و خاوێن بێ.

٥- ((إحالَتك الأَعْمالَ عَلى وجودِ الفَراغِ مِن رُعوناتِ النَّفس).
واتە: ئەگەر كردەوەكان حەواڵەی كاتێك بكەی، كە دەستت بەتاڵ بێ، ئەوە لە نەفامییەكانی نەفسەوەیە.

نەفس بەهۆی نەفامییەوە، هەمیشە: لەمەودوا (تسویف) بە ئینسان دەكا، پێت دەڵێ: با كاتێكت دەستكەوێ دەستت بەتاڵ بێ، ئنجا پەرستشەكان بكە، بۆ وێنە پێت دەڵێ: دوایی قورئان بخوێنە، یان دەڵێ: كە دەستت بەتاڵ بوو، ئنجا خۆت شارەزای شەریعەت بكە، ئنجا حەج بكە ...هتد، ئەوە لە نەفامیی نەفسە، كە تۆ حەواڵەی دەست بەتاڵیی و بێ ئیشیی دەكا، چونكە تۆ هیچ كاتێك دەست بەتاڵ و بێ ئیش نابی، ناشزانی داخۆ دەگەیە ئەو حاڵەتە یان نا؟.

٦- (طَلَبُك مِنهُ، اتِّهامٌ لَه، وَطلَبُك لهُ، غَيْبة مِنكَ عَنهُ، وَطَلَبُك لِغَيرِهِ، لِقِلَّةِ حَيائِكَ مِنهُ، وَطَلَبُك مِن غَيْرِهِ، لِوجودِ بُعْدكَ عَنهُ).
واتە: داواكردنی تۆ بۆ خوا، بریتیە لە تۆمەتباركردنی تۆ بۆ ئەو، (داواكردنت لەخوا، یانی شتێكی لێ داوا بكەی، مانای وایە تۆ ئەو تۆمەتبار دەكەی كە ئاگای لەتۆ نیە) ئەگەر تۆ داوای خوا بكەی مانا وایە تۆ لەو دووری بۆیە داوای دەكەی، وە داواكردنی تۆ بۆ غەیری خوا، لەبەر ئەوەیە كە تۆ كەم شەرم لەخوا دەكەی (پێت وایە غەیری خوا لەگەڵ تۆ بەرەحم ترە)، بەڵام ئەگەر لە غەیری خوا داوا بكەی، مانا وایە تۆ لە خوا دووری، بۆیە لە غەیری خوا داوا دەكەی.

هەڵبەتە من تێبینییم هەیە لەسەر هەندێ لەو قسانەی، چونكە پاڕانەوە لەخوا، عادەتی پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێبێ، چونكە خودی پاڕانەوە لەخوا عیبادەتە، جاری وا هەیە دوعاكە بۆ پەرستنە، جاری وا هەیە دوعای داوا كردنە، مەرجیش نیە هەموو جارێ داواكردن بێ، بەڵام ئەگەر داواشی لێ

بکەی، پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ داوایان لەخوا کردوە، مەگەر قسەکەی بەوە تەئویل بکرێ، بگوترێ: داواکردنی تۆ لە خواو پێشت وابێ کە خوا ئاگای لەتۆ نیە، ئەو کاتە دیارە هەر لە شیرك و کوفریش نزیك دەبێتەوە، مەگەر بەشێوەیەکی ئاوا پینە بکرێ، ئەگەرنا من ئەو قسەیەم بەرەهایی پێ چاك نیە.

٧- (ما مِن نَفَسٍ تبديهِ، إلاّ وَلهُ قَدَرٌ فيك يُمْضيهِ).

واتە: هەر هەناسەیەك تۆ دەیدەیەوە، بێگومان خوا قەدەرێکی هەیە، بڕیارێکی هەیە لەتۆدا کە جێبەجێی دەکا.

یانی: خوا سبحانه و تعالی هیچ کاتێ لەتۆ بێ ئاگا نیە، وە لەگەڵ هەموو هەناسەیەکی تۆدا، خوای میهرەبان ئاگای لەتۆیەو، بڕیارێکی جێ بەجێ دەکا.

٨- (لا تستغرب وقوع الأكدار، ما دمت في هذه الدار، فإنها ما أبرزت إلا ما هو مستحق وصفها وواجب نعتها).

واتە: تۆ بەدووری مەزانەو پێت سەیر نەبێ، نەخۆشیی و ناخۆشیی و نارەحەتییەکانت بەسەر بێن، هەتا لەم ژیانە دنیاییەدا بی، چونکە ئەم ژیانە دنیاییە هەر ئەوەی دەرخستوە، کە شایستەیەتی و سیفەتی خۆیەتی.

یانی ئەم ژیانە دنیاییە شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیە، لە تاقیکردنەوەشدا بێگومان ئینسان خۆشیی و ناخۆشیی و تاڵیی و شیرینیی و، هەورازو نشێوی دێنە پێش.

٩- (شَتّان بين مَنْ يَسْتَدِلُّ به أو يَسْتَدِلُّ عليه، المُسْتَدِلُّ به، عَرَف الحق لأهله، وأثبت الأمر من وجود أصله، والإستدلال عليه من عدم الوصول إليه، وإلاّ فمتى غاب، حتى يُسْتَدَلَّ عليه؟ ومتى بَعُدَ، حتى تكون الآثار هي التي توصل إليه؟).

واتە: دووکەس زۆر لەیەك جیان: کە یەکیان خوای پەروەردگار دەکاتە بەڵگە لەسەر دروستکراوەکان، وە ئەوی دیکە کە دروستکراوەکان دەکاتە بەڵگە لەسەر خوا، ئەوەی کە خوا دەکاتە بەڵگە (لەسەر دروستکراوەکان لەبەر ئەوەی کە

هەر تەنها خوا خاوەنی بوونی سەربەخۆیەو، دروستكراوەكان هەموویان بوونێكی سێبەرییان هەیە، بوونێكی زاتییان نیەو خوا بوونی پێداون، وە بۆ كاتێكی دیاریی كراو بوونی پێداون، هەر كات بوونەكەی لێستاندنەوە، دەبنەوە بە هیچ، بەڵام خوا بوونەكەی زاتییەو بەردەوامە، ئنجا ئەو كەسەی كە خوا دەكاتە بەڵگە لەسەر دروستكراوەكان)، ئەوە كەسێكە، مافی خاوەن مافی ناسیوەو زانیوەو، بوونی شتەكانی بەهۆی ئەسڵەكەیانەوە، چەسپاندوە، وە ئەو كەسەی كە دروستكراوەكان دەكاتە بەڵگە لەسەر بوونی خوا، لەبەر ئەوەیە كە جارێ نەگەیشتوە بەخوا سبحانە و تعالى و چاك نەیناسیوە، ئەگەرنا كەی خوا نادیار بووە، تاكو بەڵگەی لەسەر بهێنرێتەوە؟ یاخود كەی دوور بووە، تاكو شوێنەوارەكان بمانگەیەنن بەو؟

١٠- (تشوُّفك إلى ما بطن فيك من العيوب، خيرٌ من تشوُّفك إلى ما حُجِبَ عنك من الغيوب).

واتە: ئەگەر تۆ چاو بگێڕی لەو كەم و كوڕییانەی كە تێتدا شێردراونەتەوە، باشترە لەوەی چاو بگێڕی بۆ ئەو شتە نادیارانەی كە لێت شێردراونەتەوە.

واتە: ئەگەر تۆ بەدوای ئەوەدا بگەڕێی كە عەیب و كەم و كوڕییەكانی خۆت بدۆزیەوە لە خۆتدا، باشترە لەوەی بگەڕێی بەدوای پەنهانەكاندا و، بتەوێ ئەو شتانەی كە لەدەرەوەی خۆتدان، بیاندۆزیەوە.

١١- (الحق ليس بمحجوب، وإنما المحجوب أنت عن النظر، إذ لو حَجَبه شيءٌ لستره، ما حَجَبه، ولو كان له ساتر، لكان لوجوده حاصر، وكل حاصر لشيء فهو له قاهر. {وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ }(الأنعام).

واتە: خوا سبحانە و تعالى {كە لێرەدا وشەی (حق)ی بۆ بەكار دێنێ}، پەردە پۆش نەكراوە، بەڵام پەردە پۆش تۆی، لەوەی كە تەماشای بكەی و بیبینی، چونكە ئەگەر هیچ شتێك خوای شاردبایەوە، ئەو شتە بۆی دەبوو بە پۆشەر، وە بۆ بوونی خوا دەبوو بە كورتهەڵێنەر، ئنجا هەر شتێكیش بوونی شتێك كورت هەڵهێنێ و دەورەی بدا، مانای وایە بەسەریدا زاڵە، لە حاڵێكدا خوا خۆی وا

وەسف كردوە، دەفەرمویٚ: (وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ)الأنعام). واتە: خوا باڵا دەست و مل پیٚ كەچكەرە بەسەر بەندەكانییەوە. یانی: هیچ شتیٚك ناتوانیٚ خوا بپۆشیٚ، بەڵام ئەوە تۆی، پیٚت وایە خوای پەروەردگار نابینی.

١٢- (أَخرِجْ من أوصافِ بَشَريَّتك، كلَّ وصفٍ منافٍ لعبوديتك، لتكون لنداء الحق مجيباً ومن حضرته قريباً).

واتە: ئەو سیفەتە بەشەرییانە لەخۆت دەرباویٚ، كە پیٚچەوانەن لەگەڵ بەندایەتییدا بۆ خوا، تاكو هەمیشە وەڵامدەرەوەی بانگی هەق بی، وە هەمیشە لە خزمەت خوای حەق نیزیك بی.

واتە: تۆ بەهۆی ئەو سیفەتانەتەوە كە پیٚچەوانەی بەندایەتییتن بۆ خوا، لە خوا دوور دەبی، وە تەنبەڵ و تەوەزەل دەبی لە وەڵامدانەوەی فەرمانەكانیدا، بەڵام ئەگەر بیٚت و ئەو سیفەتانە واز لیٚبیٚنی و، خۆت پاك و چاك بكەی، ئەو كاتە هەمیشە دەست لەسەر سنگ و لەخزمەتدا دەبی، بۆ وەڵامدانەوەی داواكارییەكانی خوا.

١٣- (لا ترفعنَّ إلى غيره حاجةً هو مُورِدُها عليك، فكيف يَرْفَعُ غيرُه، ما كان هو له واضعاً؟ من لا يستطيع أن يرفع حاجةً عن نفسه، فكيف يستطيع أن يكون لها عن غيره رافعاً؟).

واتە: هیچ پیٚویستییەكی خۆت كە خوا بۆتی هیٚناوەتە دی (بۆ ویٚنە: نەخۆش دەبی، یان تووشی نارەحەتیی دەبی)، بۆ لای جگە لە خوا بەرزی مەكەوە، چونكە جگە لەخوا چۆن دەتوانیٚ پیٚویستییەك لەتۆ لابەریٚ، كە خوا دایناوە؟ (واتە: شتیٚك كە خوا بەسەر تۆی هیٚناوە جگە لە خوا، لەتۆ لاناچیٚ)، كەسیٚ كە نەتوانیٚ پیٚویستیی خۆی جیٚ بەجیٚ بكا، بیٚگومان ناتوانیٚ پیٚویستی جگە لە خۆی جیٚبەجیٚ بكا، {وەك گوتراوە: (من لا يكون لنفسه فكيف يكون لغيره؟!)}، كەسیٚ بەكەڵكی خۆی نەیەت، چۆن بەكەڵكی جگە لە خۆی دیٚ؟! كەواتە: پیٚداویستییەكانی خۆت بۆ لای كەسیٚ بەرز بكەوە كە بیٚنیازە، وە خاوەنی هەموو

شتێكەو هەر ئەویش تۆی تووشی ئەو پێویستییانە كردوە، نەك پێویستییەكانی خۆت ببەی بۆ لای كەسێك، كە ئەویش وەك تۆ ئاتاجەو هیچی لەدەست نایەت.

١٤- (لا تَرْحَل من كونٍ إلى كون، فتكون كحمار الرَّحى يسير والذي ارتحل إليه هو الذي ارتحل منه، ولكن ارحلْ من الأكوانِ إلى المكوِّن {وَأَنَّ إِلَى رَبِّكَ الْمُنْتَهَى} النجم).

واتە: لەدروستكراوێكەوە بۆ لای دروستكراوێكی دیكە مەچۆ، كە سەرەنجام وەك گوێدرێژی ناعوورت لێبێ، (كە كۆمەڵێك دۆڵچەی پێوە كراون، بەدەوری ناعووردا دەخولێتەوە) ئەو شوێنەی كە بۆی دەچێ، هەر ئەو شوێنەیە كە پێشتر لێی بووە، (واتە: لەشوێنی خۆیدا دەخولێتەوە، ئاوا مەبە)، بەڵكو لە دروستكراوەكانەوە، یەكسەر برۆ بۆ دروستكەر، چونكە خوا دەفەرموێ: (وَأَنَّ إِلَى رَبِّكَ الْمُنْتَهَى). واتە: بێگومان كۆتایی و سەرەنجام بۆ لای پەروەردگارتە.

١٥- (حسن الأعمال نتائج حسن الأحوال).
واتە: كردەوە باشەكان بەرهەمی حاڵەتە باشەكانن. یانی: حاڵی دڵت باش بێ، كردەوەی ئەندامەكانت باش دەبێ.

١٦- (من علامات موت القلب، عَدَمُ الحُزْن على ما فاتك من الموافقات، وترك الندم على ما فعلته من وجود الزلاّت).

واتە: لە نیشانەكانی مردنی دڵ ئەوەیە، كە دڵ تەنگ نەبی بەوەی كە كردەوەی چاكت لەدەست چوون، وە واز لە پەشێمان بوونەوە بێنی، لەسەر ئەوە كە گوناهو هەڵەت كردوون.
واتە: دەبێ پەشێمان بی، لەسەر گوناهو هەڵەكانت، وە ماتەمینی دابگری، لەسەر لەدەست چوونی كردەوە چاكەكانت، ئەگەر بتەوێ خاوەن دڵێكی زیندوو بی.

١٧- (لا يَعْظُمُ الذَّنْبُ عندك، عَظَمةً، تَصُدُّك عن حسن الظن بالله تعالى، فإن من عرف ربه استصغر في جَنْبِ كَرَمِهِ ذَنْبَه، لا صغيرةَ إذا قابلك عَدْلُهُ، ولا كبيرةَ إذا واجهك فَضْلَهُ).

واتە: با گوناح لەلات ئەوەندە مەزن نەبێ، كە بتگێڕێتەوە لەوەی گومانی چاك بەخوا ببەی، چونكە هەر كەسێ پەروەردگاری خۆی بناسێ، گوناهی خۆی لەبەرانبەر بەخششی خوادا لەلا بچووك دەبێتەوە، وە ئەگەر خوا بە دادگەریی خۆی لەگەڵت ڕوو بەڕوو ببێتەوە، هیچ گوناهێكت گچكە نیە، وە ئەگەر بەبەخششی لەگەڵت مامەڵە بكا، هیچ گوناهێكت گەورە نیە.
یانی: ئەگەر لێت خۆش بێ، گوناهی گەورەش بچووك دەبێتەوە، بەڵكو لەبەین دەچێ.

١٨- (لا عَمَلَ أرجى للقبولِ، من عَملٍ يَغِيبُ عنك شهودُهُ، ويُحْتَقرُ عندك وجوده).
واتە: هیچ كردەوەیەك بۆ دڵ، لە كردەوەیەك زیاتر جێی ئومێد نیە، كە تۆ بیكەی و نەیبینی، وە هەمیشە كردەوەكەی خۆت بەكەم ببینی، واتە: نەیبینی كە تۆ كردووتە، وە كە بینیت بەكەمی ببینی، لەبەرانبەر پایەی بەرزی خوادا سبحانە و تعالی.

١٩- (لا تُفْرِحْكَ الطاعَةُ لأَنّها بَرَزَتْ منك، وافرحْ بها لأنّها بَرَزَتْ من الله إليك، {قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ} يونس).
واتە: بە فەرمانبەریی خۆت دڵخۆش مەبە، لەو ڕووەوە كە لەتۆ دەركەوتوە، بەڵكو لەو ڕووەوە پێی دڵخۆش بە، كە لە خواوە بۆت هاتوە، (كە خوا یارمەتی داوی ئەو كردەوەیە ئەنجام بدەی)، وەك خوا دەفەرموێ: (قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ). واتە: بڵێ با بەس بەبەخشش و بەزەیی خوا دڵخۆش بن، ئەوە باشترە لەوەی كە كۆی دەكەنەوە.

٢٠- (أنت حُرٌّ مما أنت عنه آيس، وعبدٌ لما له طامع).
واتە: تۆ هەر شتێك لێی بێ ئومێدبی و بەتەمای نەبی، لەبەرانبەریدا ئازادی، بەڵام هەر شتێك بۆی ئاتاج بی، لەبەرانبەریدا دەبی بەبەندەو كۆیلە.

٢١- (قلّما تكون الواردات الإلهية إلا بغتةً، لئلاّ يدَّعيها العُبَّاد بوجود الإستعداد).
واتە: بەزۆریی وایە واریدە خواییەكان (ئەو شتانەی كە دێنە سەر دڵی ئینسان لە مەعریفەت و حەقیقەت و خورپە باشەكان)، بەزۆریی وایە كت و پڕ دێن، تاكو بەندەكان بانگەشەی ئەوە نەكەن، كە خۆیان ئامادەییان هەبووەو، خۆیان ماندوو كردوەو وەدەستیان هێناون.

هەڵبەتە ئەو شتانەی گوتوونی، هەموویان شتی سەلمێنراون، ڕاستە زۆر جار شتێ بەدڵت دادێ، حەقیقەتێكی ئیمانیی، حەقیقەتێكی ئیسلامیی، حەقیقەتێكی دەروونیی، كە لە دنیاو لەوەی تێیدایە، چاكترە، بێ ئەوەی بۆخۆت هەستت كردبێ.

٢٢- (من وَجَدَ ثَمَرةَ عَمَلِهِ عاجلاً، فهو دليلٌ على وجود القبول آجلاً).
واتە: هەركەسێ بەرهەمی كردەوەكەی بەپەلە ببینێ، (واتە: لە دنیادا ببینێ)، ئەوە نیشانەی ئەوەیە كە لە دواییشدا ئەو كردەوەیەی لێ قەبووڵە.
ڕۆژێك یەكێ لە هاوەڵان لە پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) پرسی: یەكێ لە ئێمە كردەوەی باش دەكا، دوایی خەڵك ستایشی دەكەن و مەدحی دەكەن و پێی هەڵدەڵێن، ئەوە چۆنە؟! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:

(تِلْكَ عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ)، رواه أحمد برقم: (١٥٦) قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط مسلم.

واتە: ئەوە دڵخۆشیی بەپەلەی ئینسانی ئیماندارە، واتە: مادام ئەو كردەوەكەی بۆخوا كردوە، ئنجا ئەگەر خەڵكی مسوڵمانیش پێیان خۆشەو ستایشی دەكەن، ئەوەش بەخششێكی خوایە كە هەر لە دنیادا دەیداتێ، پێش پاداشتی دوا ڕۆژ،

كە بێگومان ئەو كردەوەكەی بۆ خواو بۆ دوا ڕۆژ كردوە، بەڵام ئەگەر لە دنیاشدا خەڵك پێیان خۆش بێ و، ستایشی بكەن، مادام لە ئەصڵدا كردەوەكەی بۆ خوا كردبێ، هیچ زیانی پێ ناگا.

٢٣- (الرجاء ما قارَنَه عَمَلٌ، وإلاّ فهو أُمْنِيَّةٌ).

واتە: ئومێد هەبوون (بە ڕەحمەتی خواو بە پاداشتی خوا) ئەوەیە كە كردەوەی لەگەڵدا بێ، ئەگەرنا هەر بریتیە لە خۆزگە خواستن، (أُمنيّة) ئەوەیە كە ئینسان خۆزگە بخوازێ و پێیخۆش بێ، بەڵام هەوڵ نەدا، بەڵام (رجاءْ) ئەوەیە كە كردەوەی لەگەڵدا بێ.

بۆیە خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢١٨﴾ ﴾ البقرة

واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو، كۆچیان كردوەو، تێكۆشاون لەڕێی خوادا، ئا ئەوانە بە ئومێدی بەزەیی خوان، وە خوا لێبوردەی میهرەبانە.

٢٤- (مطلب العارفين من الله الصدق في العبودية، والقيام بحقوق الربوبية).

واتە: ئەوەی كە خواناسە گەورەكان لە پەروەردگاریان داوا دەكەن، ئەوەیە كە بەڕاستیی بەندایەتیی بۆخوا بكەن، وە مافەكانی پەروەردگارێتیی جێبەجێ بكەن. واتە: هەر ئەوە داوا لەخوا دەكەن، كە یارمەتییان بدا، بەندەی باش و ڕاست و ساغ بن.

٢٥- (العارفون إذا بُسِطوا أخوفُ منهم إذا قُبِضوا، ولا يقف على حدود الأدب في البسط إلا قليل، البسط تأخذ النفس منه حظَّها بوجود الفَرَح، والقَبْضُ لا حظَّ للنفس فيه).

واتە: عاریفەكان، (كە دەڵێ: عاریف واتە: ئەوانەی نەفسیان تەزكیە بووە، ئەوانەی كە دۆستی خوان و زۆر نزیكن لە خوا) كاتێ كە حاڵەتی (بسط)

{واته: دڵخۆشی}یان بۆ دێته پێش، ترسیان زیاتره لەوەی كه حاڵەتی دڵتەنگییان بۆ بێته پێش، چونكه كەمێك نەبێ له خەڵكی لەحاڵەتی دڵخۆشییدا سنوورەكان ناپارێزن، لەبەر ئەوە كه نەفس بەشی هەیه له حاڵەتی كرانەوەو دڵخۆشییدا، بەڵام هیچ بەشی نیه له حاڵەتی تەنگیی و وێكهێنانەوەدا.

٢٦- (ربَّما أعطاك فَمَنَعك، وربما مَنَعَك فأعطاك، متى فَتَحَ لك باب الفَهْم في المنع، عاد المنع عَينَ العطاء).

واته: جاری وا هەیه خوا شتێكت دەداتێ، بەڵام دەبێته هۆی ئەوە كه شتێكت لێ بستێنێ، (شتێكت لێوەربگرێتەوە)، وە جاری وایه شتێكت ناداتێ، بەڵام دەبێته هۆی ئەوەی شتێكی باشترت بداتێ، هەركاتێ خوا دەرگای تێگەیشتنی بۆ كردیەوە: لەوە تێبگەی كه شتێكت ناداتێ، بۆچی ناتداتێ؟، ئەو كاته پێنەدانەكەشت دەبێتەوە به پێدان.

ئەوە قسەیەكی زۆر وردە، وە بێگومان قسەیەكی حەق و ڕاسته: جاری وایه تۆ داوای شتێك له خوا دەكەی، خوا ناتداتێ، بەڵام كه ناتداتێ، زۆر قازانجته، بۆ وێنە: تووشی بەڵایەك دەبی، دەپاڕێیەوە كه خوا ئەو بەڵایەت لەسەر هەڵگری، بەڵام كه بەڵایەكه هەڵنەگیرێ پاداشتێكت دەبێ، یاخود دوایی دەرووێكی خێرت لێ دەكرێتەوە، یاخود دوایی بۆت دەبێ به مایەی خێرێكی زۆر گەورە، كه ئەگەر بەڵایەكەت لێ لابچوایه، ئەو خێرەت نەدەبوو.

٢٧- (الأكوان ظاهرها غِرَّةٌ، وباطنها عِبْرةٌ، فالنفس تنظر إلى ظاهر غِرَّتِها، والقلب ينظر إلى باطن عِبْرَتِها).

واته: دروستكراوەكان ڕواڵەتیان فریو دەرە، بەڵام پەنهانەكەیان جێی پەندو عیبرەته، نەفس سەیری ڕواڵەته فریودەرەكەیان دەكا، بەڵام دڵ سەیری دیوە پەنهانه پەند ئامێزو پەند لێ وەرگرتنەكەیان دەكا.

٢٨- (الطَيُّ الحقيقيُّ أن تُطْوى مسافَة الدنيا عنك، حتى ترى الآخرة أقربَ إليك منك).

زاراوەیەك هەیە لەنێو ئەهلی تەصەووفدا كە دەڵێ: دۆستانی خوا جاری واهەیە ڕێیان بۆ دەپێچرێتەوە، ڕێی دووریان بۆ نزیك دەبێتەوە، پێی دەگوترێ: (طَيُّ المسافات)، ئنجا دەڵێ: ڕێپێچرانەوەی حەقیقیی ئەوەیە كە ماوەی دنیا بۆتۆ بپێچرێتەوە، تاكو دوارۆژ لەخۆت نزیكتر ببینی، واتە: كە تۆ خۆت لەخۆت زۆر نزیكی، دوارۆژ لەخۆت نزیكتر ببینی، ئەگەر ئاوا دوارۆژت بینی بە نزیكیی، ئەوە مانای وایە تۆ مەسافەو ڕێگات بۆ پێچراوەتەوە.

٢٩- (جلَّ ربُّنا أن يعامِلَه العبد نَقْداً فيجازِيَهُ نسيئةً، كفى من جزائه إياك على الطاعة أن رضيك لها أهلاً، كفى العاملين جزاءً ما هو فاتِحُهُ على قلوبهم في طاعته، وما هو مُورِدهُ عليهم من وجود مؤانَسَتِهِ).

واتە: پەروەردگارمان زۆر لەوە بەرزترە كە بەندە بە نەقد (واتە: بە شتێكی ئامادە) مامەڵە لەگەڵ خوادا بكا، بەڵام خوا بەقەرز پاداشتی بداتەوە، (ئەدی پاداشتی ئێستای خوا چیە لەسەر كردەوەكانمان؟)

دەڵێ: ئەوەندەت بەسە لە پاداشت دانەوەت لەسەر فەرمانبەرییت بۆی، كە خوا ڕازی بووە، كە تۆ فەرمانبەریی بۆ بكەی، وە ئەو بەخششە خوا بەسە بۆ ئەو كەسانەی كە فەرمانبەریی بۆ خوا دەكەن، نیەتی كردەوە باشەكانی خستۆتە دڵیانەوە، وە لەئەنجامی كردەوە باشەكاندا هەست دەكەن بە نیزیكییان لە خوا لەو كاتەدا، كە لە خزمەت خوادان (ئەوە پاداشتێكی نزیكی دنیاییانە، وە پاداشتێكی حازر بەدەستە، پێش پاداشتی قیامەت).

٣٠- (متى أعطاك أَشْهَدَكَ بِرَّهُ، ومتى مَنَعَك أشْهَدَك قَهْرَه، فهو في كلِّ ذلك متعرِّفٌ عليك ومُقْبِلٌ بوجود لطفه عليك، إنما يُؤْلِمُكَ المَنْعُ لعدم فَهْمِك عن الله فيه).

واتە: هەركاتێ خوا بەتۆ ببەخشێ، ئەوە چاكەكاریی خۆی پێشانی تۆ داوە، وە هەركاتێ نەتداتێ، ئەوە دەستەڵاتی خۆی پێشانت داوە، كەواتە: لە هەموو

حالاًندا خوای پەروەردگار خۆی بەتۆ دەناسێنێ، وە لوتفی خۆی پێشانی تۆ دەدا، بەڵام کە خوا شتێکت ناداتێ وەختێ تۆ ئازاری پێ دەچێژی، کە تۆ تێنەگەی کە خوا بۆچی ناتداتێ؟ {کە ناشتداتێ، لەبەر بەرژەوەندیی خۆتە، ئەگەرنا لەبەر ئەوە نیە کە خوا چرووکیی بکا، چونکە کەرەم و بەخششی خوا سنووری نیە}.

٣١- (ربما فتح لك باب الطاعة، وما فتح لك باب القبول، وربما قضى عليك بالذنب فكان سبباً في الوصول، معصية أورثت ذلاً وافتقاراً، خير من طاعة أورثت عزاً واستكباراً).

واتە: جاری وایە خوا دەرگای فەرمانبەرییەکت بۆ دەکاتەوە، بەڵام دەرگای قەبووڵی لێ نەکردوویەوە، لێت قەبووڵ ناکا، (واتە: لەخۆت بایی مەبە بە کردەوەی باشت)، وە جاری وا هەیە خوا گوناهێکی لەسەرتۆ بڕیار داوە، بەڵام ئەو گوناهە بۆتە هۆی ئەوەی کە تۆ بگەیە خوا، (بەهۆی گوناهەکەتەوە هێندە تەوبە دەکەی، هەتا لەلای خوا قەبووڵ دەبی و، دەگەی بە ڕەزامەندیی خوا)، گوناهێك وات لێبکا، خۆت بەرانبەر خوا پێ گەردن کەچ و ئاتاج بێ، باشترە لە فەرمانبەرییەك وات لێ بکا، عیززەتت پەیدا بێ و وات لێبکا خۆت بە زل بگریی.

کەواتە: گوناهو تاعەت عیبرەتەکەیان ئەوەیە: چ شوێنەوارێك لەتۆدا پەیدا دەکەن؟ ئەگەرنا دیارە گوناح هەر گوناحەو، چاکە هەر چاکەیە، بەڵام گوناهێك ببێتە هۆی ئەوەی لە خوا نزیك ببیەوە، باشترە لە تاعەتێك کە لەخۆت بایی بکاو، لەخوا دوور بکەویەوە.

٣٢- (متى أَوْحَشَكَ من خَلْقِه، فاعلم أنه يريد أن يفتح لك باب الأُنْسِ به).

واتە: هەرکاتێ خوا دووریی خستە نێوان تۆو خەڵك، (ئنجا لەگەڵ منداڵتە، لەگەڵ هاوسەرتە، لەگەڵ خزم و دۆست و ڕەفیقتە) ئەوە بزانە خوا سبحانە و تعالى دەیەوێ دەرگایەکت لێ بکاتەوە کە زیاتر لێی نزیك ببیەوە.

ئەوەش زۆر ڕاستە زۆر جار ئینسان لە ئەنجامی ئەوەدا کە بێ وەفایی و ناجوامێریی و ناڕاستیی لە خەڵك دەبینێ، وای لێ دێ زیاتر ڕوو بکاتە خواو بڵێ: خوایە! هەر تۆ جێی ئومێدی، ئینسانەکان هەر بەو شێوەیەن!

٣٣- (متى أطلق لسانك بالطَّلَب، فاعلم أنه يريد أن يُعطِيَكَ).
واتە: هەرکاتێ خوا زمانی تۆی کردەوە بۆ ئەوەی داوای لێبکەی، بزانە کە دەیەوێ پێت ببەخشێ و بتداتێ.

بۆیە عومەری کوڕی خەتتاب قسەیەکی جوانی هەیە دەڵێ: (لا يُهِمُّني الجواب، إنما يُهِمُّني الدعاء)، واتە: بەلامەوە گرنگ نیە کەی وەڵامم دەداتەوە، بەڵام بەلامەوە گرنگە کە دوعا بکەم، ئەگەر خوا دوعایەکەی خستە دڵم، دەزانم کە وەڵامیشم دەداتەوە.

٣٤- (العارِفُ لا يزولُ اضطراره، ولا يكون مع غير الله قَرارُهُ).
واتە: عاریف (ئینسانی خواناسی نەفس تەزکیە کراو) هیچ کاتێ وانیە کە پێویستیی بەخوا نەمێنێ، وە هیچ کاتێ بەبێ خوا عز وجل دڵی قەرار ناگرێ و ئارام ناگرێ و ئۆخژنی بۆ نایە.
واتە: ئەوانەی لەخۆبایی دەبن و، پێیان وایە پێویستییان بەخوا نامێنێ، ئەوە لە ڕاستیدا سەر لێێشێواوو سەرگەردانن.

٣٥- (لا تُطالِبْ ربَّك بتأخُّر مطلبك، ولكن طالِب نفسَك بِتَأخُّر أدبك).
واتە: داوا لە پەروەردگارت مەکە کە بۆچی داواکارییەکەی تۆی دواخستوە؟، بەڵکو داوا لەخۆت بکە کە وەك پێویست ئەدەب و ڕێزو حورمەتت لە خزمەت خوادا بەکار نەهێناوە، یانی: پەلە پەل کردنی تۆ لە خوای پەروەردگار، پێچەوانەی ئەدەبە لەگەڵ خوادا، چونکە خوا بۆخۆی دەزانێ چی بۆ تۆ چاکە.

٣٦- (متى جعلك في الظاهر مُمْتَثِلاً لأمره، ورَزَقك في الباطن الإستسلام لقهره، فقد أعظم المِنَّة عليك).

واتە: هەركاتێ خوا ڕواڵەتی تۆی والێكرد، ملكەچی فەرمانەكانی بی، وە لە دەروونیشدا وای لێكردی ملكەچ بی بۆ دەستەڵاتی خوا، ئەوە بزانە خوا چاكەیەكی زۆر گەورەی لەگەڵ تۆدا كردوە.

٣٧- (ورود الإمداد بحسب الإستعداد، وشروق الأنوار على حسب صفاء الأسرار).
واتە: یارمەتی خوا بە ئەندازەی ئامادەیی ئینسانە، وە هەڵهاتنی ڕۆشناییەكان لەسەر دەروونی ئینسانان، بە ئەندازەی پاكیی ڕووحیانە.

٣٨- (لما علم الحق منك وجود المَلَل، لوَّن لك الطاعات، وعلم ما فيك من وجود الشَّرَهِ، فَحَجَرها عليك في بعض الأوقات، ليكون هَمُّك إقامة الصلاة، لا وجود الصلاة، فما كُلُّ مُصَلٍّ مُقيمٌ).
واتە: لەبەر ئەوەی خوای هەق زانیویەتی كە تۆ (لە طاعەت) ماندوو دەبی، بۆیە تاعەتەكانی جۆراو جۆر كردوون، (نوێژە، ڕۆژوویە، زەكاتە، حەجە، جیهادە، هیجرەتە، .. هتد)، وەلەبەر ئەوەی زانیویەتی كە تۆ جاری وا هەیە كەم قەناعەتی و زۆر داوا دەكەی، بۆیە لە هەندێ كاتدا تاعەتی لەتۆ گرتۆتەوە، (بۆ وێنە: لەدوای نوێژی عەسرەوە، نابێ نوێژ بكەی، لە هەندێ وەختان لێی قەدەغە كردووی بۆئەوەی كە تێنەپەڕێنی)، بۆ ئەوەی ئەوەی تۆ بەلاتەوە گرنگ دەبێ، بەرپا كردنی نوێژ بێ، نەك بوونی نوێژ، چونكە هەموو نوێژكەرێك، نوێژی بەرپا نەكردوە.

٣٩- (لا نهاية لمذامك أن أرجعك إليك، ولا تفرغ مدائحك أن أظهر جوده عليك).
واتە: ئەگەر خوا بتگێڕێتەوە بۆ لای خۆت و حەواڵەی خۆتت بكا، كۆتایی نیە بۆ سیفەتە خراپەكانت، بەڵام سیفەتە باشەكانیشت كۆتاییان نیە، ئەگەر خوا بەخششی خۆی بەسەر تۆدا بڕێژێ.

٤٠- (كيف تُخْرَقُ لك العوائد؟ وأنت لم تَخْرِقْ من نفسك العوائد).
واتە: چۆن عادەتەكان بۆتۆ دەدڕێن، لە كاتێكدا تۆ عادەتەكانی خۆت نەگۆڕیون؟
واتە: تۆ ئەگەر عادەتەكانی خۆت و وەزعی خۆت نەگۆڕی، بەپێی ئەوەی كە شەرع داوات لێ دەكات و، هەر بەدوای ئارەزووی خۆت بكەوی، خوای كاربەجێ چۆن خەرقی عادەتت بۆ دەكاو، حاڵەتە ئاساییەكانت بۆ دەگۆڕێ؟.

٤١- (الناس يمدحونك لما يظنونه فيك، فكن أنت ذاماً لنفسك لما تَعْلَمُه منها).
واتە: خەڵك بۆیە مەدحت دەكەن، كە گومانت پێ دەبەن كە چاكەت تێدایە، بەڵام تۆش سەرزەنشتی خۆت بكە، بەهۆی ئەوەوە كە لە بارەیەوە دەزانی لە (خراپە).

واتە: ئەوان بەهۆی گومانی هەبوونی چاكە لە تۆدا، مەدحت دەكەن، تۆش بەهۆی ئەوەوە دەزانی و عیلمت بەوە هەیە كە خراپەت هەیە، سەركۆنەی خۆت بكە.

٤٢- (الزهّاد إذا مُدِحوا انقبضوا، لشهودهم الثناء من الخلق، والعارفون إذا مُدِحوا انبسطوا لشهودهم ذلك من الملك الحق).
واتە: زاهیدەكان[1] كاتێ ستایش بكرێن، دڵییان وێك دێ، چونكە ستایش كردنەكە لە خەڵك دەبینن، بەڵام عاریف و خواناسە گەورەكان، كاتێ كە ستایش بكرێن، دڵ خۆش دەبن، چونكە دەزانن ئەو ستایش كردنە هی خوایە (خستوویەتە سەر زاری خەڵك).

٤٣- (متى كنت إذا أُعطيت بسَطَكَ العطاءُ، وإذا مُنِعْتَ قَبِضَكَ المَنْعُ، فاستدل بذلك على ثبوت طفوليَّتك، وعدم صدقك في عبوديَّتك).
واتە: هەركاتێ وابووی كە ئەگەر پێت ببەخشرێ، دڵت خۆش بێ، وە ئەگەر لێت بگیرێتەوە، دڵت توند بێ، ئەوە بیكە بەبەڵگە لەسەر ئەوە كە جارێ هەر

---

(١) زهّاد: واتە: ئەوانەی كە جارێ لەسەرەتای قۆناغەكانی بەرەو خواچوون دان.

منداڵی، وە جارێ لە بەندایەتییتدا بۆ خوا ڕاست ناکەی. (ئەگەرنا دەبێ تۆ پەروەردگارت بەمەرجی ئەوە نەپەرستی، یان بەمەرجی ئەوە خوات نەوێ، کە بتداتێ، بەڵکو هەرچۆنی مامەڵەت لەگەڵدا بکا، تۆ هەر دەبێ بەندەی خوابی).

٤٤- (إذا أردت أن يُفْتَح لك باب الرجاء، فاشهد ما منه إليك، وإذا أردت أن يُفْتَح لك بابُ الخوف، فاشهد ما منك إليه).
واتە: ئەگەر ویستت دەرگای ئومێدت لێ بکرێتەوە (واتە: ئومێدەوار بی) ئەو شتانە ببینە کە لەخواوە بۆتۆ دێن، وە ئەگەر ویستت دەرگای ترست لێ بکرێتەوە، ئەو شتانە ببینە کە لەتۆوە بۆ لای خوا دەچن، (چونکە هەمیشە لە خواوە خێر بۆتۆ دێ، وە هەمیشە لەتۆوە گوناهو تاوان و کەم و کوڕیی، وێڕای تاعەتێکیش کە دەیکەی، بۆ لای خوا دەچێ).

٤٥- (غَيِّبْ نَظَر الخلق إليك بنظر الحق إليك، وغِبْ عن إقبالهم عليك، بشهودِ إقبالهِ عليك).
واتە: سەرنج دانی خەڵك لەبەر چاوی خۆت ونبکە، بەهۆی ئەوەوە کە دەزانی خوا سەرنجت دەدا، وە خۆت بێ ئاگا بکە لە ڕوو تێکردنی ئەوان بۆتۆ، بەهۆی ئەوەوە کە خوا ڕوو لەتۆ دەکا، (واتە: ئەوەی کە گرنگی پێ دەدەی، سەرنج دان و ڕووتێکردنی خوا بێ بۆت، نەك هی خەڵك).

٤٦- (كل كلام يَبْرُز، وعليه كسوة القلب الذي منه برز).
واتە: هەر قسەیەك کە دەکرێ، پۆشاکی ئەو دڵەی لەبەرە کە لێیەوە دەرچووە. (واتە: قسەی ئینسان وەك کردەوەی ئینسان، بەشێکە لە کەسایەتیی ئینسان، دڵێکی ڕۆشن و پاك، قسەکانیشی لەقەدەر خۆینی، هەروەها بە پێچەوانەشەوە).

٤٧- (من علامة اتباع الهوى، المسارعَةُ إلى نوافل الخيرات، والتكاسل عن القيام بالواجبات).
واتە: لە نیشانەكانی شوێنكەوتنی ئارەزوو، ئەوەیە كە ئینسان لە جێبەجێ كردنی سوننەتاندا خێرایی بكا، بەڵام تەنبەڵیی بكا لە جێبەجێ كردنی واجبەكاندا. (كە لە واقیعدا مسوڵمانان لە هەموو شێوەكان، لەو جۆرە شوێن كەوتنە ئارەزووەیان هەیە).

٤٨- (وصولك إلى الله، وصولك إلى العلم به، و إلا فَجَلَّ ربُّنا أن يَتَّصل به شيءٌ، أو يتَّصِلَ هو بشيء).
واتە: گەیشتنی تۆ بەخوا، گەیشتنی تۆیە بە زانیاریی بەخوا، ئەگەرنا پەروەردگارمان زۆر لەوە بەرزترە، كە هیچ شتێك پێیەوە پەیوەست بێ، یان ئەو بەهیچ شتێكەوە پەیوەست بێ، {لێرەدا بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە كە باسی یەكبوونیی (وحدة الوجود) دەكەن}.

٤٩- (الحقائق تَرِدَ في حال التجلِّي مجملةً، وبَعد الوعي يكون البيان).
واتە: ڕاستییەكان كە دێنە سەر دڵی ئینسان، بە كورتیی دێن، بەڵام دوایی كە هۆشیار دەبێتەوە، ئنجا لە تەفصیلْ و وردەكارییەكانیان تێ دەگا. (ئەوەش شتێكی جەڕبێنراوو ئەزموونكراوە).

٥٠- (إنَّ مَن أَيْقَن أن الله يطلبه صَدَق الطلب إليه، ومن عَلِمَ أن الأمور بيد الله انجمع بالتوكّل عليه).
واتە: هەركاتێ كەسێ یەقینی بێ كەخوا داوای دەكا، ئەویش بەڕاستیی خوا داوا دەكاو بەرەو خوا دەچێ، وە هەركەسێ بزانێ كاروبارەكان بەدەست خوان، ئەوە تەواو دڵ بەستنی بەخوا دەبێ و، پشت بەستنی تەنیا بەخوا جل وعز دەبێ.




# چەند ئامۆژگارییەك لە بواری تەزكیەدا

## یەكەم:

با بەبێ پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە، بەتەمای ئەوە نەبین بەرەو خوا بچین و صالّح بین، وە نەفسمان پاك و چاك بێ، خوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ﴿٥٩﴾ ﴾ النساء

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەری خوا بكەن.

لە ڕاستیدا خێرو چاكەی دنیاو قیامەت تەنیا لەوەدایە پابەند بی بە قورئان و سوننەتەوە، وە ئازایەتی شێخی مورشیدو پێشەوایان ئەوەیە كە تۆ ببەنە خزمەت قورئان و سوننەت، هەروەك زانایانی فیقە، لە ڕوی فیقهییەوە دەتبەنە خزمەت قورئان و سوننەت، زانایانی عەقیدە لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، دەتبەنە خزمەت قورئان و سوننەت، بەهەمان شێوە زانایانی تەزكیەش، دەبێ بتبەنە خزمەت قورئان و سوننەت.

## دووەم:

بەبێ تەنیا خوا پێ مەبەست بوون (إخلاص) ئینسان هیچ بەهیچ ناكا، خوای بێ هاوتا دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴿٥﴾ ﴾ البينم

واتە: وەفەرمانیان پێ نەكراوە، مەگەر بەوە كە بەدڵسۆزیی و پاكیی و ساغیی، بەندایەتیی و ملكەچییان بۆ خوابێ.

## سێیەم:

وریا بوون لە لەخۆ بایی بوون بەهۆی تاعەتەوە، وە نائومێد بوون بەهۆی گوناهەوە، كە تاعەت و چاكەیەكت كرد، لەخۆت بایی مەبەو، كە گوناهو تاوانێكیشت كرد، لە بەزەیی خوا بێ ئومێد مەبە.

## چوارەم:

دەبێ مسوڵمان هەموو مسوڵمانانی خۆش بوێن، وە دەمارگیر نەبێ بۆ ئەو ناوو نیشانەی لەسەر خۆی هەڵیداوە، وە خۆی بەیەكێ لە مسوڵمانان دابنێ، خواش بەندە ناسە، داخۆ كێ لەخوا نزیكترە، وە پێوەرو تەرازووش قورئان و سوننەتە.

## پێنجەم:

دەبێ ئەوانەی لەبواری تەزكیەی نەفسدا لەگەڵ خۆیاندا كار دەكەن، بێ ئاگا نەبن لە مشوور خواردن بۆ كۆمەڵگا، وە هەڵوێستیان هەبێ بەرانبەر بە خێرو شەڕی كۆمەڵگا، لەگەڵ خێرەكەیدا بن و، دژی شەڕەكەی بن، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كە سەییدی عاریفانە، وا بووە، خەلیفە ڕاشیدیەكان و هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ وابوونە، وە پێشینی چاكیشمان وا بوون، وە ئەوانەش كە بەڕاستی شێخ و مورشیدی عاریف و خواناس بوون، وابوون.

## شەشەم:

جگە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كەسمان پێ پارێزراو نەبێ لە هەڵەو پەڵەو لادان.

## حەوتەم:

زانینی ئەو ڕاستییە كە سەرفرازیی و بە موراد گەیشتن (الفلاح والفوز) بە هیچ مەزهەب و ڕێبازێكەوە نەبەستراوەتەوە، بێجگە لە قورئان و سوننەت، وەك شەخسیش پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم)، تەنیا ئەو سەرمەشقی ڕەهای ئێمەیە، وە تەنها قورئان و سوننەت بەرنامەی بێ چەندو چوونی ئێمەن، ئەگەرنا قسەو بەرهەمی هەر زانایەك، وە هەڵسو كەوتی هەر پێشەوایەك دەگونجێ هەڵەو پەڵەی تێ بكەوێ.

خوای پەروەردگار یارمەتیمان بدات هەموو لایەك بەو شێوەیە بین، كە بۆخۆی پێی خۆشە، وە خوا یارمەتیمان بدا كە زیاتر لەشەریعەتەكەی تێبگەین، وە یارمەتیمان بدا بەهرەی زیاتر وەربگرین لە پێشینی چاكمان، لە زاناو پێشەوایانمان، لە هەموو بوارەكاندا: لە بواری ئیمان و عەقیدەدا، لە بواری فیقه و ئوصوڵی فیقهدا، لە بواری تەفسیرو فەرموودەدا، لە بواری تەزكیەی نەفسدا، وە ڕێزیشمان بۆ هەمووان هەبێ، وە بەرهەمی هەمووشیان بخەینە تەرازووی قورئان و سوننەتەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

بە یارمەتی و لوتفی خوا سبحانە و تعالی ڕۆژی هەینی - ٢٠١٥/٥/٨ كاتژمێر (یازدەو دە دەقیقەی) پێش نیوەڕۆ لە تایپ كردن و پێداچوونەی ئەو دەرسە بە پێزانە بوومەوە، خوا سبحانە و تعالی بیكا بە مایەی نەفس تەزكیە بوون و صاڵح بوون و بەرەو خوا چوونمان، وە بیكا بە مایەی چاوپۆشیی و لێخۆشبوون لە گوناهو تاوانەكانمان لە ژیانی دنیا، وە بیكا بە تێشووی قیامەتمان و ڕەزامەندیی خۆی و بەرەو بەهەشت چوونمان دوای مردن، بە لوتف و كەرەم و فەزڵ و بەخششی خۆی.

داواكارم لە خوای بەخشەر تەمەنی مامۆستا بەرەكەتدارتر بكا، وە بەردەوامیی پێ ببەخشێ، وە هەمیشە بەرچاوڕوونی بكا، بۆ پەروەردە كردنی مسوڵمانان لەسەر قورئان و سوننەت، وە خوای بەرزو بڵند كارەكانی قەبووڵ بكاو پلەو پایەی بەرز بكا.

لە كۆتاییدا دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: هەركاتێ پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) شتێكی ببینیباو پێی دڵخۆش بووایە دەیفەرموو:

(الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ) أخرجه ابن ماجة برقم (٣٨٠٣) قال الشيخ الألباني: حسن.

منیش دەڵێم: ( الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ ).

# نێوەڕۆك

www.alibapir.com

# گیانی ژیان

بێگومان بابەتی چۆنیەتی چاك خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن (الإحسان وتزكيه النفس) هەتا بڵێی گرنگ و بایەخدارە و هەرگیز ناگونجێ قسەی كۆتایی لە بارەوە بكرێ، هەر بۆیەش بەندە هەرچەندە لە مێژ ساڵە لەو بارەوە كتێبی (ڕێگای صالح بوون و بەرە و خوا چوون)م نووسیوە، كە هەتا ئێستا پێنج جاران چاپ كراوەتەوە و بۆ زمانەكانی عەرەبی و فارسییش وەرگێڕراوە، بەڵام ئەو بابەتە دێرینە هەمیشە تەڕ و تازەیە و حەوجێی بەباس و خواسی نوێ و گەرم هەیە، بۆیە ئەم بەرهەمەشمان لەو بارەوە خستە ڕوو.

دیارە ئەم بەرهەمەش كۆی سی (30) ئاڵقەیە كە لەژێر ناوو نیشانی (گیانی ژیان)دا لە مانگی ڕەمەزانی (1435ك) لە كەناڵی ئاسمانیی پەیامەوە پێشكەش كران و پاش نووسرانەوەو ڕێكخرانیان لەلایەن برایەكی دڵسۆزەوە، پاشان چاو پێدا گێڕانەوە و سووكە دەستكارییەكی خۆم، بوون بەم كتێبە، كە هیوادارم كەلێنێكی باش لەو بوارە گرنگ و هەستیارەدا پڕ بكاتەوە، بە تایبەت لەو ڕۆژگارەدا كە ڕەوتی ماددیگەریی و ئارەزوو خوازیی یەكجار زۆر پەرەی ستاندەوە و كەسێك زۆر لەخۆی وریا نەبێ لەڕووی ڕووحییەوە بەهێز و دامەزراو نەبێ لافاوی دنیا پەرستیی و ئارەزوو خوازیی ڕایدەماڵێ و سەرەنجان تووشی عەیبداری دنیا و گوناهباری دواڕۆژ دەبێ.






**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پاڵاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice